# زیندووکردنەوەی فیکری ئایینی لە ئیسلامدا

نووسینی: ئیقباڵ لاهووری

وەرگێڕان: بەیان مەجید

لە بڵاوکراوەکانی
سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی (٤٢)

زیندووکردنەوەی فیکری ئایینی لە ئیسلامدا
بەیان مەجید

ئیقباڵ لاهووری لە دوای موتاڵای قووڵ و ڕامان لە ئەندێشە و فەرهەنگ و فەلسەفەی ڕۆژئاوا، بە پێویستی زانی کە شۆڕشێك سازبکرێت لەناو فەرهەنگ و ڕوانگەی ڕۆژهەڵات و موسوڵمانانندا. ئیقباڵ گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە تا بنەماکان سەرلەنوێ سازنەکرێنەوە و زیندوو نەبنەوە چاکسازیی بێسوودە. شارستانیەتی نوێ پێویستی بە بنەمای فەلسەفی و فیکریی نوێ هەیە. زۆرێك لە نووسەران باسیان لەوە کردووە کە ئەم کتێبە یەکێکە لە گەورەترین بەرهەمە فەلسەفییەکان کە لە ناو جیهانی ئیسلامدا بەرهەم هاتووە.



## نووسەر:

- موحەممەد ئیقبال لاهوری ساڵی ١٨٧٧م لە یەکێک لە شارەکانی بنجاب لەدایکبووە.
- خوێندنی زانکۆیی لە ئادابدا بەدەست هێناوە، لە ساڵی ١٨٩٩م ماستەری لەزمانی عەرەبیدا بەدەست هێناوە.
- بەمامۆستای فەلسەفە لە کۆلیجی لاهور لە پاکستان دامەزراوە.
- خاوەنی (٢٠) دانراوی ناوازەیە لە بوارەکانی فیکر و ئابوری و رامیاری و پەروەردە و ئەدەب و فەلسەفەدا. نازناوی شاعری ئیسلامی بەدەست هێناوە.
- هەڵگری خەمی چاکسازی و بانگەواز بووە، چەندین شوێن گەڕاوە بۆ بەپایان گەیاندنی ئەم ئامانجە.
- لە ساڵی ١٩٣٨م وەفاتی کردووە.

## وەرگێڕ:

- بەیان عەزیزی نووسەر و توێژەر.
- دەرچووی مافی نێودەوڵەتییە و ماوەی پێنج ساڵ لە زانکۆی سەلاحەدین وانەکانی تایبەت بە مافی مرۆڤ و کۆمەڵگەی مەدەنی وتۆتەوە.
- خاوەنی زیاتر لە بیست و پێنج لێکۆڵینەوەی نەتەوەیی و نێو نەتەوەییە لە بواری زانستە مرۆییەکاندا.
- پێشتر حەوت کتێبی چاپ کردووە تایبەت بە باسەکانی فکر و فەلسەفە، فێمێنیزم و کۆمەڵگەی مەدەنی.

نووسینی: ئیٚقباڵ لاهووری

وەرگێڕان: بەیان مەجید

# زیندووکردنەوەی

# فیکری ئایینی لە ئیسلامدا

# زیندووکردنەوەی فیکری ئایینی لە ئیسلامدا

.......................................................

لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
ژمارە (٤٢)

• نووسینی: ئیقبال لاهووری
• وەرگێڕان: بەیان مەجید
• بابەت: فکری
• دیزاین: ڕەوشت محەمەد
• چاپی یەکەم: چاپخانەی شڤان

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٦١٥)ی ساڵی ٢٠١٦ پێدراوە

# پێڕست

# پێشەكیی وەرگێڕ

كتێبێک كە لە بەردەستاندایە بە باوەڕی زۆرێک لە خاوەن فیكر و بیرمەندان لە بنەڕەتیترین و باشترین كتێبەكانە كە بەمەبەستی سەرلەنوێ سازكردنەوەی ئەندێشەی ئیسلامی نووسراوە. كاتێک كەسێكی وەک ئێقباڵ بیر لە نووسین و ئامانجی كتێبێكی وەها دەكاتەوە لە ئەنجامی ئەو حەقیقەتەدایە كە ئەزموونە مەعنەوییەكانی ئەوی لە دیكەی بیرمەندانندا جیاكردۆتەوە. ئەو خودا و جیهان و ئایینی بە شێوازێكیتر ناسیوە و ناوەرۆكی ئەم كتێبەش پیشاندەری گۆڕانكاریی زەین و گوتاری ئەو فەیلەسووفەیە. ئێقباڵ لاهووری لە دوای موتالای قووڵ و ڕامان لە ئەندێشە و فەرهەنگ و فەلسەفەی ڕۆژئاوا، بەپێویستی زانی كە شۆڕشیک سازبكرێت لەناو فەرهەنگ و ڕوانگەی ڕۆژهەڵات و موسوڵماناندا. ئێقباڵ گەیشتە ئەو ئەنجامەی كە تا بنەماكان سەرلەنوێ سازنەكرێنەوە و زیندوو نەبنەوە چاكسازیی بێ قازانجە. شارستانیەتی نوێ پێوسیتی بە بنەمای فەلسەفی و فیكریی نوێ هەیە. زۆرێک لە نووسەران باسیان لەوە كردووە كە ئەم كتێبە یەكێكە لە گەورەترین بەرهەمە فەلسەفییەكانی سەدەی ئێستا كە لە ناو جیهانی ئیسلامدا بەرهەم هاتووە.

لە كتێبخانەی فارسیدا سێ وەرگێڕان لە كتێبەكەی ئێقباڵ هەیە، وەرگێڕانی ئەحمەد ئارام لە ساڵی ١٣٤٥ كۆچی هەتاوی و هەروەها وەرگێڕانی محەمەد بەقایی، ماكان لە ساڵی ١٣٧٩ و لەم دواییانەدا

محەمەد مەسعوودی نەورۆزی وەرگێڕانێکی سێهەمی لەم کتێبە ئاراستە کردووە و ساڵی ١٣٩٢ گەیشتۆتە دەستی خوێنەران. وەرگێڕانی کوردی کتێبی زیندووکردنەوەی فیکری ئایینی لە ئیسلامدا بە خوێندنەوە و بەراوردی هەر سێ دەقە فارسییەکە و هەروەها دەقی سەرەکی بە زمانی ئینگلیزی کراوە. دیارە کە ئەم نووسراوەی بەردەستی خوێنەران دوور نییە لە هەڵە و قسە لەوەش ناکات کە ئەم وەرگێڕانە بە تەواوەتی توانیبێتی واتا و وشە و زاراوەکان لە زمانی سەرەکییەوە بگوازێتەوە بۆ زمانی کوردی. هێشتا لە زۆرێک لە دەقەرەکانی زانستە مرۆییەکاندا و بەتایبەت فیکر و فەلسەفە و ئایین ئێمە کێشەی نەبوونی وشەی هاوتامان هەیە لە ناو زمانی کوردییدا. هەموو هەوڵی ئەم وەرگێڕانە ئەوە بوو کە بە نیسبەت دەقی سەرەکی ئەمانەتی پاراستبێت و لە دروستترین وشەکان کەڵکی وەرگرتبێت.

ئاوڕدانەوە لە دەقەکانی زانایەک وەک ئێقباڵ و چاپی وەرگێڕانی بەرهەمەکانی لە لایەن سەنتەری زەهاوییەوە جێگەی ڕێز و پێزانینە. بەتایبەت لە فەزای کۆمەڵایەتی و فیکریی ئێستادا کە چاپی هەر دەقێک بەدەر لە هەڵسەنگاندنی بایەخ یان تەنانەت بێ هەڵە و خەوشبوونی، وەک بەڵایەک کەوتۆتە بواری چاپ و پەخش و خوێندنەوە. بەردەوام بوون و پەرەپێدان بە بڵاوکردنەوەی ئەم بەرهەمە بە نرخانەیە کە نووسەر و وەرگێڕ و خوێنەر دڵخۆش دەکات بۆ خۆپێگەیاندن و ڕامان و خوێندنەوە.

**بەیان مەجید**

# پێشەکیی نووسەر

قورئان کتێبیکە کە لەسەر"کردەوە"زیاتر لە"ئەندێشە"جەخت دەکات. لەهەمانکاتدا کەسانێک هەن کە ئیمکانی درککردن بە جیهانێکی دیکە بەشێوەی پرۆسەیەکی زیندوویان نییە، واتە جۆرێکی تایبەت لە ئەزموونی دەروونی کە لە ئاکامدا ئیمانی ئایینی پشتی پێ بەستووە. بێجگە لەمانەش مرۆڤی ئەمڕۆیی کە خووی گرتووە بە هەندێ ئەندێشەی لەمس کراو- شێوازیک کە خودی ئیسلام لانی کەم لە قۆناغە سەرەتاییەکانی پەرەسەندنی فەرهەنگی خۆییدا گەشەی پێدا بوو- توانای خۆی بۆ تاقیکردنەوەی ئەو ئەزموونانە لەدەست داوە کە گریمانەی هەڵەی تێدا بەدی دەکرێت و بە چاوێکی گومانـاوی لێیان دەڕوانێت. بێگومان قوتابخانە ڕەسەنەکانی تەسەوف کاریگەریەتییەکی شایستەیان لە شکڵ پێدان و ڕێنموونی ئەزموونی ئایینی ئیسلامدا هەبووە، بەڵام نوێنەرە دواییەکانی ئەو قوتابخانانە بەهۆی بێئاگایی لە فیکری تازە، توانای ئەوەیان نەبووە کە لە ئەندێشە و ئەزموونە نوێکان ئیلهامێک وەرگرن، ئەو شێوازانەی کە ئەوان پەیڕەوی دەکەن تایبەت بووە بە جیلە پێشووەکان کە ڕوانگە فەرهەنگیەکانیان تاڕادەیەکی زۆر لەگەڵ ئێمەدا جیاوازی هەبووە.

قورئان دەفەرموێت: ((مَّا خَلْقُكُمْ وَلا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ)) واتە: خوڵقاندنی ئێوە و سەرلەنوێ زیندووکردنەوەتان هەروەک خوڵقاندن و سەرلەنوێ زیندووکردنەوەی تاکە کەسێکە.(١)

لەم ئایەتەدا ڕاستییەکی زیندوو بەپێی یەکگرتنی زیندەوەرناسیی دەخرێتە بەر چاو، ئەمڕۆکە ناسینی ئەو بابەتە پێویستی بە شێوازێکیتر

[1]ـ سورەتی لوقمان ئایەتی ٢٨

هەیە کە ئەوەنــدە پاڵپــشتی بە فیزیۆلــۆژیەوە نەبەســتووە و لە بــاری دەرووناســیەوە لەگەڵ جــۆری هەســت پێکــراوی فیکــردا نزیکــایەتیەکی زیاتری هەیە، تەنها بە هۆی نەبوونی وەها شێوازێکەوەیە کە هـەست بـە پێویستیی فۆرمێکی بـاڵاتری مەعریفەی ئایینی دەکرێت و ئاسایی دێتە بەرچاو.

لەم لێــدوانانەدا کە بە ویــستی ئەنجــومەنی ئیــسلامی"مــدرس"لە شارەکانی مەدرەس، حەیدەرئاباد و عەلیگرە بەڕێوە چووە، هەوڵمداوە لانـی کەم وەڵامێـک بـدۆزمەوە بـۆ ئەم پێویـستییە حاشـاهەڵنەگرە و بە ســەرنجدان بە نــوێترین پێــشکەوتنەکانی زەینــی مــرۆڤ لە بــوارە جیاوازەکانـدا، هەنگـاوێکم هەڵگرتبێـت بـۆ سـەرلەنوێ سـازکردنەوەی فەلسەفەی ئایینی ئیسلام. ئێستا کاتێکی زۆر گونجاوە بۆ هێنانە ئارای ئەم باسە، تەنانەت فیزیکی کلاسیک گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی کە دەبێ کۆڵەکەکانی خۆی بخاتە بەر ڕەخنە و بەرهەمی ئەم ڕەخنەگرتنە دەبێتە ئەوەی کە ئەو جۆرە لە مادەخوازیی کە فیزیک لە سەرەتاکانی خۆیدا، پێویـستی پێـی بـوو، زۆر خێـرا بەرەو لەنـاوچوون دەڕوات، ئەوەنـدە ناخایەنێـت کە ئـایین و زانـست بتـوانن پێکەوەبـوونێکی سـازگار و بە متمانەیـان هەبێـت. سـەبارەت بە ئەندێـشە فەلـسەفیەکان دەبــێ ئەم خاڵەشمان لەبیر بێت کە هیچ کۆتـاییەک لەئارادا نییە. لەهەمانکاتدا کە زانستی مرۆیـی پـێش دەکەوێـت و ڕێگەگەلـی تـازە دەکەوێـتە بەر پێـی ئەندێشە، ئیمکـانی خستنەڕووی بیروڕای نـوێتر و لەوەدەچێت قـووڵتر پێک بێـت کە لەم ریـزە لێـدوانەش زیـاتر بـەرەو پێـشەوە بچێـت. ئەمە ئەرکی سەرشانی ئێمەیە کە بە وردی پێشکەوتنی زەینی مرۆیی بخەینە بەر سەرنج و بەرهەڵستێکی سەربەخۆ و ڕەخنەگرانەمان بەرامبەر بەوە هەبێت.

# مەعریفە و ئەزموونی ئایینی

چییەتی جیهانێک کە تێیدا دەژین بە چ شێوەیەکە؟ ئایا لە ناخی ئەم جیهانەدا تۆخمێکی هەرمانی بوونی هەیە؟ ئێمە چ پێگە و ریزبەندییەکمان لەوێدا هەیە و کام رەفتارەمان شیاوی پلە و پایەکەمانە؟ ئەم پرسیارانە لە نێوان ئایین، فەلسەفە و شیعردا هاوبەشە، لەهەمانکاتدا جۆری ئەو ئاگاییە کە لە ئیلهامی شیعرییدا دەست دەکەوێت بەپێی تایبەتمەندی خودی شیعر لە بنەڕەتەوە تایبەت و پشتبەستوو بە خۆیەتی، لەبەرئەوەی کە پێچهەڵپێچ، پڕ لە ئاماژە و دوورە لە هەر جۆرە راشکاوییەک. لەم دەڤەرەدا ئایین لە ڕوخسارە پێشکەوتووەکەیدا زیاتر لە شیعر باڵا دەکات و لە تاکەوە بەرەو کۆمەڵگە دەڕوات، سەرنج دەداتە حەقیقەتی ڕەها کە دژ بە توانا بەرتەسکەکانی مرۆڤە. ئایین ئەم ویستە تا ئەو شوێنە پەرە پێ دەدات کە بە شتێک کەمتر لە دیتنی بێ واسیتەی حەقیقەتی ڕەها رازی نابێت. کەواتە ئایا دەتوانین شێوازێکی بەتەواوەتی هزری فەلسەفی لە ئاییندا پەیڕەو بکەین؟

رۆحی فەلسەفە خوازیاری توێژینەوەی بێ سنوورە و بۆ هەموو دڵنیاییەک بە چاوی گومانەوە دەڕوانێت، ئەرکەکەی هەنگاونانە لەناو حەشارگەی گریمانە ڕەخنە لێنەگیراوەکانی زەینی مرۆڤ، وێدەچێت کە لەم گەڕانەدا نکولی لە نەتوانایی هزری ڕەها بۆ گەیشتن بە حەقیقەتی کۆتایی بکرێت یان بە ئاشکرا قبووڵی بکات.

بەڵام دەبێ لایەنیکیتر ببینین، ئایین کە جەوهەرەکەی بریتییە لە ئیمان و ئیمانیش وەک باڵندەیەک لە کاتی هەڵفڕیندا بێ سەرنجدان بە هێزی عەقڵ و بێ هەبوونی ڕێگە یان شوێنی تێپەڕین، ڕێگەی خۆی دەدۆزێتەوە، عەقڵێک کە بە وتەی شاعیر و عارفی گەورەی ئیسلام"لە بۆسەی دڵی زیندوو و گەشاوەی مرۆڤدا نیشتووە و سەرمایەی نەبیندراوی ژیان دەدزێت کە لەوێدا شاردوارەتەوە". بە گشت ئەم باسانەوە ناکرێ نکولی لەوە بکرێت کە ئیمان بابەتێکی زیاتر لە هەستکردنی ڕەهایە، وەک زەرفێک وایە کە لەخۆگرەکەی مەعریفە و ئاگاییە، بوونی گروپە مونافەسەکارەکان لە مێژووی ئاییندا - وەک مەدرەسیەکان و عارفەکان- ڕۆڵی ژیانبەخشی توخمی هزر لە ناو ئاییندا پیشان دەدات، هەروەها ئایین لە باری بیروباوەڕەوە هەر ئەو جۆرەی کە پرۆفیسۆر **وایتهد**(١) وەسفی دەکات دام و دەزگایەکە بریتی لە حەقیقەتە گشتیەکان کە ئەگەر بە ئیخلاسەوە قبوولّ بکرێت و بە دروستی لە ناو زەیندا جێگر ببێت، بە شێوازێکی کاریگەر کەسایەتی و تایبەتمەندییەکان تووشی ئاڵ و گۆڕ دەکات. دیارە کە گۆڕانکاریی، ڕێنموونی و رابەربوونی مرۆڤ لە ژیاندا چ لە باری ناوەکی و چ لە باری رواڵەتیەوە مەبەستی سەرەکی ئایینە.

دیارە ئەو ڕاستییە گشتیانەی کە ئایین ئاشکاریان دەکات و دەیانخاتە بەرچاو نابێ هەروا بە شێواوی بەجێ بمێنێت. هیچ کەس کارێکی پڕ لە مەترسی ناکات کە لەسەر بناغەی هەڵسوکەوتێکی پڕ لە شک و گومان دامەزرابێت. لەڕاستییدا ئایین بەپێی ئەرکەکەی، تەنانەت

---

[1] پرۆفیسۆر ئالفرێد نۆرت وایتهد، باسەکانی زۆر لە ئەفلاتوون نزیکە و بەدەر لە فەلسەفە زانای بیرکارییش بووە.

زیاتر له زانست پێویستی به داڕشتنی بناغه سەرەتاییەکانیەتی له سەر کۆڵەکەی عەقڵ.

وێدەچێت که زانست، مێتافیزیک یان ـ ما بعد الطبیعه ـ ی عەقڵانی بەبێ بنەما بزانێت و تائێستاش هەروای زانیوه، بەڵام بۆ ئایین ئەمه بابەتێکی دژواره. ئایین ناتوانێت غەفڵەت له گەڕانێک بکات که مەبەستەکەی پێکهێنانی سازگاریی له نێوان دژوازەکانی ئەزموون و سەلماندن و پاساوهێنانی شوێنیک بێت که مرۆڤ خۆی لەوێدا دەدۆزیتەوه. بەم شێوەیه که پرۆفیسۆر وایتهد، به وردبینیەوه ئەوەمان بیر دەخاتەوه که: دەورەکانی ئیمان دەورەی هزرخوازییه. بەڵام ڕوونکردنەوەی ئیمانی ئایینی به هۆی عەقڵانیەوه به واتای قبووڵکردنی زاڵبوونی فەلسەفه بەسەر ئیماندا نییه، بێ هیچ ئەملاو لایەک دیاره که فەلسەفه مافی داوەریکردن لەسەر ئیمانی هەیه، بەڵام ئەو بابەتەی که دەخرێته بەر داوەری کردن، خاوەنی وەها چییەتیەکه که بێجگه له پێوەرەکانی خۆی، تەسلیمی داوەریکردنی فەلسەفه نابێت.

کاتێ فەلسەفه دێت و لەسەر ئایین قەزاوەت دەکات ناتوانێت ئەوه به خوارتر له دەستکەوتەکانی خۆی بزانێت. ئایین نه بابەتێکی ورده نه ئەندێشەیەکی موجەڕەد و نه تەنهایه به هەستێکی ناوەکیی و نه کردەیەکی ڕەها، بەڵکو ئەزموونێکه له گشتییەتی مرۆڤ. کەواته فەلسەفه له هەڵسەنگاندنی ئاییندا دەبێ پێگەی تەوەربوونی ئەوه بزانێت. بۆ ئەم ناسینەش ڕێگەیەک بێجگه لەوه نییه که ئایین وەک سەنتەرێک له پرۆسەی تێکەڵبوونی فیکریی قبووڵ بکات. هیچ هۆیەک له ئارادا نییه که وای لەبەرچاو بگرین که عەقڵ و شهوود له بنەڕەتەوه دژ به یەکن، بەڵکو هەردووکیان له یەک ریشەوه سەردەردەهێنن و یەکتر کامڵ دەکەن. بەڵام یەکێکیان بەرەبەره له حەقیقەت تێدەگات و ئەویدی به

یەکجار. یەکێکیان چاوی دەبەستێت بەسەر هەرمانبوونی حەقیقەت و ئەویدی دەڕوانێتە ئەم لایەنە کە حەقیقەت کاتییە. یەکێکیان چێژ لە هەبوونی گشت حەقیقەت وەردەگرێت و ئەویدی وردە وردە دەیهەوێت لە هەمووی تێبگات. بۆ گەیشتن بەمەش هەموو ڕێگەکان بۆ پشکنینی تایبەتی خۆی دەپێوێت، هەردووکیان بۆ سازکردنەوەی خۆیان پێویستیان بە یەکترە. ئەو حەقیقەتەی کە مەبەستی هەردووکیانە خۆی بەڕادەیەک بەوان دەنوێنێت کە لە قەبارەی هەمان ئەرک بێت کە لە ژیاندا خراوەتە سەر شانیان. لە ڕاستیدا **بێرێگسۆن**[١] باش دەڵێت کە شهوود هیچ نییە جگە لە جۆرێ عەقڵی بالاتر.

دەکرێ باس لەوە بکەین کە توێژینەوە سەبارەت بە بنەماکانی عەقڵ لە ئیسلامدا بە شەخسی پێغەمبەرەوە دەستی پێکرد. دوعای هەمیشەیی ئەو ئەمە بوو کە:"خودایا توانایی تێگەیشتن لە حەقیقەتی قووڵی بابەتەکانم پێ ببەخشە". بەرهەمەکانی ئەهلی تەسەوف و هەروەها هزرخوازانی غەیرە تەسەوف لەم ساڵە دواییانەدا وەرزێکی زۆر ئاگایی بەخشیان لە فەرهەنگی ئێمەدا کردۆتەوە و بە هەمان ڕادە پیشاندەری حەزێکی زۆرە بە دام و دەزگای فیکری لۆژیک و پیشاندەری ڕۆحێکە کە بێ هیچ خەوشێک خۆی وەقف کردووە بۆ وەرگرتنی حەقیقەت. لە لایەکیتریشەوە پیشاندەری سنوورەکانی زەمانەیەکە کە بووە هۆی ئەوە کە بزووتنەوە جیاوازە کەلامیەکان لە جیهانی ئیسلامدا کاریگەریەتییان کەم بێت، لە حاڵێکدا کە لە سەردەمێکیتردا دەیانتوانی زیاتر کاریگەر بن.

[1] هێنری بێرێگسۆن فەیلسووفی فەرەنسییە و لە گەورەترین بانگەشەکارانی قوتابخانەی ڕۆحییە. بنەمای فەلسەفەی بێرێگسۆن بەرامبەر وەستان لەگەڵ عەقڵدایە. بە باوەڕی ئەو عەقڵ ڕاستییەکان چەواشە دەکات و لە دوور و دەرەوە دەڕوانێت بۆ هەموو شتەکان. عەقڵ بە پێی ڕەواڵیت حوکمی خۆی دەدات و ناتوانێت بگاتە قووڵایی بابەتەکان.

هەروەک دەزانین فەلسەفەی یۆنانی هێزێکی فەرهەنگی مەزن بووە لە مێژووی ئیسلامدا، موتالای وردی قورئان و قوتابخانە کەلامیە مەدرەسیە جیاوازەکان کە پێکهاتەی فیکری فەلسەفی یۆنانین حەقیقەتێکمان پیشان دەدات، ئەویش ئەمەیە کە هەرچەند فەلسەفەی یۆنانی بەرژەوەندی بینینی بیرمەندە ئیسلامیەکانی بەربڵاوتر کرد، بەڵام بە گشتی روانینی ئەوانی بۆ ئیسلام لێڵ و ئاڵۆز کرد. سوقرات هەموو سەرنجی خۆی تەنها لەسەر جیهانی مرۆڤ دانابوو، بە باوەڕی ئەو، مرۆڤ تەنها دەکرێ بە مرۆڤ بخەینە بەر موتالایەکی دروست نە بە جیهانی ڕووەکیی، یان زیندەوەرەکان، یان ئەستێرەکان. ئەم ڕوانینە چەندە ناسازگارە لەگەڵ ڕوانگەی رۆحی قورئان کە لەوێدا خودای مەزن وەحی لە زەردەواڵەیەکی بچووک دەکات و خوێنەر بەردەوام بانگ دەکات بۆ روانین لە گۆڕانکارییە بەردەوامەکانی هەور و با و ئاسمانی پڕ لە ئەستێرە و بەدواداهاتنی رۆژ و شەو و هەروەها دیکەی هەسارەکان کە لە فەزای بێ سنووردا دەگەڕێن.

ئەفلاتوون قوتابی رەسەنی سوقرات کە بە باوەڕی خۆی درک پێکراوەکانی هەستیی بە بچووک دەزانی، باسێکی بێ ناوەرۆکی درکاند نەک مەعریفەیەکی ڕاستەقینە. ئەمەش چەندە لەگەڵ قورئاندا دژە کە "بیستن" و "بینین" وەک بەبایەخترین دیاریەکانی خودا ناو دەبات و باس لەوە دەکات کە گوێ و چاو لە لای خودا بۆ ئەو کارانەی کە لەم جیهانەدا کردوویانە دەخرێنە بەر لێپرسینەوە. ئەمە خاڵێکە کە یەکەمین توێژەرە ئیسلامیەکان لە ژێر سیحری فیکری یۆنانی کەون ئارا بە تەواوەتی فەرامۆشیان کرد. ئەوان قورئانیان لە ژێر چرای فیکری یۆنانییدا دەخوێندەوە. ئەمە زیاتر لە دە ساڵی خایاند تا ئەوکاتەی کە خۆیان لە تیشکی ئەوە دوورخستەوە و لەوە تێگەیشتن کە هەر لە

بنەڕەتەوە رۆحی قورئان دژ بەو شێوازە فیکرکردنەوەیەیە. ئاکامی ئەم تێگەیشتنە بەدوای خۆیدا جۆرێک شۆڕشی فیکری هێنا کە تا ئەم کاتەش بە شێوازێکی پێویست گرنگایەتی ئەم بابەتەمان بۆ دەرنەخراوە. رزگاربوون لەو کۆت و بەندە، نیوەی قەرزداری هەمان شۆڕشە فیکرییەیە و نیوەکەیتریش دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی تایبەتی ژیانی **غەزالی** کە بناغەی ئایینی لەسەر گومان و شککردنی فەلسەفی دامەزراند.

بناغەیەکی کەم تاکورتێک ناجێگر بۆ ئایین کە لەگەڵ رۆحی قورئاندا بەتەواوەتی سازگار نییە. **ئیبنی روشد** بەرهەڵستکاریی سەرەکی **غەزالی** بوو کە لایەنگری لە فەلسەفەی یۆنان دەکرد بەرامبەر بە کەسانێک کە شۆڕشیان لێکرد. رووی کردە فەلسەفەی ئەرەستوو و لەوێشوە بووە لایەنگری تیۆریەک کە ناوبانگی بە هەرمانی بوونی عەقڵی چالاک"یەوە دەرکربوو. ئەو تیورەی کە کتوپڕ کاریگەریەتیەکی سەیری لەسەر ژیانی فیکری فەرەنسا و ئیتالیا دانا. بە باوەڕی من بە تەواوەتی پێچەوانەی تێگەیشتنی قورئانە لە بایەخ و چارەنووسی منی مرۆڤ. بەم شێوەیە بوو کە ئیبن روشد فیکرێکی گەشەکردوو و بە بایەخی ناو ئیسلام لە بەرچاو دوور دەخات و بێ ئەوەی بزانێت، فەلسەفەیەکی سست و بێ گەڵاو و لق و پۆ پەرە پێدەدات کە روانین و وێنەی مرۆڤ لە خۆی و لە خودا و لە جیهان لێڵ دەکات. بێگومان بیرمەندگەلێکی داهێنەر کە لە نێوان ئەشعەرییەکانەوە هاتنەدەر، رێگەیەکی دروستتریان پێوا و هەندێ لە تیوری گەلی نوێی "ئیدەئالیزم"یان پێشبینی کرد، بەڵام بە گشتی بواری ڕەوتی ئەشاعیرە لایەنگریی لە سونەتی ئایینی بە چەکی لۆژیکی یۆنانی بوو. موعتەزیلە ئایینیان تەنها بە کۆمەڵێک لە بیروباوەڕەکان دەزانی و ئەوەیان وەک حەقیقەتێکی حاشاهەڵنەگری ژیان لەبەرچاو

نەدەگرت و سەرنجیان بەوە نەدەدا کە نزیکبوونەوە لە حەقیقەت دەکرێ بە ڕێگەی تریشدا بێجگە لە ڕێگەی عەقڵ مسۆگەر بێت، ئەوان ئاییینیان گۆڕی بۆ دام و دەزگایەک لە چەمکە لۆژیکەکان. موعتەزیلیان بێ توانا بوون لە تێگەیشتن لەم خاڵە کە لە هەرێمی ناسیندا - چ لە باری زانستی و چ لە باری ئاییینی- سەربەخۆیی و جیابوونەوەی کامڵی فیکر لە ئەزموونی بیندراو ئەستەمە.

بەڵام ناکرێ نکولی لەوە بکەین کە پرۆژەکەی غەزالی وەک کانت لە ئەڵمانیا لە سەدەی هەژدەدا لەخۆگری بەرپرسایەتی بوو. لە ئەڵمانیا رەسانەیەتی عەقڵ وەک هاوڕێیەک بۆ ئایین دەرکەوت، بەڵام زۆر زوو تێگەیی کە بۆ سەلماندنی لایەنی جەزمی ئایین بێ توانایە، تەنیا ڕێگەیەک کە بۆ رەسانەیەتی عەقڵ مابووەوە سڕینەوەی بیری جەزمی لە نووسراوە پیرۆزەکان بوو، بە سڕینەوەی بیری جەزمی بابەتی بە قازانجبوونی بنەما ئەخلاقییەکان هاتە ئاراوە و بەم شێوەیە رەسانەیەتی عەقڵ خاڵی کۆتایی لەسەر دەسەڵاتداریی بێ ئیمانی دانا. بارودۆخی بیرکردنەوە لە ئەڵمانیا وەها بوو تا ئەوەی کە کانت دەرکەوت. کتێبەکەی واتە "ڕەخنەگریی لە عەقڵی ڕەها" سنوورەکانی عەقڵی مرۆڤی ئاشکراکرد و گشت بەرهەمەکانی عەقڵخوازەکانی بێ بایەخ کرد و کردی بە کەلاوەیەک. ئەمە وەسفێکی بەجێیە سەبارەت بەو کە: کانت گەورەترین دیاری خودایە بۆ ئەڵمانیا.

شک و گومانکردنی غەزالی کە تاڕادەیەک لەمە ئەولاتر رۆی، لە ڕاستییدا هەر ئەم کارەی لە ناو جیهانی ئیسلامدا کرد و پشتی ئەو عەقڵخوازە لووت بەرز و ڕووکەشیانەی شکاند کە بەهەمان ڕێگەی عەقڵخوازیی ئەڵمانیا بەر لە کانت دەرڕۆیشتن. بە هەر شێوە جیاوازییەکی گرنگ هەیە لە نێوان غەزالی و کانتدا. کانت بەپێی ئەو

بنەمایانەی کە باوەڕی پێیان هەبوو نەیدەتوانی"ممکن الوقوع"بوونی مەعریفەی خودا بسەلمێنێت. غەزالی دەلاقەی هیوای لە ناو فیکری شیکارییدا نەدۆزیەوە و عیرفانی تاقی کردەوە و لەوێدا ناوەرۆکی ئازاد و سەربەخۆی لەبواری ئاییندا دۆزیەوە. ئەو توانی لەم هەرێمەدا مافێک بۆ ئایین بەدەست بهێنێت کە بوونێکی سەربەخۆی لە زانست و حیکمەت و "ما بعد الطبیعە" هەبێت. پانتایی بەربڵاوی عیرفان، قبوولکردنی بەرتەسکبوون و نادیاربوونی عەقڵی بۆ ئەو ئاسانتر کرد و بووە هۆی ئەوە کە هێڵێکی جیاکەرەوە لە نێوان فیکر و شهووددا بکێشرێت، بەڵام لەم خاڵە غافڵ مایەوە کە عەقڵ و شهوود لە بنەڕەتدا پەیوەست بە یەکترن و عەقڵ بە هۆی پێوەندییەوە لەگەڵ زەماندا دەبێ لە ناو بازنەی چەمکی موتەناهی و نادڵنیایی بێت. ئەم باوەڕە کە فیکر لەبنەڕەتدا سنووردارە و هەربۆیە ناتوانێت دەستی بگاتە بێ سنووریی، لەسەر ڕوانگەیەکی هەڵە دامەزراوە سەبارەت بە حەرەکەی فیکر بۆ ناسین. ئەمە لاوازیی تێگەیشتنی لۆژیکە کە لە زۆرینەیەک لە موفرەدە دژ بە یەکەکان تێدەگات بێ ئەوەی کە لە کۆتاییدا هیوایەکی هەبێت بە یەکگرتنیان و ئەمەیە کە ئێمە دەخاتە گومانەوە سەبارەت بە بنبڕبوونی عەقڵ.

لەڕاستییدا تێگەیشتنی لۆژیک بۆ وەرگرتنی ئەم زۆرینە بە ناوی جیهانێکی ڕێک و گووشراو بێ توانایە. تەنها شێوازی تێگەیشتنی لۆژیکی گشتگرکردن بەپێی لێکچوونەکانە، بەڵام ئەم گشتگرکردنانە یەکیەتیەکی درۆیین و بەکرێگیراوە کە کاریگەریەتی لەسەر واقیعە هەست پێکراوەکان دانانێت، بەڵام فیکر لە حەرەکە قووڵەکەیدا دەتوانێت دەستی بگاتە"بێسنووریی کامڵ"لە جوڵە ئاشکراکەیدا هەرکام لە چەمکە جیاوازەکان بۆ ئەوە، تەنها حوکمی چرکەساتێکی هەیە. فیکر لە زاتی

خۆیـدا راوەسـتاو نیـیە، بەڵکـو گەشـە دەکـات و لە کـاتی گونجـاودا بێسنووریی نـاوەکی خـۆی ئاشـکرا دەکـات، هەروەک ڕووەکێـک کە لە سـەرەتاوە یەکگرتنـی ئۆرگـانێکی درەختێکـی وەک واقیعێکـی ئێـستایی لەخۆدا گرتووە. کەواتە: فیکر لە ئاشکراکردنی تواناکانی خۆیدا تەواو و کامڵە و لە باری ڕوانگەی مادیەوە وەک زنجیرگەلێکی دیار و ژمێردراو دەردەکەوێـت و ئەوانەش بـێجگە لە هاوپەیوەنـد بـوون لەگەڵ یەکتـردا پێناسە ناکرێن. ئەوانە بە شوناسـە وردەکانیـان درک نـاکرێن، بەڵکو مانـا و چەمکەکانیـان لە گشتێکی گەورەتـردایە هەرکـام لەوانە لایەنـی دیـاری ئەوەن. ئەم گـشتە گەورەتـرە لە لێکـدانەوەی قورئانییـدا جۆرێـک"لـوح محفوظ"ن کە هەموو ئیمکانیاتی نادیاری ناسینیان وەک واقیعێکی هەبوو لە ناخییانـدا هەڵگرتـووە. خۆیـان لە کاتگەلێکی پەیتـا پەیتـادا وەک چەمـک گەلی سنوورداری بەدوای یەکدا دەردەخەن بۆ ئەوەی بگەنە مەبەستی ئەو یەکگرتنەی ئێستا لەواندایە.

حەقیقەت لەوەدایە کە لە ڕەوتی ناسیندا گشت بێ سنووریی ئامـادەیە کە ئیمکـانی فیکـری سـنووردار مـسۆگەر دەکـات. کانـت و غەزالـی هەردووکیـان لە زانینـی ئەم خـاڵە بـێ توانـا بـوون کە فیکـر لە کـاری ناسیندا لە بەرتەسکایەتییەکانی خـۆی دەترازێت. توخمەکانی سرووشت لەبەرامبەر یەکتردا دەبنە لەمپەری یەکتر لەحاڵێکدا کە زاتی فیکر سنوور قبووڵ ناکات و ناتوانێت لە بازنەی بەرتەسکی تاکایەتی خۆیدا زیندانی بێـت. لە نـاو جیهـانێکی بەربـڵاو کە لەوپەڕی فیکـردا بـوونی هەیە هـیچ شـتێکی نـامۆ بـۆ ئەو بـوونی نیـیە. بە بەشـداریی کردنـی بەرە بەرە لە ژیاندا، ئەو شتەی بە رواڵەت بۆ ئەو نامۆیە، دیوارەکانی سنوور وێران دەبێت و لە بێ سنووری ئامادە لە ناخی خۆیدا چێژ وەردەگرێت.

حەرەکەی فیکر تەنها لەبەر ئەوە مسۆگەرە کە سنوورەکانی ئەو بە شێوەی پەراوێزی لە ناو تاکایەتی بێ سنووریدا ئامادەیە و بروسکەی حەز و تەمەنای لە ناخییدا زیندوو راگرتووە و ئەوە لە گەڕانی بێ کۆتایی دەکاتە ئالای ڕێگەی خۆی. ئەمە هەڵەیە گەر وابزانین فیکرکردنەوە ئاکامێکی لێ نابێتەوە چونکو لە ڕێگای فیکرکردنەوەدا سنووردارییەتی و بێ سنووریی گەیشتوونە یەک و یەکتریان بینیوە.

لە ماوەی پێنجسەد ساڵی رابردوودا فیکری ئایینی لە ئیسلامدا زۆرجار بێ جوڵە و راوەستاو و بێ حەرەکە بووە. سەردەمێک بوو کە فیکری ئەوروپایی وەرگیراو لە جیهانی ئیسلام بوو، بەڵام بەرچاوترنی تایبەتمەندی دیاردەی میژووی نوێ کە دەکرێ باس بکرێت خێراییەکی سەیرە کە جیهانی ئیسلام لە باری مەعنەوەییەوە گرتویەتیەبەر بەرەو لای رۆژئاوا. ئەم حەرەکە خاڵێکی هەڵەی تێدا نییە لەبەرئەوەی کە فەرهەنگی ئەوروپایی لە بواری عەقڵانی خۆیەوە کامڵ بوو و گەشەکراوی هەندێک لە گرنگترین نمودەکانی فەرهەنگی ئیسلامییە. بەڵام لەم خاڵە دەترسین کە رواڵەتی سەیر و ماکیاژکراوی فەرهەنگ و شارستانیەتی ئەوروپایی حەرەکەی فیکری ئێمە راوەستێنێت و وێدەچێت ناکام بین لەوەی کە دەستمان بگاتە ناخی حەقیقەتی ئەو فەرهەنگە. ئەوروپا لە سەرانسەری ئەو سەدانەی کە ئێمە لە بواری فیکرییەوە خەومان لێکەوتبوو، بە شێوازێکی جیددی فیکر و کاری کرد لەسەر ئەو بابەتە بەبایەخانەی کە فەیلسووف و بیرمەندە ئیسلامیەکان بە حەزێکی زۆرەوە دڵیان بۆی لێدەدا. کاتێ قوتابخانە کەلامیەکانی ئیسلام لە سەدەکانی ناوەڕاستدا کامڵ بوون، پێشکەوتنی لەڕادەبەدەر لە پانتای ئەندێشە و ئەزموونە مرۆییەکاندا دەرکەوت. پەرەسەندنی دەسەڵاتی مرۆڤ بەسەر سرووشتدا ئیمانێکی تازەی بە هەستێکی

خۆشـەوە پێ بەخشی. زاڵبوون بەسـەر ئەو هێزانەی کە دەورووپشت و چوارچێوەی ئەویـان پێک دەهێنا جۆرێک دەسـەڵات بوو. تیۆری نـوێ هاتە ئاراوە، بابەتە کەونەکان لە ژێر تیشکی ئەزمـوونە نوێکانـدا دووبارە کەوتنە بەر لێکدانەوە و لەم ئـاڵوگۆڕەدا بـابەتی نـوێتر سـەری هەڵهێنـا. وەک ئەوەی کە بنەڕەتیترین مەقولاتی عەقڵی مرۆڤ واتە زەمان- شوێن و هـۆیەتی گەشـابێتەوە. بە پێـشکەوتنی فیکـری زانـستییەوە تەنـانەت شیواویی ئیماژی ئێمە کەوتە بەر شەپۆلی گۆڕانکارییەوە.

تیـۆری "ئەنشتاین" ڕوانگەیەکـی نـوێ سـەبارەت بە جیهـان دەخـاتە روو و ڕێگەگەلی تازە پێشنیار دەکات بۆ ڕامان و بیرکردنەوە سەبارەت بە بـابەتە هاوبەشـەکانی ئـایین و فەلـسەفە، هەربـۆیە سـەیر نییە ئەگەر جیلی لاوی موسوڵمان لە ئاسیا و ئەفریقا خوازیـاری بەرهەڵستکردنێکی نوێ بن لە ئایین و ئیمانیاندا. بە لەخەو هەستانەوەی دووبارەی ئیسلام، پێویـــستە کە ئەم بـــابەتە بە فیکرێکـــی ســـەربەخۆوە بخـــرێتە بەر هەڵسەنگاندن کە: ئەوروپا بیـر لە چـی دەکـاتەوە و ئاکامەکـانی دەگـاتە کـوێ؟ ئایـا توانـای ئەوەی هەیە کە یارمەتیمـان بـدات لە پێداچوونەوە و ئەگەر پێویـــست بێـــت لە دووبـــارە ســـازکردنەوەی فیکـــری ئـــایینی ئیسلامیماندا؟

هاوکـات ئیمکـانی ئەوە نیـیە کە بە گـشتی خۆمـان غافـڵ بکەیـن لە پروپاگەنـدەی دژ بە ئـایین و بەتـایبەت دژ بە ئـایینی ئیـسلام لە ئاسـیای ناوەڕاسـتدا کە ئێـستا لە سـنوورەکانی هینـد تێـپەڕ بـووە. هەنـدێک لە لایەنگرانـی ئەم حەرەکەیە مـسوڵمانزادەن. یەکێـک لەوانە تۆفیـق فتـرت، شـاعیری تورکە کە لەم دواییـانەدا مـرد. بەمەبەستی جێیبەجێکردنـی ئەم حەرەکەیە هەنگـاوی نـا بە کەڵـک وەرگـرتن لە شـاعیر و بیرمەنـدی گەورەمان میرزا عبدالقادر بیدل اکبرآبـادی. هیـچ گومـانێکی تێدا نییە کە

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە توێژینەوە لە سەر بنەماکانی ئیسلام بکەین، بەڵێنی ئەوە دەدەم کە لەم لێدوانانەدا توێژینەوەیەکی فەلسەفیم هەبێت سەبارەت بە بنەما سەرەکیەکانی ئیسلام، بە هیوای ئەوە کە بە لانی کەمەوە بۆ ناسینی دروستی مانای ئیسلام وەک پەیامێک بۆ مرۆڤایەتی، بە قازانج بێت، هەروەها بۆ ئەوەی کە بوارێکم رەخساندبێت بۆ توێژینەوەی زیاتر.

لەم لێدوانە سەرەتاییەدا دەست دەکەم بە هەڵسەنگاندنی رۆڵی ئاگایی و ئەزموونی ئایینی، مەبەستی سەرەکی قورئان هەژاندنی ئاگایی زیاترە لە مرۆڤدا بۆ پەیوەندی جیاواز لەگەڵ خواداوەند و جیهاندا. بەسەرنجدان بەم لایەنە تایبەتانەی فێرکاریی قورئانە کە سەردەمێک گۆتە موتالایەکی گشتی دەکات سەبارەت بە ئیسلام وەک هێزێکی پەروەردەیی و بە ئەکرمان دەڵێت: ئەوە قبوول بکە کە ئەم ئایینە هەرگیز تووشی شکست نابێت و ئێمە بە گشت دام و دەزگاکانمانەوە ناتوانین پێش کەوین. بە کورتی. . . کەس ناتوانێت لەوە پێش کەوێت.

بابەتی ئیسلام لە واقیعدا بە ڕووبەڕووبوونەوەی دوو لایەنە و لەهەمانکاتدا بە راکێشەریی بەرامبەری دوو هێزی ئایین و شارستانیەت شکڵی گرتووە. هەمان بابەت کە مەسیحیەت یەکەمجار لەگەڵیدا ڕووبەڕوو بووەوە. بابەتی سەرەکی لە مەسیحیەتدا دۆزینەوەی رەزامەندی نەفسانییە بۆ ژیانی مەعنەوی کە بەپێی روانینی دامەزرێنەرەکەی دەتوانێت بەرز ببێتەوە، بەڵام نەک بە کاریگەریەتی هێزەکانی جیهانی دەرەکی لەسەر رۆحی مرۆڤ، بەڵکو بە ئیلهامگرتن لە جیهانی نوێی داپۆشراو لە ناو رۆحیدا. ئیسلام بە تەواوەتی لەگەڵ ئەم ڕوانگەیەدا هاوڕایە و بە ئاسۆیەکی روونترەوە ئاوەها کاملی دەکات کە:

تیشکەکانی ئەو جیهانە نوێیە کە بەم شێوەیە ئاشکرا دەبێت نە تەنها بۆ جیهانی مادە غەریب نییە، بەڵکو لەسەرانسەرییدا رەوان و کاریگەرە.

کەواتە ئەو دڵنیـایی و هێوربـوونەوە رۆحـیەیە کە مەسـیحیەت بە شوێنیەوەیەتی بە نەدیتنی هێزە دەرەکیەکان کە ئیشراقی رۆحی پێشتر لەوانەدا دزەی کردبوو ئەستەم نابێت. مەگەر ئەوەی کە پێوەندی مرۆڤ لەگەڵ ئەم هێـزانەدا بە نـوورێکەوە کە لە جیهـانی دەرەوە دەیگـرن سـازگاریەکی تـایبەتی هەبێـت. ئەمە لە کـاریگەریەتییە سـیحراویەکانی مەعنەوەیەتە کە رۆح دەبەخشێتە واقعیەت و بەهێزی دەکات. ئێمە تەنها لەم رێگەیەوە دەتوانین مەعنەوەیەت بدۆزینەوە و بوونەکەی بسەلمێنین. لە ڕوانگەی ئیسلامەوە مەعنەویەت و واقع دوو هێزی بەرامبەر بەیەک نین کە نەتوانن پێکەوە هەڵ بکەن، بەڵکو ژیانی مەعنەویەت لەوەدایە کە سازگاری واقیع و جیهانی مادە بێت نەک ئەوەی کە بە تەواوەتی لێی داببڕێـت. گەر وانەبێـت کۆڵەکەکـانی سـەرەکی ژیـان بە بەرامـبەری و دژایەتییە پڕ لە ئازارەکانیەوە دەبێتە کەلاوەیەک.

مەعنەویەت بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدایە کە واقیع بکاتە موڵکی خۆی بەو هیـوایە کە لە ئاکامـدا واقیـع لەنـاو خۆیـدا بتـوێنێتەوە، وەک خـۆی لێبکات و هەموو بوونەکەی درەوشـاوە بکات. هەر ئەم دژایەتییە قووڵە لە نێوان هەست کـراو و هەسـت پێنەکـراودایە کە زانستی بیرکـاریی لە دەرەوە و زانـستی زیندەوەرناسـیی لە نـاوەوە کاریگەریەتیـان لەسـەر مەسـیحیەت دانـا. لەکاتێکـدا کە ئیـسلام بـۆ سـەرکەوتن بەسـەر ئەم دژایەتیـیەدا لەگەڵـی ڕووبەڕوو دەبێـتەوە. ئەم جیـاوازییە بەرچـاوە لە روانین بۆ وەهـا پێوەنـدییەکی بنەڕەتـی، دەرخەری جۆری روانینـی ئەم دوو ئـایینە مەزنەیە بـۆ بـابەتی ژیـانی مـرۆڤ لە شـوێنی ئێـستایدا. هەردووکیـان بانگەشـەی بـوونی"خـود"ی رۆحـانین لەنـاو مرۆڤـدا. بەم

جیـــاوازییەوە کە ئیـــسلام شـــایەتی دەدات بـــۆ ڕووبەڕووبـــوونەوەی مەعنەویەت لەگەڵ واقیع لەم جیهانەدا، وەڵامی بەڵێ دەداتە جیهانی مادە و ڕێگەی زاڵبوون بەسەریدا پیشان دەدات بەمەبەستی دەرکەوتنی بوارێک بۆ داڕشتنەوەی ژیانی واقیعی. بە سەرنجدان لە قورئان، ڕۆڵی جیهانێک کە تێیدا دەژین چییە؟ لە هەنگاوی یەکەمدا دەبێ بڵێین: جیهان بۆ یاری و بەبێ هۆ نەخوڵقاوە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ * مَا خَلَقْنَاهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لا يَعْلَمُونَ)) واتە: "**ئاسمان و زەوی و ئەوەی کە تێیدایە بۆ یاری نەمانخوڵقاندووە، ئەوانەمان بێجگە لە حەق نەخوڵقاندووە بەڵام زۆربەیان نازانن.**" (سورەتی الدخان، ئایاتی ٣٨ و ٣٩).

جیهان واقیعێکە کە دەبێ حسێبی بۆ بکرێت:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُوْلِي الأَلْبَابِ * الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللّهَ قِيَاماً وَقُعُوداً وَعَلَىَ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً)). واتە: "**دیارە کە لە خوڵقاندنی ئاسمانەکان و زەوی و هاتن و چوونی شەو و ڕۆژ بۆ ئەوانەی بیر دەکەنەوە نیشانە بوونی هەیە. دیارە کە بە ڕاوەستاویی و دانیشتوو یان بە خەوتوویی خودایان لە یادە و بیر لە خوڵقاندنی ئاسمانەکان و زەوی دەکەنەوە و دەڵێن خودایا تۆ ئەمانەت بێهودە نەخوڵقاندووە...**" (سورەتی آل عمران، ئایاتی ١٩٠ و بەشێک لە ١٩١).

لە لایەکیترەوە جیهان بەجۆرێک شکڵی گرتووە کە دەکرێ پەرە بسەنێت: خوای گەورە دەفەرموێت: ((يَزِيدُ فِي الْخَلْقِ مَا يَشَاءُ)). واتە: "... **وە لە ئافراندندا هەرچی بیەوێت پێی زیاد دەکات...**". (سورەتی الفاطر،

بەشێک لە ئایەتی یەکەم). وەها نییە کە بەرهەمێک بگاتە کۆتایی، بێ بزوتن بێت و ئیتر گۆڕانکاری بەسەر نەیەت. دەبێ قووڵاییەکەی هەڵبکۆڵدرێت ڕەنگە خەونی لەدایکبوونێکی نوێی تێدا بێت:

خوای گەورە دەفەرموێت: (قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ثُمَّ اللَّهُ يُنشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ). واتە: "**بڵێ لەناو زەوییدا بگەڕێن و بڕوانن کە چۆن خەڵکی خوڵقاندووە، لەوکاتەدا خودا ئافراندنی کۆتایی واتە جیهانی دیکە دەردەخات...**" (سورەتی العنکبوت، بەشێک لە ئایەتی ٢٠).

ئەم هاتوچووە و حەرەکەی سیحراویی جیهان، ئەم تێپەڕبوونی بێدەنگی جیهانە کە وەک شەو و ڕۆژ بەسەر ئێمەی مرۆڤدا ئاشکرا دەکرێت، لە ناو قورئاندا وەک یەکێک لە گەورەترین نیشانەکانی ناسینی خودا سەرنجی پێدراوە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((يُقَلِّبُ اللَّهُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُوْلِي الْأَبْصَارِ)). واتە: "**خودا شەو و ڕۆژ دەکات بە یەک و لەمەشدا بۆ خاوەن ڕوانینەکان عیبرەتێک هەیە**". (سورەتی النور، ئایەتی ٤٤).

ئاوەهایە کە پێغەمبەر فەرمووی:"بە خراپە باسی زەمان مەکەن لەبەرئەوەی کە زەمان خودایە"، زەمان و مەکان بە گشت گەورەییانەوە لەخۆگری ئەم بەڵێنەن کە هەموو شتێک لە بەرامبەر مرۆڤێکدا کە ئەرکەکەی بیرکردنەوە لە نیشانەکانی خودایە، تەسلیم دەبێت و ملکەچ دەبێت، بەم پێیە سنوورەکانی دەرکەوتنی زاڵبوونی مرۆڤ بەسەر سرووشتدا بە شێوەی واقیع و بالفعل ئاشکرا دەبێت:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً)). واتە: "**مەگەر نابینن کە خودا هەرچی کە لە ئاسمانەکان و زەوی دایە بۆ ئێوەی دەستەمۆ کردووە و**

**نیعمەتەکـانی خـۆی بە ئاشـکرا و نهێنـی بـۆ ئێـوە کامـڵ کـردووە؟".** (سورەتی لقمان، بەشێک لە ئایەتی٢٠)

هەروەها دەفەرموێت: ((وَمَا ذَرَأَ لَكُمْ فِـي الأَرْضِ مُخْتَلِفاً أَلْوَانُـهُ إِنَّ فِـي ذَلِـكَ لآيَةً لِّقَوْمٍ يَذَّكَّرُون)). واتە: "... **شەو و ڕۆژی خستە خزمەتی ئێوە و ڕۆژ و مانگ و ئەستێرەکان بە فەرمانی ئەو لە خزمەتدان و لەمەدا بۆ ئەوانەی کە بیر دەکەنەوە، عیبرەتی تێدایە**". (سورەتی النحل ئایەتی ١٣).

جیهـان وەهـا ئافراندنێکی هەیە و لەسـەر وەهـا مەنهەجێکە، ئێستا بـا سـەیرکەین کە مرۆڤێـک کە جیهـان لە تەواوی لایەنەکـانیەوە بەرامـبەر بەوە چ نـاوەرۆکێکی هەیە و خـاوەنی چ خوڵقانـدنێکە؟ ئەو هەرچەنـد خـاوەنی شـیاوترین هێـزە نەرمەکـانە لەنـاو مێـشکی خۆیـدا، خـۆی لە شـایەنی تەرازووی ژیانـدا بە بچـووک دەزانێـت کە لە لایەن هێـزە بەرگرەکانەوە دەوری گیراوە:

خـوای گەورە دەفەرموێت: ((لَقَدْ خَلَقْنَـا الْإِنـسَانَ فِـي أَحْـسَنِ تَقْـوِيمٍ * ثُـمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ)). واتە: "**مرۆڤمان بە باشترین شێوە خوڵقاندووە و پاشان ئەومان کردە کەمترین کەمەکان**". (سورەتی التین ئایەتی ٤و ٥).

مرۆڤ لە ناو شوێنی خۆیدا چۆن دەبینین؟ بوونەوەرێکی بێ ئارام، سـجن لە نـاو ئامانجەکانیـدا کە هەمـوو شـتێکی فەرامـۆش کـردووە و لە گەڕانـی بەردەوام بە شـوێن بـوارە نوێکـانی دەرخـستنی خۆیـدا هەمـوو جۆرە ئێش و ژانێک بۆ خۆی دروست دەکات. مرۆڤ بە هەمـوو کەم و کوڕیەکـانیەوە بەسـەر سرووشـتدا زاڵە بەڕادەیەک کە بـاری ئەمـانەتێکی گەورەی لەسـەر شـانە. بە کەلامـی قورئـان ئەمانەتێک کە ئاسـمانەکان و زەوی و کێوەکان نەیانتوانی هەڵیگرن:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُوماً جَهُولاً)). واتە: "**ئێمە ئەم ئەمانەتەمان سپاردە ئاسمانەکان و زەوی و کێوەکان، لە هەڵگرتنی خۆیان شاردەوە و ترسان و مرۆڤ ئەوەی هەڵگرتەوە کە ستەمکار و نەزانە**". (سورەتی الاحزاب، ئایەتی ٧٢).

بێگومان دەورانی ژیانی سەرەتایەکی هەیە، بەڵام ڕەنگە چارەنووسەکەی وەها بوو کە لە ناو سیستمی جیهاندا ببێتە توخمێکی هەرمانی:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَى (*) ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى (*) فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى (*) أَلَيْسَ ذَلِكَ بِقَادِرٍ عَلَى أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَى (*)). واتە: "**مەگەر مرۆڤ وادەزانێت کە بێهودە بەجێ دەهێڵدرێت؟ مەگەر دڵۆپێک لە مەنی نەبوو کە دەڕژا، پاشان بووە خوێنێکی دەڵەمە و خودا خوڵقاندی و جوانی کرد. لەو دوو جۆری نێر و مێی خوڵقاند. ئەی چۆن ئەم خودایە ناتوانێت کە مردووەکان زیندوو بکاتەوە؟**". (سورەتی القیامة ئایەتی ٣٦-٤٠).

کاتێک کە هێزەکانی دەوروپشتی مرۆڤ، ئەو بەرەو لای خۆیان ڕادەکێشن، توانای شکڵدان و ڕێنموونی کردنی ئەوانەی هەیە. کاتێک ئەو هێزانە بزوان و جوڵەی لێ بسەنن، دیسان توانای سازکردنی جیهانێکی بەرینتری لە ناخی خۆیدا هەیە. هەر لەو شوێنەدا کە سەرچاوەی ئیلهام و دڵخۆشی بێ سنووری تێدایە، چارەنووسەکەی وەک گوڵە باخ ناخۆش و ژیانەکەی زوو تێپەڕ دەبێت. هیچ لایەنێکی حەقیقەت وەک ڕۆحی مرۆڤ ئاوەها بەهێز، ئیلهامبەخش و جوان نییە. بەپێی لێکدانەوەی قورئان لە قووڵایی بوونی مرۆڤدا هێزێکی خوڵقێنەر و ڕۆحێکی ئیستعلایی هەیە کە لە ڕەوتی کامڵبوونیدا لە حاڵەتێکەوە بۆ ئەویدی عروج دەکات:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((وَاللَّيْلِ وَمَا وَسَقَ (*) وَالْقَمَرِ إِذَا اتَّسَقَ (*) لَتَرْكَبُنَّ طَبَقاً عَن طَبَقٍ (*)). واتە: **"سوێند دەخۆم بە شەفەق. بە شەو و هەرچی دادەپۆشێت. بە مانگ زەمانێک کە کامڵ دەبێت، کە لە مەرگەوە بۆ ژیانێکی نوێ دەڕۆن"**. (سورەتی الانشقاق ئایەتی١٦-١٩).

ئەم یانسیبە بۆ مرۆڤ دەرچوو کە لەناو قووڵترین ئامانج و هیواکانی جیهانی دەورپشتیدا بەشدار بێت و چارەنووسەکەی هەر بەوجۆرە لێبدات کە چارەنووسی جیهان. بڕێکجار بە هاوشێوەیی لەگەڵ هێزەکانی جیهاندا و بڕێکجار بە بەکارهێنانی تەواوی هێزەکانی لە ڕێگەی ئامانج و مەبەستەکانی خۆیدا کە شکڵیان پێبدات. خودا لە پرۆسەی ئەم گۆڕانکارییە کاملبوونەوەدا دەبێتە یارمەتیدەری بەو مەرجەی کە هەنگاوی یەکەم هەڵبگرێت:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((إِنَّ اللّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ)). واتە: **"...وە خودا ئەو شتەی لای قەومێکە، ناگۆڕێت مەگەر ئەوەی کە ئەوەی لە ناو زەمیریاندایە، بیگۆڕن"**. (سورەتی الرعد بەشێک لە ئایەتی ١١).

ئەگەر مرۆڤ هەنگاوی یەکەم هەڵنەگرێت، ئەگەر کەڵک لە ئیمکانیاتی دەروونی خۆی وەرنەگرێت، ئەگەر ئەو گوشارەی کە ژیان بەسەریدا دەسەپێت هەست پێنەکات، ئەوکاتە ئیتر رۆحی وەک بەرد رەق دەبێت و دەبێتە مادەیەکی مردوو، بەڵام ژیان و هەڵفرینی مەعنەوی ئەو پەیوەستە بە دروستبوونی پێوەندی لەگەڵ ئەو بابەتە هەستپێکراوانەی کە بەرەو رووی دەبێتەوە. ئەم پێوەندیە سەرێکی لە ناو مەعریفەدایە و مەعریفە یان ناسین هەمان ئیدراکی هەستە کە بە هێزی تێگەیشتن دەگاتە کەماڵ.

خوای گەورە دەفەرموێت: ((وَإِذْ قَـالَ رَبُّـكَ لِلْمَلاَئِكَـةِ إِنِّـي جَاعِـلٌ فِـي الأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُواْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاء وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَـكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُـونَ (*) وَعَلَّـمَ آدَمَ الأَسْـمَاء كُلَّهَـا ثُـمَّ عَرَضَـهُمْ عَلَـى الْمَلاَئِكَـةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاء هَـؤُلاء إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ (*) قَالُواْ سُـبْحَانَكَ لاَ عِلْـمَ لَنَـا إِلاَّ مَـا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ (*) قَالَ يَا آدَمُ أَنبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ فَلَمَّا أَنبَأَهُمْ بِأَسْـمَآئِهِمْ قَـالَ أَلَـمْ أَقُـل لَّكُـمْ إِنِّـي أَعْلَـمُ غَيْـبَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَأَعْلَـمُ مَـا تُبْـدُونَ وَمَـا كُنـتُمْ تَكْتُمُونَ)). واتە: **"ئەوکاتەی کە خودا بە فریشتەکانی وت: من لە زەویدا جێگرێک دەخوڵقێنم. وتیان: لەوێدا تۆ شتێک دەخوڵقینی کە خراپە دەکات و خوێن دەڕێژێت. ئێمە بە پاکی تۆ دەپەرستین و تەقدیست دەکەین. وتی: من ئەو شتە دەزانم کە ئێوە نایزانن. و خودا هەموو ناوەکانی فێری ئادەم کرد. دوای ئەوە بابەتەکانی خستە بەردەست فریشتەکان و وتی: ئەگەر راست دەکەن ناوی ئەمانەم پێ بدەن. وتیان تۆ ستایشت دەکەین. ئێمە هیچ زانستێکی ترمان نییە بێجگە لەوەی کە تۆ فێرت کردین و تۆی زانای مەزن. وتی: ئەی ئادەم! فریشتەکان ئاگادار بکە لە ناوی شتەکان. کە لەو ناوانە ئاگاداری کردن وتی: مەگەر من پێم نەوتن کە من نهێنی ئاسمانەکان و زەوی دەزانم و ئەوەی کە ئاشکراتان کرد و ئەوەی کە شاردتانەوە، هەمووی دەزانم"**. (سورەتی البقرە ئایەتی ٣٠-٣٣).

ئیشارەتی ئەم ئایەتە ئەوەیە کە ئیستعدادی ناولێنانی شتەکانی بەخشێوەیەتە مرۆڤ، واتە دەتوانێت لەوانە سورەتی عەقڵی و چەمک ساز بکات. سازکردنی چەمک و سورەتی عەقڵی لە شتەکان مانایەکی هاوتای ئەوەی هەیە کە شتەکان دێنە ژێر رکێفەوە. کەواتە تایبەتمەندی زانست و ناسینی مرۆڤ لە شتەکان بریتییە لە چەمک و ئیماژ و بە چەکی ئەم ناسینی ئیماژەوەیە کە مرۆڤ دەگاتە لایەنی بینینی حەقیقەتی ڕەها. یەکێک

له خاڵه بەرچاوەکانی قورئان جەختکردنه لەسـەر ئەو لایەنەی حەقیقەت که دەبیندرێت. ئیزنی ئەوەم بدەنێ چەند ئایەتێک له قورئان بهێنمەوە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنزَلَ اللّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِن مَّاء فَأَحْيَا بِهِ الأرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخِّرِ بَيْنَ السَّمَاء وَالأَرْضِ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ)). واتە: "**له خوڵقاندنی ئاسمانەکان و زەوی و خیاوازی شەو و رۆژ و پاپۆڕەکان که له بەرژەوەندی مرۆڤدا بەرەو دەریا رەوانن، ئاوێک که خودا له ئاسمانەوە دەیخاتە خوار و زەوی له پاش مردن بەوە زیندوو دەکاتەوە و له هەموو زیندەوەرەکانی تێدا بڵاوە کرد، له گۆڕانکاریی باکان که له نێوان ئاسمان و زەویدا خزمەت دەکەن، بۆ ئەو گروپەی که عاقڵن، عیبرەتی تێدایە**". (سورەتی البقرة ئایەتی ١٦٤).

هەروەها دەفەرموێت: ((وَهُوَ الَّذِيَ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ قَدْ فَصَّلْنَا الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ (*) وَهُوَ الَّذِيَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ نَبَاتَ كُلِّ شَيْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِراً نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبّاً مُّتَرَاكِباً وَمِنَ النَّخْلِ مِن طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ وَجَنَّاتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ وَالزَّيْتُونَ وَالرُّمَّانَ مُشْتَبِهاً وَغَيْرَ مُتَشَابِهٍ انظُرُواْ إِلِى ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ وَيَنْعِهِ إِنَّ فِي ذَلِكُمْ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ (*) وَجَعَلُواْ لِلّهِ شُرَكَاء الْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ وَخَرَقُواْ لَهُ بَنِينَ وَبَنَاتٍ بِغَيْرِ عِلْمٍ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يَصِفُونَ (*)). واتە: "**هەر ئەوە که ئەستێرەکانی بۆ ئێوە خوڵقاندووە تاکو بەوانە له زوڵەماتی وشکایی و دەریادا رێگە بدۆزنەوە. ئێمە ئەم ئایەتانەمان بۆ گروپێکی زانا شەرح کردووە. هەر ئەوە که ئێوەی له یەک کەسەوە خوڵقاند و ئێوە پێگە و حەشارگەیەکتان هەیەو ئێمە ئەم ئایەتانەمان بۆ ئەوانەی که تێدەگەن شەرح کردووە. ئەوە که له ئاسمانەوە ئاوێکی نازڵ کرد و**

**بەوە هەمـوو ڕوەکەکانمـان پێکهێنـا و بـۆ نمـوونە سـەوزەڵانییەکمان خولّقانـد کە لەوەش تۆکـانی لەسـەر یەک دانـراوە و لە خورمـا، لە گـوڵەکەی هێشووی شـۆڕەوە بـوو. . . لە باخەکانـدا لە مێوەوە هەتـا زەیتوون و هەنار. لێکچوو و نایەکسانی تێدایە. بڕواننە میوە ئەوکاتەی کە پێدەگات. لە هەموو ئەمانەدا بۆ گروپێک کە ئیمانیان هەیە عیبرەتی تێدایە**"(سورەتی الانعام ئایەتی ٩٨-١٠٠).

هەروەها دەفەرموێت: ((أَلَمْ تَرَ إِلَى رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ وَلَوْ شَاء لَجَعَلَهُ سَاكِناً ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلاً (*) ثُمَّ قَبَضْنَاهُ إِلَيْنَا قَبْضاً يَسِيراً)). واتە: "**مەگەر نەتبینـی کە خـودای تـۆ چـۆن سـێبەری کێـشاوە و ئەگەر بیوسـتبا ڕاوەستاوی دەکرد و ئەوکـاتە خۆرمـان کردە نیشانەکەی. پاشـان بە گیرانێکی هێدی بەرەو خۆمانمان برد**". (سورەتی الفرقان ئایەتی٤٥-٤٦)

هەروەها دەفەرموێت: ((أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ (*) وَإِلَى السَّمَاء كَيْفَ رُفِعَتْ (*) وَإِلَى الْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ (*) وَإِلَى الْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ (*)). واتە: "**بۆچی سەیری هەور ناکەن کە چۆن خولّقاوە و ئاسمان کە چۆن ڕاوەستاوە و هەروەها کێوەکان کە چۆن داکوتراون و زەوی کە چۆن ڕاکێشراوە**". (سورەتی الغاشیة ئایەتی ١٧-٢٠).

هەروەها دەفەرموێت: ((وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْعَالِمِينَ)) . واتە: "**لە جـوملەی ئایەتەکـانی ئەو خولّقانـدنی ئاسـمانەکان و زەوی و جیـاوازی زمانەکـان و ڕەنگەکـانی ئێوەیە کە لەمەدا بۆ جیهانیەکان عیبرەتی تێدایە**". (سورەتی الروم ئایەتی ٢٢)

گومـانی تێـدا نییە کە مەبەسـتی سـەرەکی قورئـان لە بیرکـردنەوە لە سرووشـت هەژانـدنی خودئاگـاییە لەنـاو مرۆڤـدا کە سرووشـت سـومبولەکەیەتی. خـاڵی شـیاویی سـەرنجدان لە قورئانـدا ڕوانـگەی

گشتیەتی بە مەعریفەی ئەزموون کە دەبێتە هۆی دروستبوونی هەستی ڕێزی هۆگرەکانی بۆ حەقیقەت دەبێت و لە ئاکامدا ئەوانی کرد بە داڕێژەری زانستی نوێ. ئەمە بابەتێکی بە بایەخ و گرنگە لە بەخەبەرهاتنی ڕۆحی ئەزموونخوازی لە سەردەمێکدا کە توێژینەوەی مرۆڤ بە مەبەستی ناسینی خودا لە ڕێگەی موتالای شتەکانەوە هیچ بایەخێکی پێنەدەدرا.

بەپێی وتەی قورئان هەروەک پێشتر باسکرا جیهان کۆتاییەکی مەترسیدار و جددی هەیە و واقیعەکانی کە تووشی گۆڕانکاریی دەبن ئێمە ناچار دەکات بەوەی کە ڕوخسارە نوێکان قبوول بکەین. هەوڵە فیکریەکان ئەو لەمپەرانەی کە جیهان بۆتە هۆکاری دروستبوونیان، لە ناو دەبات و هەروەها ژیانمان پتەو و دەوڵەمەند دەکات. روانینمان گەشتر دەکات و بەم شێوەیە ئامادەمان دەکات تاکو بە شارەزاییەوە بێینە ناو لایەنە وردەکانی ئەزموونە مرۆییەکانەوە.

لەم لەمسکردنە قووڵەی گەریانی کات و ناجێگری شتەکانە کە ڕێنموونی دەکرێین بەرەو دیداری عەقڵی و حەقیقەتی ناکاتی و جێگری جیهان. بوونەوەرێکی وەک مرۆڤ کە دەبێ ژیانی خۆی لە ناو شوێنێکی داخراو و پڕ لە هۆکاری بەرەنگار بپارێزێت، ناتوانێت لە مەشهوودەکان غافڵ بمێنێت. قورئان روانینی ئێمە بۆ واقیعە مەزنەکان تووشی گۆڕانکاری دەکات کە تەنها درک کردن و پاراستنەکەی ئیمکانی سازکردنی شارستانیەتێکی پتەو مسۆگەر دەکات. فەرهەنگی ئاسیا یان باشتر بڵێم فەرهەنگی هەموو جیهانی قەدیم ناسەرکەوتوو بوو، لەبەر ئەوەی کە ئەوان بەتایبەتی لە ناخەوە گەیشتنە حەقیقەت و لە ناخەوە بەرەو دەرەوە حەرەکەیان کرد. ئەم شێوازە تیۆریگەلی بێ هێزی بۆ

سازدان. دیاره که تەنها له سەر تیۆری ڕەها ناکرێ شارستانیەتێکی پتەو و سەقامگیر بینا بکرێت.

بێگومان لەم ڕەوتەدا له باری مێژوویەوە شێوازی ئەزموونی ئایینی وەک هۆکاری دەست گەیشتن به سەرچاوەی مەعریفەی ئیلاهی له پێشتره به نیسبەت دیکەی دەڤەرەکانی ئەزموونی مرۆییەوە. قورئان شێوازی ئەزموونیی به قۆناغێکی پێویست دەزانێت له ژیانی مەعنەوی مرۆڤدا و گرنگایەتیەکی یەکسان دەدات به گشت دەڤەرەکانی ئەزموونی مرۆیی وەک سەرچاوەیەکی ناسینی حەقیقەتی کۆتایی که نیشانەکانی پێکەوه له ناخ و لەدەرەوەی هەموو شته هەبوونەکان ئاشکرا دەکات. یەکێک له ڕێگه ناراستەوخۆکان بۆ دروستکردنی پێوەدنی لەگەڵ واقیعێکدا که لەبەرامبەرماندایە، بینینی عەقڵی و هەڵسەنگاندنی سومبولەکانیەتی که خۆی له ناو درک کردنی هەستدا ئاشکرا دەکات. ڕێگەیەکیتر پێوەدنی ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئەو واقیعەیه به شێوەیەک که خۆی له زەمیری کائیناتدا دەردەخات.

مەیل و خوازیاریی قورئان بەرەو سرووشت دەرخەری ئەوەیه که مرۆڤ لەگەڵیدا گرێ دراوە. ئەم پێوەندیه دەبێ به هۆی خاوەنداریەتی ئەو توانایانەوە بێت که دەسەڵاتیان بەسەر سرووشتدا هەیه و بۆ بەرژەوەندی مرۆڤ بەکار بهێنرێت بەشێوەیەک که تەمەنای درۆیین بۆ داگیرکردنی سرووشت لەوێدا ڕێی نەبێت بەڵکو شایستەی بەرژەوەندیه بەرزەکانی ژیانێکی ڕۆحی و مەعنەوی بێت. کەواته بۆ ئەوەی که وێنەیەکی تەواو و کامڵ له حەقیقەت مسۆگەر بێت پێویسته که ئیدراکی هەست به ئیدراکێکیتر که قورئان به "قلب" یان "فوئاد" پێناسەی دەکات کامڵ ببێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ((الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الْإِنسَانِ مِن طِينٍ (*) ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِن سُلَالَةٍ مِّن مَّاء مَّهِينٍ (*) ثُمَّ سَوَّاهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن

رُّوحِهِ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلاً مَّا تَشْكُرُونَ (*)). واته: "**هەر ئەوەی کە خولقاندنی هەموو شتێکی چاک کرد و ئافراندنی مرۆڤی لە گڵەوە دەستپێکرد و نەژادی ئەوی لە تۆیەکی لە ئاو کەمتر دانا و پاشان ئەوی کامڵ کرد و لە رۆحی خۆیەوە بەویدا و بۆ ئێوە گوێ و چاوەکان و دڵەکانی خولقاند و ئێوە چەندە کەم سوپاسی خودا دەکەن**". (سورەتی السجدة، ئایەتی ٧-٩)

"قلب" جۆرێک شهوود یان دەروون بینییە کە لە کەلامی جوانی **جەلال الدین مەولەوی** دا هێزی خۆی لە تیشکی خۆر وەردەگرێت و ئێمە لەگەڵ لایەنگەلێک لە حەقیقەت ئاشنا دەکات کە جیاوازە لەگەڵ ئەو شتەی کە تا ئێستا بە هۆی ئیدراکی هەستەوە دەستمان کەوتبوو. [1]

ئەمە شتێکە کە بەپێی وتەی قورئان"دەبینێت"و ئەگەر راپۆرتەکانیان بە دروستی لێک بدرێتەوە هەرگیز هیچ هەڵەیەکی تێدا ناکرێت. بە گشت ئەم باسانەوە نابێ ئەوە بە هێزێکی نهێنی سەیر بزانین بەڵکو ئەم شێوازی ئیدراکە لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ حەقیقەتی ڕەهادایە کە هەستەکان بە واتای فیزیۆلۆژیک لەوێدا هیچ رۆڵێکیان نییە. بەرژەوەندی وەها ئەزموونێک کە بەم شێوەیە لە بەرامبەر ئێمەدا دەردەکەوێت بە هەمان ڕادە واقیعی و هەستپێکراوە کە هەر ئەزموونێکیتر ئەم جۆرە ئیدراکە چ بە رۆحی وەسف بکەین چ بە عیرفانی یان میتافیزیکی لە بایەخەکەی وەک ئەزموونێک کەم ناکاتەوە. لە ڕوانگەی مرۆڤی سەرەتاییدا هەرشتێک کە میتافیزیکی و"خرق العادة"بوو بە ئەزموون

---

٤- ڕەنگە مەبەستی ئیقباڵ ئەم بەیتانەی مەولانا بێت کە دەڵێ:

این برون از آفتاب و از سها و اندرون از عکس انوار علی

نور نور چشم خود نور دلست نور چشم از نور دلها حاصل است

باز نور نور دل خداست کو ز نور عقل و حس پاک و جداست

ناوی لێدەبرا. پێویستییە خێراکانی ژیان بەناچار ئەویان مەجبوور دەکرد کە ئەزمــوونەکەی خــۆی لێــک بــداتەوە و لە نــاخی ئەم لێکــدانەوە واتای"سرووشت"بە مانا ئەمرۆییەکەیەوە سەری هەڵێنا. حەقیقەتی گشتی کە دێـتە نـاو هەرێمـی ئاگـایی ئـێمەوە و ئەو لێکـدانەوە بە شـێوازێکی واقیعـی ئەزمـوونکراو دەردەخـات، رێگەگەلیتریـشی هەیە بـۆ زاڵبـوون بەســەر شــعووری ناخمانــدا و ئیمکانیــاتی زیــاتر دابــین دەکــات بــۆ لێکدانەوەی ئەزمـوونی هەسـت و ئەزمـوونی ئـایینی. ئەدەبیـاتی ئـایینی و عیرفانی مرۆڤ شایەتیەکی بەهێزە بۆ ئەم ڕاستییە کە ئەزمـوونی ئـایینی لە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتییدا بە ڕادەیەکی زۆر پتەو کاریگەر بـووە بەشێوەیەک کە ناکرێ وەک خەیاڵێکی ڕەها نکولی لێ بکرێت. ئێمە هـیچ بەڵگەیەکمــان لەبەردەســتدا نیــیە تــاکو بەپێــی ئەوە تەنهــا ئەزمــوونە ئاسـاییەکانی مـرۆڤ وەک واقیـع قبـووڵ بکەیـن و دیـکەی نموونەکـانی ئەزمـوون وەک عیرفـان و سـۆز وەلا بخەیـن. ڕاسـتییەکانی ئەزمـوونی ئـایینی لە نێـوان دیـکەی ڕاسـتیەکانی ئەزمـوونی مرۆیـی بە بـابەتگەلێکی حاشـاهەڵنەگر دەژمێـردرێن و شـیاویەتییان بـۆ کـاری ناسـین لە ڕێـگەی لێکدانەوە، متمانەیەکی هاوشانی دیکەی واقیعەکانی هەیە. هەڵسەنگاندنی ڕەخنەگـرانەی ئەم دەقەرەی ئەزمـوونی مرۆیـی هـیچ جـۆرە بێڕێزیەکـی تێدا نییە. پێغەمبەری ئیسلام یەکەمین تـوێژەری رخنەگری دیاردەکانی نەفس و دەروون بوو. **بوخاری** و دیکەی توێژەرانی حەدیس شـەرحێکی گرنگیــان نووســیوە ســەبارەت بە لێکــدانەوەی پێغەمــبەر بــۆ لاوێکــی جوولەکە بە ناوی **ئیبنی صیاد** کە نەخۆشینی دەروونی هەبوو، حاڵەت و مەیل و شـێتیەکانی ئەم لاوە سـەرنجی پێغەمبەری راکێشا. ئەو بەرێـزە نەخۆشــەکەی پــشکنی و پــاش پرســیارگەلی زۆر ئەوی لە حــاڵەتە جیاوازەکانـدا خـستە بەر سـەرنج. جارێـک لە پـشت درەختـێکەوە خـۆی

حەشاردا تاکو گوێبیستی قسەکانی ئەو بێت کە ناوشیارانە دەیکا. دایکی ئەو لاوە هەرچۆنێک بێت ئەوی لە بوونی پێغەمبەر ئاگادار کردەوە و ئەو گەنجە خێرا گەڕایەوە سەر حاڵەتی سەرەکی خۆ. پێغەمبەر وتی: ئەگەر دایکی لێی گەڕابایە، ڕەنگە بابەتەکەمان بۆ روون دەبووەوە. هەندێک لە سەحابەکان کە لە ڕەوتی ئەم یەکەمین پشکنینی دەروونناسانەی مێژووی ئیسلامدا ئامادە بوون و تەنانەت لێکدەرەوەکانی حەدیس لەم ساڵانەی دواییدا کە وردبینی زۆریان بۆ تۆمارکردنی ئەم ڕووداوە کردووە، دیسان لە گرنگایەتی ئەم شێوازی ڕووبەڕووبوونەوەیە تێنەگەیشتوون و ئەوەیان بە فۆرمی سادەی خۆیان لێک داوەتەوە.

پرۆفیسۆر **مەک دانالد** کە بە ڕەواڵەت کە لە باری دەروووناسیەوە لە نێوان خودئاگایی عیرفانی و خودئاگایی پێغەمبەرانەدا جیاوازیەکی بنەڕەتی نابینێت، ئەم شێوازی لێکۆڵینەوەی پێغەمبەرێک کە هەوڵی ئەو بۆ ناسینی ئەویدی بە پێی فۆرمی کاری "ئەنجومەنی لێکۆڵینەوە دەروونیەکان"ە، زیاتر بە باری ئایینی لێک دەداتەوە.

درککردنی زیاتری رۆحی قورئان کە لە لێدوانی دواییدا ئاماژەی پێ دەکەم، بووە هۆی دامەزراندنی حەرەکەیەکی فەرهەنگی کە بووە هۆی لەدایکبوونی ڕوانگەیەکی ئەزموونی نوێ. ئەم ئیمکانەی بە پرۆفیسۆر **مەک دانالد** دا تاکو بابەتی گرنگی بینین و پشکنینی پێغەمبەر لە جوولەکەیەکی شێتئاسا لێک بداتەوە. بەم حاڵەوە یەکەمین موسوڵمان کە توانی لە چەمک و بایەخی شێوازی بیرکردنەوەی پێغەمبەر تێبگات، **ئیبن خەلدون** بوو کە بە رۆحی وردبینی زیاترەوە لە چەمکی خودئاگایی عیرفانی نزیک ببێتەوە و بە لانی کەمەوە بگاتە هەمان تیۆری **ئیبن خەلدون** خاوەنی هەندێ بیروڕای سەرنجڕاکێشی دەروونناسانە بووە کە وێدەچێت لێکچوونی

نزیکـی هەبێـت لەگەڵ ئیـدەکانی **ویلیـام جیمـز** دا[1]، لە کتێبـی فرەچەشـنی ئەزموونی ئایینی. دەروناسی نوێ تەنها ماوەیەکە کە دەستی کردووە بە موتـالای وردی نـاوەرۆکی خودئاگـایی عیرفـانی و ئـێمە هێـشتا شـێوازێکی کاریگەری زانستیمان لەبەردەستدا نییە کە ناوەرۆکی حاڵەتە ناعەقلانیەکان شـی بکەیـنەوە. بەم کـاتە کەمەوە کە لەبەردەسـتمدایە نـاکرێ لە بـواری مێژوو و دەرەجە جیاوازەکانی خودئاگایی عیرفانی لە باری دەوڵەمەندی و ژیانبەخـشیەکەوە کە هەیە، تـوێژینەوەیەک ئاراسـتە بـکەم. لەم دەرفەتەدا تەنها دەکرێ هەندێ ئیدەی گشتی سەبارەت بە تایبەتمەندییە دیارەکانی ئەزموونی عیرفانی باس بکەین.

١- یەکەمـین خـاڵ کە دەبـێ لەبەرچـاو بگیردرێـت ئەمەیە کە ئەم ئەزمـوونە بـێ واسـیتەیە و لەم بـارەوە لەگەڵ دیـکەی ئەزمـوونە مرۆییەکانـدا کە ئامـانجی ناسـین مـسۆگەر دەکـات، جیـاوازی نیـیە. هەر ئەزموونێک راستەوخۆ و بێ واسیتەیە. هەر بەو شێوەیە کە دەڤەرەکانی ئەزمـوونی ئاسـایی لە بەر هەڕەشـەی لێکدانەوەی دەرکەوتە هەسـتەکانە بۆ ناسـینی ئێمە لە جیهـانی دەرەوە، دەڤەری ئەزمـوونی عیرفـانییش بـۆ ناسـینی ئـێمە لە خـودا لە بەر هەڕەشـەی لێکـدانەوەدایە. بـێ واسـیەتە بوونی ئەزمـوونی عیرفـانی مانـایەکی بێجگە لەوە نییە کە ناسـینی خـودا جیاوازی نییە لەگەڵ ناسینی دیکەی درک پێکراوەکاندا. خـودا بوونێک بە چییەتـی مەتمـاتیکی یـان دام و دەزگـایەک بە چەمـک گەلـی پەیوەسـتەوە نییە کە هیچ پێوەندیەکی لەگەڵ ئەزمووندا نەبێت.

---

[1] - ویلیام جیمز ١٨٤٢-١٩١٠، بە باوەڕی ئەو جیهان کە دەستکردی خودایە کامڵ نییە کەواتە خودی ئەویش ناتوانێت کامڵ بێت. خـودا لە خولّقاندنی جیهانێک کە لەوێدا ئازار و ئێش و ژانێکـی زۆر بـوونی هەیە شـادمان نیـیە. خـودا، خـودای لە عـاڵی شـت سـازکردنە و ئەمەش چەمکێکە کە دەبێ بە "پرۆسەی خودا" ناوی لێبەرین.

٢- خـــاڵی دووهەم، بە ئەزمـــوون نەبـــوونی گـــشتیەتی ئەزمـــوونی عیرفـانییە. کاتێـک مێـزی بەرامـبەر بە خـۆم دەخەمە بەر تـاقیکردنەوە، گەلێک دەرەنجامی ئەزموونیی دێتە ناو ئەم ئەزموونە سادەوە و لە ناو ئەم گەنجینـەی زانیاریـانەوە مـن ئەو گـرووپە هەڵـدەبژێرم کە لە نـاو دیسیپلینی تایبەتی کات و شوێندا دەگونجێن و ئەوانە لە پێوەندی لەگەڵ مێـزی کـارەکەدا لای یەکتـر دادەنـێم و دەرئەنجامێـک سـاز دەکرێـت. لە حاڵەتی عیرفانییدا بە هەر ڕادە هەژێنەرتـر و دەوڵەمەندتر بێت ئەندێشە تەنـازوول دەکـات و لێکـدانەوە و شـیکاریی ئەم دەرەنجامـانە ئەسـتەم دەبێت. حاڵەتی عیرفانی لەگەڵ ئاگایی عەقڵی بە مانـای بـاو جیاوازیەکی هەیە کە پێچەوانەی بیر و ڕای پرۆفیسۆر ویلیام جیمزە کە لەم بارەوە تووشـــــی هەڵە بـــووە و بە واتـــای لێکـــدابڕانیان نیـــیە. لە هەردوو ڕوخسارەکەدا یەک"حەقیقەت"بوونی هەیە کە کاریگەریەتی لەسەر ئێمەدا هەیە. ئاگـایی عەقڵـی بە مانـای بـاو، لە بـاری پێویـستییەکەوە کە ئێمە بە شـێوەی پراکتیکـی لە بەراوردی خۆمـان لەگەڵ دەوروپـشتماندا هەمـانە ئەو حەقـــیقەتە بەرە بەرە دەســـت دەکەوێـــت و بەردەوام کـــۆمەڵی خوازەیەکی سەربەخۆ و تاک بۆ کاریگەریەتی بەرامبەر هەڵدەبژێرێت.

حـــاڵەتی عیرفـــانی ئـــێمە پێوەنـــد دەداتەوە بە گـــشت ڕێڕەوەکـــانی حەقـیقەتەوە بە شـێوەیەک کە تەواوی خـوازە جیاوازەکـان لە یەکتـردا دەتوێنەوە و یەکەیەکی وەهـا دروست دەکەن کە لێک جیا ناکرێتەوە و جیاوازی ئاسایی نێوان زەین و شت لەوێدا بوونی نییە.

٣- خاڵێکی سێهەم کە دەبێ سەرنجی پێبدەین ئەمەیە کە بۆ عارفێک کە حـاڵەتی عیرفـانی تێـدا دروسـت بـووە، هەمـان کـاتی پێوەنـدی ڕاسـتەوخۆ لەگەڵ"خـودی دیـکە"دا کە بـێ هاوتـا، سـەرتر و گـشتگیرە. هەڵـسەنگاندنی نـاوەرۆکی حـاڵەتی عیرفـانی ئەوەمـان پیـشان دەدات کە ئەم حـاڵەتە بە

تەواوەتـی عەینـی و دەرەکیـیە و نـابێ ئەوە بە گۆشەنـشینی نـاو تەمـی زەینیەتی ڕەها بزانین. وێدەچێت کە لە من بپرسن: چۆن دەکرێ خودا بەبێ واسیتە و بە ناوی"خودێکی دیکە و سـەربەخۆ"بە ئەزموون بکەین؟ ئایا لە بـنەڕەتەوە وەهـا شـتێک ئیمکـانی هەیە؟ تەنهـا لەبەرئەوەی کە حـاڵەتی عیرفـانی حـاڵەتێکی ئینفیعـالییە دروسـتبوونی"ئەویـدی"بـوونی خـودی ئەزموونکراو ناسەلمێنێت. ئەم پرسیارە لەوێوە دێتە زەینەوە کە ئێمە بێ هیچ ڕامانێکی ڕەخنەگرانە وادەزانین کە ناسینی ئێمە لە جیهانی دەرەوە بە هـۆی ئیدراکی هەسـتەوە لە جۆری دیکەی ناسـینەکانە. ئەگەر وەهـا بـوایە هەرگیز نەماندەتوانی لە حەقیقەتی بوونی خۆمـان دڵنیا بین. بە گشت ئەم باسـانەوە لە وەڵامـی پرسـیارەکەی سـەرەوەدا ئەزمـوونی کـۆمەڵایەتی ڕۆژانەمان دەکەمە قیاس. لە پێوەندییە کۆمەڵایەتیەکانماندا چۆن ئاگاداری زەینـی دیتـران دەبـین؟ دیـارە کە ئـێمە "خـود"ی خۆمـان و سرووشـت بە عەقڵی نـاخ و ئیدراکی هەسـت دەناسـین، بەڵام بـۆ تێگەیشتن لە ئەزمـوونی بەرهەم هاتوو لە زەینی دیتران هـیچ جۆرە هەسـتێکمان لەبەردەسـتدا نییە. تەنهـا هـۆی ئامـادە لە ناسـینی خودئاگـایی کە لە بەرامبەرمـدایە حەرەکە هەستییەکانە هاوشێوەی ئەوانەی کە منیش دەیانکەم. هەر لێرەوەیە کە مـن لە بـوونێکی خودئاگـای دیـکە تێـدەگەم. لە بەدواداچـوونی باسـەکەی پرۆفیـسۆر **رویـس** دا دەتـوانین بڵێـین: ئـێمە مرۆڤەکـانی دەوروپـشتمان بەوهـۆیەوە بە واقیعـی دەزانـین کە وەڵامـی ئیـشارەتەکانمان دەدەن و بەردەوام چەمکە نوقسانەکانی زەینمـان کامـڵ دەکەن. بێگومـان کـردار و وەڵامـدانەوە شـێوازێکە بـۆ تـاقیکردنەوەی بـوونی خودئاگـایەک. قورئـانیش لەسەر ئەم باوەڕەیە:

خـوای گەورە دەفەرموێـت: ((وَقَـالَ رَبُّكُـمُ ادْعُـونِي أَسْـتَجِبْ لَكُـمْ)). واتە: "**خـودای ئێـوە وتـوویەتی بـانگی مـن بـکەن بـا وەڵامتـان بـدەمەوە...**". (سورەتی غافر بەشێک لە ئایەتی ٦٠).

هەروەها دەفەرمویت: ((وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ)). واتە: "**ئەگەر بەندەکانم پرسیاری منیان لە تۆ کرد نزیکم و ئەگەر خاوەنی دوعا بانگم بکات دوعاکەی گیرا دەکەم...**". (سورەتی البقرة بەشێک لە ئایەتی ١٨٦).

دیارە کە چ پێوەری فیزیکی بەکاربەرین و چ نافیزیکی یان پێوەری دروستتری پرۆفیسۆر **رویس**، بە هەر شێوەیەک بێت، ناسینی ئێمە لە زەینی دیتران شتێک دەبێت تەنها لە ئەنجامگیری دەچێت کە لەوە بەرەوپێشتر ناڕوات. بە گشت ئەم باسانەوە وا هەست دەکەین کە ناسین و ئاگایی ئێمە لە زەینی دیتران بە پێی ئەزموونێکی بێ واسیتەیە و هیچ لەوە ڕانامێنین کە ڕەنگە ئەم ناسینە واقیعێک بێت لە ئەزموونی کۆمەڵایەتی ئێمە. لەم بەشە لە باسەکەم نامەوێت بە پێی دەرئەنجامی ناسینمان لە دیکەی زەینەکان هۆهێنانەوەی یوتوپیایی والێبکەم کە لایەنگریی بکات لە واقیعی خودێکی گشتگیر و کۆیی. گشت ئەو بابەتەی دەمەوێ باسی بکەم ئەمەیە: بێ واسیتە بوونی ناسینی ئەزموونی لە حاڵەتی عیرفانییدا بێ هاوتا نییە. جۆرێک هاوشێوەیی لەگەڵ ئەزموونی ئاسایی ئێمەدا هەیە و وێدەچێت کە هەر بگەڕێتەوە سەر ئەم مەقولاتە.

٤- لەبەرئەوەی کە کوالیتەی ئەزموونی عیرفانی ڕاستەوخۆ هەڵدەسەنگێندرێت هەربۆیە ناکرێ بگوازرێتەوە بۆ کەسێکیتر. حاڵەتە عیرفانیەکان زیاتر لە هەست دەچن تا ئەندێشە. ئەو لێکدانەوە یان تەعبیرەی کە عارف یان پێغەمبەرێک لە ناوەرۆکی خودئاگاییە ئایینیەکەی هەیەتی دەکرێ وەک ڕستەگەلێک بگوازرێتەوە بۆ دیتران. بەڵام ناکرێ خودی ناوەرۆکەکە بگوازرێتەوە. لە چەند ئایەتێک لە قورئان کە لێرەدا ئاماژەی پێدەدرێت ئەوەی کە دەگوازرێتەوە دەروونناسییە نەک ناوەرۆکی ئەزموونی دەروونناسیی:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَى (١) مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَى (٢) وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى (٤) عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَى (٥) ذُو مِرَّةٍ فَاسْتَوَى (٦) وَهُوَ بِالْأُفُقِ الْأَعْلَى (٧) ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّى (٨) فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى (٩) فَأَوْحَى إِلَى عَبْدِهِ مَا أَوْحَى (١٠) مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى (١١) أَفَتُمَارُونَهُ عَلَى مَا يَرَى (١٢) وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى (١٣) عِندَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى (١٤) عِندَهَا جَنَّةُ الْمَأْوَى (١٥) إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَى (١٦) مَا زَاغَ الْبَصَرُ وَمَا طَغَى (١٧) لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَى (١٨)). واتە: **"سوێند بێت بەو ئەستێرە کاتێک کە دەکەوێتە خوارەوە. یارمەتیدەرتان {پێغەمبەر} نە سەری لێشێواوە و نە رووی کردە باتڵ و نە لە رووی هەوەسەوە قسە دەکات. ئەمە هیچ نییە بێجگە لە وەحیەک کە بۆ ئەو نازڵ دەبێت فریشتەیەکی بەهێز پەروەردەی کردووە. خاوەنی هێزێکە کە نمایان بووە. ئەو لە ئاسۆیەکی بەرزدا بوو. ئەوکاتە نزیک و نزیکتر بووەوە. بە نزیکایی دوو کەوان یا نزیکتر. وەحی کرد بە بەندەی خودا ئەوەی کە وەحی کراوە. دڵی ئەو، ئەو شتەی کە بینی بە درۆی نەخستەوە. بۆ لەگەڵ پێغەمبەردا سەبارەت بەوشتەی کە دەیبینن دەمەقاڵە دەکەن؟ جارێکیتریش فریشتەکەی بینی لای دوایین داری سدرە کە بەهەشت شوێنیکی نیشتەجێبوونە لە نزیک ئەوەوە. ئەوکاتەی کە داری سدرە داپۆشرابوو بەوەی کە داپۆشراوە. نە چاوی ئەبلەق مایەوە و نە بەلارێدا رۆیشت. ئەو هەندێ لە ئایەتە گەورەکانی خودای بینیوە".** (سورەتی النجم، ئایەتی١-١٨).

ئەگەر ئەزموونی عیرفانی ناگوێزرێتەوە لەبەرئەوەیە کە لە بنەڕەتەوە هەستێکی وایە کە ناگێردرێتەوە و عەقڵی ئیستدلالی ناتوانێت لێی تێبگات. دەبێ بزانین کە: هەستی عیرفانی وەک دیکەی هەستەکان خاوەنی توخمێکی ئیدراکییە و بە باوەڕی من بە هۆی ئەم توخمەوەیە

که به شێوەی ئەندێشەیەکی بە سوود دەردێت. لەڕاستییدا سرووشتی هەست وەهایە کە دەچێتە قالبی ئەندێشەیەکی بەسوودەوە. وادێتە بەرچاو کە ئەم دوو توخمە واتە هەست و ئەندێشە ڕوخسارە ناجێگر و جێگری ئاوێتەیەکی تاکن بە ناوی ئەزموونی باطنی. لە شیکردەنەوەی ئەم بابەتەدا باشترین کار کە دەتوانم ئەنجامی بدەم ئەوەیە کە گوتەی پرۆفیسۆر **هاکینگ** بهێنمەوە کە موتالایەکی ورد و شیاوی سەبارەت بە هەستی سەلماندنی عەقڵی ناوەرۆکیی خودئاگایی ئایینی باس کردووە:

"چ شتێک بێجگە لە هەست دەتوانن بدۆزنەوە کە ئەنجامەکەشی هەمان هەست بێت؟ وەڵام دەدەمەوە، ئاگادار بوون لە شتێک. هەست حاڵەتێکی تێپەڕبوو لە نەفسێکی خودئاگایی کاملە و ئەوەی کە جێگر بوونی ئەم خودەی بۆ دەگەڕێنێتەوە لە ناو سنوورەکانی ئەو "خود"ە دا نییە، بەڵکو لەوپەڕیەتی. هەر بەو جۆرەی کە فیکر لە دەرەوە ئاگایی و زانیاری بەدەست دەهێنێت هەستیش حەرەکەیەکە لە دەرەوە بۆ ناوەوە؛ هیچ هەستێک ئەوەندە بێ توانا نییە لە دیتن کە هیچ ئیماژێکی لە هەستکراوەکەی خۆی نەبێت. هەر بەوجۆرەی کە هەست لەخۆگری ئەندێشەیە، ئەندێشەش بەشێکی جیانەکراوی هەستە کە هەڵگری جۆرێک لە حەقیقەتە. ئەم ئەندێشەیە بەجۆرێکە کە هەست ناچالاک دەکات. هەستی بێلایەن بەهەمان ئەندازە ئەستەمە کە چالاکی بێلایەن. لایەنگری دەبێتە هۆی ئامانج. حاڵەتگەلێکی نادیار لە خودئاگایی هەن کە وادەزانین بە تەواوەتی بێلایەنن، بەڵام شیاوی باسە کە هەستیش لەوەها بارودۆخگەلێکدا دەبێتە تەعلیق و بێ جوڵەیی. بۆ وێنە یەک زەبر کە لێم بدرێت، وێدەچێت من گێژ بکات وەها کە نە بزانم چ بووە و نە بزانم کە چ روویی داوە. لێرەدا ئەزموون نە لە ڕوخساری هەستدا بەڵکو وەک واقیعێکی حاشاهەڵنەگر بۆ ماوەیەکی کورت لە ناو داڵانی خودئاگاییدا

ڕادەوەستێت بۆ ئەوەی ئەندێشە بیناسێتەوە و دەست بکات بە پێوەندی بەرامبەر لەگەڵیدا.

لەم کاتەدایە کە هەست بە ژان دەکرێت. ئەگەر ئەم نموونە قبوول بکەین، هەستیش وەک ئەندێشە بە تەواوەتی خودئاگاییەکی عەینییە کە هەمیشە دەگەڕێتەوە بۆ شتێکی ئەوپەڕی خودی ئێستا و بوونەکەی مانایەکیتری نییە مەگەر بۆ ڕێنموونی خۆی بەرەو بابەتێک کە ئەرکەکەی دەبێ لە لای ئەودا کۆتایی پێ بێت!".

بەم شێوەیە دەبینین کە بە هۆی چییەتی سەرەکی هەستەوە، هەر چەند ئایین بە هەست دەست پێدەکات، بەڵام هەرگیز لە درێژایی مێژووەکەیدا تەنها وەک بابەتێکی هەستاویی نەخراوەتە بەر باس، بەڵکو بەردەوام هەوڵی دۆزینەوەی - ما بعد الطبیعة - ی داوە. بەڕاستی دەنگهەڵبڕینی سۆفیەکان بەرامبەر بە عەقڵ وەک بنەمایەکی ناسین لە مێژووی ئاییندا بابەتێکە کە ناتوانین پاساوێکی بۆ بهێنینەوە. وتەکانی پرۆفیسۆر **هاکینگ** کە لەسەرەوە ئاماژەی پێدرا بەرچاوڕوونیەکی زیاترمان دەداتێ بۆ پاساوهێنانەوە یان سەلماندنی ئەندێشە لە ناو ئاییندا. پێوەندی بنەڕەتی نێوان هەست و ئەندێشە ڕوونادکەرەوەی موجادەلەیەکی کەلامی کەونە سەبارەت بە وەحی زارەکی بووە کە جارێکیان زەحمەتێکی زۆری بۆ بیرمەندانی ئایینی ئیسلام ساز کردووە. هەستی لێڵ، ئەو هەستەی کە باس ناکرێت، خوازیاری ئەوەیە کە چارەنووسەکەی لەگەڵ ئەندێشەیەکدا پێوەند بدات کە ئەوەش بە نۆبەی خۆی خوازیاری ڕزگاربوون لە حیجابی ڕواڵەتە. ئەگەر باس لەوە بکەین کە ئەندێشە و گوتار هەردووکیان لە ناخی هەستەوە هاتوون، قسەیەکی خراپمان نەکردووە. هەرچەند ئیدراکی لۆژیک ئەمە قبوول

ناکـــــات، بەڵام ئەوانە لە تەرتیبێکـــــی زەمانییـــــدا دادەنێـــــت و بە جیاکردەوەنەیان لە یەکتر گرفتە تایبەتەکانی خۆی دەخولقێنێت.

٥- پێوەنـدی نـاوەکی عـارف لەگەڵ جیهانـدا دەبێـتە هـۆی ئەوە کە هەستێکی ناواقیعی بوونی کاتی تەسەلسوولی و تێپەڕ دروست بکات. ئەمەش بە مانـای دابڕانـی کـامڵی ئەو لەم جیهانە نییە. حاڵەتی عیرفـانی بەهۆی تاقانە بوونیەوە لە یەک بواردا لەگەڵ ئەزموونددا بە واتـای گشتی خـۆیەوە، لە پێوەندیـدایە. دروسـتبوونی ئەم بـابەتە لەو حەقـیقەتەوە هـاتووە کە هەرچەنـد تەمەنـی ژیـانی عیرفـانی زوو نـاقس دەبێـت، بەڵام پـاش فەوتـان کـاریگەریەتیەکی قـووڵ لە ئۆتـۆریتەکەی خـۆی بەجـێ دەهێڵێت. عارف و پێغەمبەر هەردووکیان دەگەنە ئاستی باوی ئەزمـوون، بەڵام بەم جیـاوازییەوە کە گەڕانەوەی پێغەمـبەر بـۆ ئەزمـوون هەروەک لە درێـژەی ئەم بـابەتەدا پیـشانی دەدەیـن، دەکـرێ لێـورێژی چەمـکە بێسنووورە مرۆییەکان بێت.

کەواتە پانتـایی ئەزمـوونی عیرفـانی بەمەبەسـتی گەیـشتن بە ناسـین بەهەمـان ڕادە واقیعیـیە کە دیـکەی دەڤەرەکـانی ئەزمـوونی مرۆیـی. هەربۆیە ناکرێ تەنها لەبەرئەوەی کە لە چوارچێوەی درککردنی هەستدا ناگونجێـت، لەبەرچـاو نەگـرین. ئەمەش ئەسـتەم نیـیە کە بکـرێ بە باسـکردنی بـابەتی بـارودۆخی جەسـتەیی و ئەنـدامەکان کە بە ڕەواڵەت هیچ ڕۆڵیکیـان نییە لە نـاو ئەزمـوونی عیرفانییدا، متمـانە مەعنەوییەکەی بخـرێتە ژێـر پرسـیارەوە. تەنـانەت ئەگەر بنـاغەی دەروونـاسـیی نـوێ سـەبارەت بە پێوەنـدی بەرامـبەری جەسـتە و گیـان بە دروسـت بـزانین دیسان بێ متمـانەکردنی حاڵەتی عیرفـانی وەک هـۆیەک بۆ دۆزینەوەی حەقیقەت لۆژیک نییە. لە ڕوانگەی دەروونناسیەوە گشت حاڵەتەکان چ ئەوانەی کە نـاوەرۆکی ئایینیـان هەیە و چ ئەوانەی کە نیانە، دەگەڕێنەوە

بۆ جەستە و هەر لەوێوە نمایان دەبن. شێوازی زانستی زەین بەهەمان ڕادە لە لایەن جەستە و ئەندامەکانەوە شوناسی خۆی وەردەگرێت کە شێوازی ئایینی زەین لەم ڕێگەیەوە دیاری دەکرێت و ئاشکرا دەبێت. داوەریی ئێمە سەبارەت بە داهێنەر بوون لەگەڵ ئەو شتەی کە دەروونناسانی ئێمە بە سەرنجدان بە بارودۆخی جەستەیی باسی دەکەن ناگاتە ئەنجامێکی دروست و تەنانەت کەمترین کاریگەریەتیەکی لەسەر دانانێت.

وێدەچێت کە جۆرێکی تایبەت لە خودی مرۆڤ مەرجی پێویست بێت بۆ جۆرێکی تایبەت لە هێزی درککردن، بەڵام مەرجی پێشووتر ناکرێ بە گشت تایبەتمەندی ئەو بابەتەی کە درککراوە بزانین. ڕاستیەکەی لەوەدایە کە هۆی ئۆرگانێکی حاڵەتە زەینیەکانمان هیچ پێوەندیەکیان بەو پێوەرانەوە نەبووە کە بە هۆی ئەوانەوە حوکم لەسەر ئەوە بدەین کە بایەخەکەیان بەرزە یان بێ بایەخن. پرۆفیسۆر **ویلیام جیمز** دەڵێت: هەندێک لەو قسانەی کە سەبارەت بە ڕوانینی ناخ و پەیام بە مانای حاڵەتی عیرفانی وتراوە، بە ڕاستی قسەگەلێکی زۆر پوچ و بەتاڵن. هەندێ لەو شتانەی کە سەبارەت بە نەئشە یان جەزبەی ترسێنەر وتراوە بۆ ئەخلاق و ڕەفتار ئەوەندە بێ سوودە کە لە بایەخەکەی کەم کردەوە نەک ئەوەی کە لایەنی ئیلاهی و ئاسمانی پێبدات. لە مێژووی عیرفانی مەسیحی دا ئەم بابەتە بەردەوام گرفتێکی گەورە بووە کە چارەسەری دژواری هەبوو. ئەویش ئەمە بووە کە چۆن دەکرێ ئەو پەیام و ئەزموونانەی کە بە ڕاستی موعجیزەی ئیلاهیین لەو پەیام و ئەزموونانەی کە شەیتان و بەدخوازە بەدیلەکانی دەیخوڵقێنێت جودا بکرێتەوە و بەم شێوەیە تاکی ئیماندار هەرچی زیاتر لە دۆزەخ دوور بخاتەوە. جیاکردنەوەی ئەوانە لەیەکتر پێویستی بە زیرەکی و ئەزموونی

باشترین ریبەرەکان و جیایی کۆمەڵگە بووە. لە ئاکامدا لێکدانەوەی ئەوانە سپاردڕایە مەحەکی ئەزموونی ئێمە. بەم شێوە: ئەو بابەتانە بە میوەکانیان دەناسرێنەوە نەک بە ڕیشەکانیانەوە.

گرفتی عیرفانی مەسیحی کە پرۆفیسۆر **جیمز** ئیشارەتی پێکردووە لە ڕاستییدا کێشەی گشت ئەم جۆرە مەکتەبانەیە. شەیتان بە نیەتی خراپ ئەزموونگەلی درۆیین و زڕاو دروست دەکات کە دەخزێتە ناو سنوورەکانی حاڵەتی عیرفانییەوە. هەروەک چۆن لە قورئاندا دەخوێنینەوە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّا إِذَا تَمَنَّى أَلْقَى الشَّيْطَانُ فِي أُمْنِيَّتِهِ فَيَنسَخُ اللَّهُ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ ثُمَّ يُحْكِمُ اللَّهُ آيَاتِهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ)). واتە: "**بەر لە تۆ پێغەمبەر یان ڕەسوولێکمان نەناردووە. مەگەر ئەوکاتەی کە لە وەختێکدا کە قەرائەتی کرد شەیتان لە قەرائەتی ئەودا ئیلقای کرد. خودا ئەو شتەی کە شەیتان ئیلقای کرد باتڵ دەکاتەوە، پاشان ئایەتەکانی خۆی قاییم دەکات. خودا زانا و سەرترە**". (سورەتی الحج، ئایەتی ٥٢).

قوتابی و پەیڕەوەکانی **فرۆید**[1] بە هۆی لابردنی فیکرە شەیتانیەکان لەو شتەی کە ئیلاهییە، خزمەتێکی زۆریان بە ئایین کرد، بەڵام ناتوانم ئەمە باس نەکەم کە لە ڕوانگەی منەوە هیچ هۆیەک پشتیوانی تیۆری سەرەکی ئەم نوێترین شێوەی دەروونناسییە نییە. ئەگەر خوازە سەرگەردانەکانی ئێمە خۆیان لە ناو خەونەکانماندا دەنوێنن یان لە

---

[1]– فرۆید، دەروونناسی نەمسا کە لە ١٩٣٩ دا کۆچی دوایی کرد. ئەو سەرچاوەی ئەندێشە و ڕەفتاری مرۆڤ لە ناو نەست و ناخودئاگای کەسەکاندا دەزانێت. ئەو زەینی ئاگا بە زەینیکی کامڵ نازانێت و دەڵێ مرۆڤ خاوەنی زەینی ناخودئاگاشە کە هەنباری یاد و بیرەوەرییەکانیەتی کە بە جۆرێکیش هەنباری تێکشکان و شکەستەکانی مرۆڤیشە.

کاتگەلیتردا ئاشکرا دەبن کە بە وردی خۆمان نابین. هیچ هۆیەکی نییە کە ئەو خوازانە لە شوێنێک وەک هەمباری کەل و پەلی بەکارنەهاتوو لە پشتەوەی"خود"ی موتەعارفدا زیندانی کرابێتن. هێرش هێنانی کات و ناکاتی ئەم خوازە سەرکووتکراوانە بۆ هەرێمی"خود"ی باومان. ئەمە زیاتر پیشاندەری جیابوونەوەی کاتی سیستمی ئاسایی کاریگەریەتی دانەر و کاریگەریی وەرگرتنی خوازەکانمانە تاکو بوونی بەردەوامیان لە زاویەی تاریکی زەیندا.

تیۆری **فرۆید** بە کورتی بریتییە لەمە کە: مرۆڤ لە پرۆسەی سازگاربوون لەگەڵ دەوروپشتدا دێتە بەرهەم و جۆرە خوازەیەک. کاریگەریەتی وەرگرتن و وەڵامدانەوەی زەینی ئێمە بەم خوازانە بەرەبەرە دەچێتە ناو سیستمێکی سەقامگرتوو کە بەردەوام مەیلی بۆ پێچهەڵپێچی هەیە و زەین ئەم کردەوە بە وەرگرتنی هەندێ لە خوازەکان و لابردنی هەندێکیتر لە خوازەکانیتر ئەنجام دەدات کە لەگەڵ سیستمی سەقامگرتووی کاریگەریەتی وەرگرتن و کاریگەریەتی داناندا هاوشێوەیی نییە. خوازە لابراوەکان دەکەونە جێگایەکەوە کە"دەڤەری ناخودئاگا"ی زەینی ناوە. لەوێدا چاوەڕوان دەبن تاکو دەرفەتێکی دڵخواز بۆ پیشاندانی خۆیان بدۆزنەوە و تۆڵە بستێنن لەو"خود"ەی کە سەنتەری شتەکانە. وێدەچێت هەموو نەخشەکانی ئێمە بفەوتێنن، ئەندێشەکانمان مشەوەش بکەن، خەون و ئاواتەکانی ئێمە پێک بهێنن یان ئەوەی کە وەها بەرەو دواوەمان بەرن و رەفتارێکمان تێدا دروست بکەن کە پرۆسەی کامڵبوونی مرۆڤ، مەودایەکی زۆری لەگەڵدا گرتبێت.

وتراوە کە ئایین تەنها ئەفسانەیەکە و بەس، کە هەر ئەم خوازە پەرتکراوانەی مرۆڤ ئەوەیان بە هیوای ئەمە دروست کردووە کە ببێتە وڵاتێکی خەونەکان بۆ ئەوەی بە تەواوەتی لەوێدا بێن و بڕۆن و بە

ئازادی و بێ بەربەست حەرەکە بکەن. بەپێی ئەم ڕوانگەیە، بیروباوەڕە ئایینیەکان هیچ نین بێجگە لە هەندێ تیۆری سەرەتایی کە سەبارەت بە"سرووشت"وتراوە و مرۆڤ هەوڵی داوە بەم ئامێرەوە حەقیقەت لە ناحەزایەتییە سەرەکیەکەی خۆی رزگار بکات. ئەو بکات بە شتێک کە لە موورادی دڵ نزیکتر بێت نەک ئەوەی کە لە ڕاستیەکانی ژیان بچێت. من نکولی لەوە ناکەم کە ئایین و شێوازگەلێکی هونەری هەن کە دەبنە هۆی جۆرێک هەڵاتنی ترسنۆکانە لە ڕاستییەکانی ژیان، بەڵام بە ڕای من ئەم وتەیە سەبارەت بە هەموو ئایینەکان دروست نییە.

گومانێکی تێدا نییە کە ئەحکام و باوەڕە ئایینیەکان مانایەکی میتافیزیکییان هەیە و تێگەیشتن لەم ئەنجامانە بەرهەمی ئەزموونی سرووشتی نین. ئایین فیزیا یان کیمیا نییە کە مەبەستی پێناسەکردنی سرووشت بێت بەپێی یاسای علییەت بەڵکو بەشێوەیەک لێکی دەداتەوە کە بە تەواوەتی لەگەڵ ئەزموونی مرۆییدا جیاوازە. ئەزموونی ئایینی دەستکەوتەکانی ناگۆڕدرێت بۆ دیکەی زانستەکان. لە ڕاستییدا با ئەم خاڵە باس بکەیین کە ئایین لە ژیانی خۆیدا زۆر زووتر لە زانست بەوەی زانی کە ئەزموونی عەینی تا چ ڕادە پێویستە. جیاوازی نێوان ئەم دوانە لە رووی ئەوەوە نییە کە یەکێکیان لەسەر ئەزموونی عەینی راوەستاوە و ئەویدی وانییە. بەڵکو هەردووکیان ئەزموونی عەینی وەک خاڵی دەستپێکی حەرەکە هەڵدەبژێرن. لەیەکتر جیاکردنەوە یان خراپ تێگەیشتنێکە کە وادەزانن هەردووکیان دەرئەنجامە هاوشێوەکان لێک دەدەنەوە. لە حاڵێکدا کە فەرامۆش دەکەین ئامانجی ئایین گەیشتنە بە واتای ڕاستەقینەی جۆرێکی تایبەت لە ئەزموونی مرۆیی. هەروەها ناکرێ بە پێوەنددانەوەی هەموو شتێک بە کاریگەریەتی خوازەی جنسی، مانایەکی لەخۆڕایی بدرێتە ناوەرۆکی ئایین. ئەو دوو شکڵەی خودئاگایی

واتە جنسی و ئایینی لە باری تایبەتمەندیانەوە، ئامانج یان جۆری رەفتارێک کە دەبنە هۆی، زۆرجار دژ بەیەکن یان لانی کەم بە تەواوەتی لەگەڵ یەکتردا جیاوازن. حەقیقەت ئەوەیە کە لە حاڵەتی شەیدایی و هەژاندنی ئایینیدا دەگەینە ڕاستییەک کە لە هەندێ لایەنەوە لە سنوورە تەسکەکانی کەسایەتی ئێمە بەدەرە.

لە ڕوانگەی دەروونناسیێکەوە کردەوە ئایینیەکان بە هۆی هێزێکەوە کە کە بۆ گەیشتن بە قووڵایی بوونمان هەیەتی، بە ناچار کاری شعوری ناخ بەرێوە دەبەن. لە هەر ناسینێکدا توخمێکی حاڵەتی هەژاندن بوونی هەیە. بابەتی ناسین لە عەینیەت و لە دەرکەوتن و ئاوابوونی ئەو حاڵەتە پەسیوبوونەوە بەدەست دێت یان لەناو دەچێت. بێگومان ئەو شتەی کە تان و پۆی کەسایەتی ئێمە دەلەرزێنێت لە هەموو ئەوانەی دیکە واقیعیترە. هەروەک پرۆفیسۆر **هاکینگ** ئەم بابەتە باس دەکات: ئەگەر لە دەرفەتێکی زەماندا یان لە ماوەی رۆژێکی ماندووکەردا حاڵەتێک لە بیرکردنەوەی قووڵ لە هەر تاک یان لە هەر کەسێکی پیرۆزدا دروست بێت کە ڕێگەی ژیانی ئەو و ئێمە بەرەو شوێنێکی نوێ بەرێت، تەنها بە هۆی ئەوەیە کە ئەو بیرکردنەوەی قووڵە، لەگەڵ خودی ئاگا و هەم ناخودئاگا یەک دەگرێت کە بە باوەڕی ئێمە گشت بنەمای بوون و کەسایەتی ئێمە لە پێوەندی لەگەڵ هەرمانیەتییدا ساز دەکات.

کەواتە ئەو شێوازانە کە تەنها دەروونناسانەن ناتوانن هێز یان ئینفیعالی ئایینی وەک شێوازێک لە ناسین لێک بدەنەوە و بیناسێنن. ئەم شێوازە سەبارەت بە دەروووناسەکانی ئەم دواییانەدا تووشی شکست دەبێت هەروەک چۆن بۆ **جان لاک** و **دیوید هیوم**(١) وای لێهات.

---

1– هیوم ناسین تەنها لە ڕێگەی ئەزموونیی هەستەوە بە دروست دەزانێت. بە باوەڕی ئەو مرۆڤ ناتوانێت کە متمانە بەبوونی خۆی یان جیهانی دەرەوە بکات

بێگومـــان ئەو بـــابەتەی کە ئاراســـتەمان کـــرد پرســـیارێکی گرنگـــی لە زەینماندا سـاز کـردووە. ئەو ئەزمـوونە ئـایینیەی کە لایەنگـرییم لێکـرد لە بـــنەڕەتەوە حـــاڵەتێکی هەســـتاوییە کە لایەنـــی درککردنـــی تێـــدایە و نـاوەرۆکەکەی بـێجگە لەوەی وەک حـوکم بێـت، نـاکرێ بگـوازرێتەوە بـۆ کەسانیتر. کەواتە حوکمێک کە بانگەشـەی لێکدانەوەی دەڤەرێکی تـایبەت لە ئەزموونی مرۆیی بێت و لە هەمانکاتدا بۆم لەمس نەکرێت و دەستی پێ نەگات و تەنها بۆ تەئیدکردن و قبووڵ لە بەرامبەرمدا دانرابێت، ئەمە مـافی خۆمە کە بپرسـم چ شـتێکە کە گەرەنتی دروسـتییەکەی دەدات؟ ئایـا ئێمە پێوەرێکمان لەبەردەستدایە کە بایەخ و متمـانەکەی دەربخەیـن؟ ئەگەر تەنیا بوار بۆ وەرگرتنی حوکمی وەهـا ئەزمـوونی تـاکی بێت لەو حـاڵەتەدا ئـایین تەنها لە بازنەی کەسانێکی کەمدا دەبوو. بەخـتەوەرانە ئێمە پێوەرگەلێکمـان هەیە کە جیاوازیـــان نیـــیە لەگەڵ دیـــکەی ئەو پێـــوەرانەی کە بـــۆ دیـــکەی جۆرەکانی مەعریفە بەکاردەبرێن. من ئەمـانە بە پێوەری عەقڵـی و پێوەری پراکتیکی ناو دەبەم. مەبەستم لە پێوەری عەقڵی لێکدانەوەیەکی ڕەخنەگرانە لە ئەزموونی مرۆییە بێ ئەوەی داوەرییەک لەوە پێش کرابێت. ئەم کـارە بە مەبەســـتی ئەوە ئەنجـــام دەدرێـــت کە ئایـــا تێگەیـــشتنمان و لێکـــدانەوەمان دەتوانێت لە ئاکامدا ئێمە بگەیەنێتە هەمان ڕاستی و هەمان تایبەتمەندی کە بە ئەزمـــوونی ئـــایینیەوە دەردەکەوێـــت. داوەری و حـــوکمکردنی پێـــوەری زانــستی بەپێــی بەرهەمــێکە کە ئەزمــوون دروســتی کــردووە. شــێوازی یەکەمین بۆ فەیلسووفەکان بەکاردەبرێت و ئەویدی بۆ پێغەمبەرەکان.

لە لێدوانی دووهەمدا سـەبارەت بە پێوەری عەقڵی باسـەکەم ئاراسـتە دەکەم.

---

لەبەرئەوەی کە ئەمانە تەنها ریزێک کاریگەریەتی و وێنەگەلی ئێمەن کە پەیتا پەیتا لە ناو شعووری ئێمەدا دەمێننەوە. ئەو پەیڕەوی لاک و بێرکلی بوو.

## پێوەری فەلسەفی کەشفکردنەکانی ئەزموونی ئایینی

فەلسەفەی قوتابخانەیی واتە scholastic سێ بورهانی بۆ سەلماندنی بوونی خودا ئاراستە کردووە. ئەم بورهانانە بە ژێر کۆی جیهان ناسیی cosmological، غـــایەت teleogical ناســـیی و بوونناســـیی onotological دەناســــرێت، کە حەرەکەی ڕاســــتەقینەی ئەندێــــشە دەگێڕێتەوە بۆ دۆزینەوەی حەقیقەتی ڕەها. ئەگەر بە چاوی بورهانە لۆژیکەکانەوە لێیان بڕوانین، ترسی ئەوە هەیە کە بخرێنە بەر ڕەخنەی توند و هەروەها ئەو لێکدانەوەی کە بەم پێیە لە ئەزموونی دەکەن لە ئاکامدا ڕووکەشی و ڕەواڵەتی بێت.

بورهانی جیهانناسیی، جیهان بە بەرهۆیەکی سنووردار دەزانێت کە لە نێوان ریزێک بابەتی پەیوەست و چەسپاو بە یەکترەوە تێپەڕ دەبێت کە لەگەڵ یەکتردا پێوەندیەکی هۆکار و بەرهۆیان هەیە. لە هۆی یەکەمدا کە بێ هۆیە لەبەرئەوەی کە تەسەلسوولێکی بێ سنوور و نادیاری هەیە ڕادەوەستێت. دیارە کە هۆکاری سنووردار ئاکامی هۆیەکی سنووردارە یان ئەوپەڕەکەی ئەنجامی هۆگەلێکی بێ سنوورە لەم هۆیانە. کۆتایی هاتن بەم کۆمەڵە لە خاڵێکی دیاریکراودا و بردنەسەرەوەی بەشێک لەوە بـــۆ پلەیەکـــی بەرزتـــر هـــۆی یەکەمـــی بـــێ هـــۆ، واتە نکـــولیکردنی یاسای"علیت"کە گشت ئەم بورهانە لەوێوە سەرچاوەی گرتووە. بەرهۆ بۆ هۆکانی خۆی سنوور دادەنێت و ئەوە تا ئاستی دیاریکراو دەهێنێتە

خوارەوە. لە لایەکیترەوە ناکرێ ئەو هۆیەی بەم بورهانە پێک دێت وەک بوونەوەرێکی زەروور سەیر بکرێت.

هــۆی ئاشــکرای ئەم بــابەتە ئەوەیە کە لە پێوەنــدی نێــوان هــۆ و بەرهـۆدا، دوو بەشـی ئەم پێوەنـدییە بەناچـار لەگەڵ یەکتـردا یەکسانن. هەروەهــا پێویــستیی بــوون لەگەڵ پێویــستیی چەمکــی هۆیەتییــدا واتە زۆرترین شتێک کە ئەم بورهانە دەتوانێت بیسەلمێنێت، وەک یەکتر نین. هەوڵـی ئەم بورهـانە لە ڕاستییدا لەسـەر ئەوەیە کە بە نکولی کـردن لە ناموتەنـاهی ڕاستەقینـە نکولی لـە موتـەنـاهی ناکات و بێ ئـەوەی کـە لـە گرنگایەتییـەکـەی کـەم بکاتـەوە، قبـووڵی سنووورداریی ئـەوەی کـردووە و بوونەکەی دەسەلمێنێت و ڕایدەگەیەنێت. بە وتەیـەکی لۆژیـک، جووڵـە لـە موتـەناهییـەوە بـۆ ناموتـەنـاهی، بـەو شـێوەیـە کـە بورهـانی جیهانناسـیی باسی لێدەکات بە تـەواوەتی ناراست و باتڵـە. بورهـانی ئـەنجامناسییش لەوە باشتر نییە. لەم بورهانەدا بەرهۆ بۆیە دەخرێتە بەر هەڵسەنگاندنی ورد کە تایبەتمەندی هۆیـەکانی بدۆزرێتـەوە. نیشانەکانی بەرچاوروونی مەبەستدار بوون و هاوئاهەنگی لە نـاو سرووشـتدا، بـە هۆیـەک دەزانێت بـۆ بـوونی خودئاگـایی کـە خـاوەنـی هێزێکـی عـەقڵانـی و دەسـەڵاتێکـی بێسنووورە. لـەهــەمانکاتـدا بورهــانی ئــەنجامناسـیی داریــژەرێکمــان پــێ دەناسێنێت کە کارامـە، بـەڵام ڕووکـەشیـە و کـارەکـەی لـەگـەڵ کـەرەستـە ڕەق و مردووەکاندایە کە بوونەکەیان پێش وەقت بووە. ئـەو توخمانـەی کە بەپێی چییەتی خۆیان توانـایی یـەکگرتن و ئاوێتـەبوونی ڕێکیـان نییـە. ئـەم بورهانـە تـەنهـا وەسـتاکارێکمان پیـشان دەدات نـەک خولقێنـەرێـک. تەنانەت ئـەگـەر ئـەم تیـۆرەی لـەبـارەوە بزانین کە دەتوانێت خولقێنـەری ئــەو کــەرەســتانەش بێــت کــە ئیـشیان لــەســەر دەکــات، ئــەمــەش هــەر متمانەیەکی بۆ دروست ناکات. لـەبـەرئـەوەی کـە سـەرەتـا بـە خولقاندنی

کەرەستەی ڕەق و بێ دەرەتان و پاشان بە تێکشکاندنیان بەو شێوازگەلەی کە لەگەڵ سرووشتی ئەوانەدا نامۆیە، هەندێ کێشە بۆ خۆی ساز دەکات. ئەو وەستاکارەی کە لە پێوەندی لەگەڵ کەرەستەکانی خۆیدا بە ڕووکەشی ناوی لێدەبرێت بەردەوام لە سنووری ئەم کەرەستانەدا دەمێنێتەوە. کەواتە وەستاکارێکە بە دەسەڵاتێکی سنووردار کە ئیمکانیاتی کەم ناچاری دەکات بەسەر کێشەکانی خۆیدا بە شێوازی وەستاکارە مرۆییەکان زاڵ ببێت. بورهانی جیهاننناسیی کە لە شێوازە جیاوازەکاندا لە لایەن بیرمەندانەوە دەخرێتە بەر باس زیاتر دەکەوێتە بەر سەرنجی پەیڕەوەکانی بیری تیۆری. شێوازی دیکارتی ئەم بورهانە بەم شێوەیە:

"وتنی ئەمەی کە هەڵگر بەشێک بێت لە زات یان چەمکی بابەت بێت وەک ئەوەیە کە بوترێت هەڵگری حەقیقەتی ئەم بابەتەیە و دەکرێ بوونی ئەوە لەناو بابەتدا بسەلمێنین، بەڵام بوونی واجب لە زات و چەمکی خودادا هەیە. کەواتە دەکرێ ئەمە بسەلمێنین کە بوونی واجب لە خودادایە یان ئەوەیەی کە خودا بوونی هەیە".

**دیکارت**[1] ئەم بورهانەی لەگەڵ بورهانێکی دیکەدا تێکەڵ کرد و بەم شێوەیە کامڵی دەکات:

"ئێمە ئیماژێکمان لە بوونەوەری کامڵ لە زەینی خۆماندا هەیە. سەرچاوەی ئەم ئیماژە چییە؟ ناکرێ لە سرووشتەوە بێت لەبەرئەوەی کە سرووشت شتێک ناخاتە روو بێجگە لەوەی کە تووشی گۆڕانکاری بێت. کەواتە ناکرێ ئیماژێک لە بوونەوەری کامڵ لە زەیندا بخوڵقێنێت. هەربۆیە بە پێی ئەو ڕوخسارەی کە لە زەینماندا هەیە دەبێ لێکچوویەکی بیندراو بوونی هەبێت کە هۆی وێناکردنی بوونەوەرێکی

---

1 دێکارت

کامڵ لە زەینی ئێمەدا بێت. ئەم حوجەتە تا ڕادەیەک لەسەر سرووشتی بورهانی جیهانناسیی دامەزراوە کە پێشتر چاکە و خراپەکەم باس کردووە. جۆری ئەم بورهانە هەرچی بێت، دیارە کە وێناکردنی بوون هۆیەک نییە بۆ بوونی عەینی ئەو بابەتە. **کانت** بۆ رەخنەگرتن لەم بورهانە دەڵێت: ئەگەر لە زەینی خۆمدا سێسەد دۆلار وێنا بکەم بە واتای ئەوە نییە کە ئەوەندە پارەش لە گیرفانمدایە. ئەوەی ئەم بورهانە دەیسەلمێنێت ئەوەیە کە وێناکردنی بوونەوەرێکی کامڵ بریتییە لە وێناکردنی بوون و ژیانەکەشی. لە نێوان وێناکردنی بوونەوەری کامڵ لە ناو زەینی مندا و واقیعی بیندراوەکەی ئەو بوونەوەرەدا، قەڵشتێک هەیە کە توندترین چالاکی ئەندێشە ناتوانێت پردێک بەسەر ئەو نێوانەدا ساز بکات".

ئەم بورهانە بەو شێوەیە کە باسکرا جۆرێک ڕوانگەی سازکراو یان بانگەشەیە کە لەجیاتی بابەت دادەنیشێت، لەبەرئەوەی کە هەمان خاڵی جێی پرسیار واتە تێپەڕبوون لە عەقڵەوە بۆ راستەقینە بە بابەتی سەلماو دەزانێت. هیوادارم ئەمەم بۆتان روونکردبێتەوە کە بورهانەکانی بوونناسیی و ئەنجامناسیی بهوشێوەیە کە باسیان دەکرێت ئێمە ناگەیەنێتە هیچ شوێنێک. هۆی شکستیان ئەوەیە کە ئەم دوو بورهانە ئەندێشە وەک ئامێرێک دەبینن کە لە دەرەوە کاریگەریەتی دادەنێتە سەر شتەکان. وەها بیرۆکەیەک لە لایەکەوە ئەندێشە وەک وەستاکارێکی ڕەها دەبینێت و لە لایەکیترەوە نێوانێکی بێ پەیوەندی لە مابەینی بیر و واقیعدا دروست دەکات. دەکرێ ئەندێشە وەک بنەمایەک کە کەرەستە پێویستەکانی خۆی لەدەرەوە وەردەگرێت و رێکیان دەخات قبووڵ نەکەین، بەڵام دەکرێ وەک هێزێک لەبەرچاوی بگرین کە شکڵ دەدات بە کەرەستە پێویستەکانی خۆی. وەها ڕوانینێک بۆ ئەندێشە یان ئایدیا دژ

به چییەتی سەرەکی شتەکان نییە، بەڵکو بواری سەرەکی ئەوانەیە و جەوهەری بوونیان پێکدەهێنێت. هەر لە سەرەتای ژیانیانەوە دەخزێتە ناویانەوەو بەرەو مەبەستی خۆی ڕێنموونیان دەکات. بارودۆخی ئێستای ئێمە پێویستی بە لەبەرچاوگرتنی دوولایەنەبوونی ئەندێشە و بوونە. هەر بزووتنەوەیەک لە زانستی مرۆییدا ئەو بابەتەی کە دەکرێ بە لێکۆڵینەوەی ورد بگاتە یەکگرتوویی، دابەش دەکاتە سەر دوو لق: یەکێکیان "خود" و ئەویدی "غەیر". خود ناسێنەرە و غەیر کە لەدەرەوەی خود ڕاوەستاوە. بەم شێوەیە ناچارین کە بەو شتەی کە لە بەرامبەر خود دانراوە وەک بابەتێک بڕوانین کە لە بنەڕەتەوە بوونی هەیە و بە نیسبەت ئەو خودەوە کە کردەوەی ناسین بۆ ئەوە ئەنجام دەدرێت، دەرەکی و سەربەخۆیە. مانای سەرەکی بورهانەکانی بوونناسیی و ئەنجامناسیی کاتێک ڕوون دەبێتەوە کە بتوانین ئەوە بسەلمێنین کە بارودۆخی مرۆڤ نیهایی نییە و ئەندێشە و بوون هەر یەکێکن. ئەم بابەتە کاتێک مسۆگەرە کە بە وردی ئەزموون بخەینە بەر لێکدانەوە و ڕاڤە و هەروەها ئەو ڕێگەچارەیەی کە قورئان باسی کردووە پەیڕەو بکەین. قورئان ئەزموون چ ناوەکی بێت چ دەرەکی، وەک نمادێک لە واقیع ئاوەها باس دەکات: "الاول والآخر والظاهر والباطن". ئەمەیە ئەو بابەتەی کە لەم لێدوانەدا باسی لێدەکەم.

ئەزموون بەو شێوەیە کە لەمکاتەدا خۆی دەرخستووە، سێ بواری سەرەکی دەخاتە ڕوو: بواری مادە، بواری ژیان و بواری ڕەوان و خودئاگایی، کە بوون بە بابەتەکانی زانستی فیزیا، زیندەوەرناسیی و دەروونناسیی. لێرەدا ئیزنم بدەن کە ئاوڕ لە بواری مادە بدەمەوە. بۆ ئەوەی کە بە تەواوەتی لە بارودۆخی فیزیای نوێ تێبگەین پێویستە کە بە ڕوونی لەوەش تێبگەین کە مەبەست لە مادە چییە. فیزیا وەک

زانستێکی ئەزموونیی لەگەڵ واقیعەکانی ئەزموون- واتە لەگەڵ هەمان ئەزموونی هەست- ڕووبەڕووە. فیزیاناس کارەکەی لەگەڵ دیاردە هەستپێکراوەکاندا دەست پێدەکات و کۆتایی پێدێت و ئەستەمە کە بە ڕێگە و شێوەیەکیتر بتوانێت تیۆریەکانی خۆی بسەلمێنێت. ئیمکانی هەیە کە بوونی شتێکی نەبینراو وەک ئەتۆم بە بابەتێکی بنبڕ بزانێت لەبەرئەوەی کە ڕێگەیەکیتری نییە بۆ گێڕانەوەی ئەزموونی هەستپێکراوی خۆی. بەم شێوەیە کە فیزیا جیهانی مادە دەخاتە بەر موتالا واتە جیهانێک کە بە هەستپێکراوەکانەوە دەناسرێت. پرۆسە زەینیەکان کە پێویستیی ئەم موتالایەن، بەلام لە ئەزموونی ئاییني و جوانیناسییدا هاوشێوەن، هەرچەند بەشێک لە کۆی گشتی ئەزموون پێک دەهێنن، بەلام لە دەڤەری ڕوانینی فیزیا بەدەرن. هۆی دیاری ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەمەی کە فیزیا تەنها لە جیهانی مادیدا واتە جیهانێک کە لەوێدا شتەکان دەبینین، خەریکی موتالایە. ئەگەر لە ئێوە بپرسین کە ئەو شتانەی وا لە جیهانی مادییدا دەیبینن چ شتانێکە؟ دیارە کە شتە ناسراوەکانی دەوروپشتی ئێوەن وەک: زەوی، ئاسمان، کێو، کورسی، مێز و شتی دیکە کە بیرتان دەکەوێتەوە. ئەگەر زیاتر پرسیار بکەین: بە وردی بۆمان باس بکەن کە چ تێگەیشتنێکتان هەیە لەم شتانە؟ زەینی ئێوە بەرەو سیفەتەکانی ئەم شتانە دەڕوات. دیارە کە بە وەلامدانەوە بەم پرسیارانە، لە ڕاستییدا ئەو هۆیانەتان لێکداوەتەوە کە هەستەکانی ئێوە خستوویانەتە ڕوو. ئەم لێکدانەوە دەرخەری جیاوازی نێوان شتەکان و سیفەتەکانیانە. ئەم بابەتە لە واقیعدا دەگاتە تیوریەک سەبارەت بە مادە، دەستکەوتە هەستەکان و پێوەندیان لەگەڵ زەینی ئەو کەسەی کە ئیدراکی دەکات و هۆی ئەنجامی ئەوانە. کورتکراوەی ئەم تیۆریە بەم شێوەیە باس دەکەم:

بابەتە هەستپێکراوەکان وەک رەنگ، دەنگ و شتی وا، بریتیین لە حاڵەتگەلێک لە زەینی درککار و لەم بارەوە بەدەر لە چییەتی شتەکانن و وەک بابەتی بینراو دەکەونە بەر سەرنج. بەهیچ شێوە و چەمکێک ناتوانن ببن بە بەشێک لە کوالیتەی شتەکان. کاتێک دەڵێین: ئاسمان شینە، تەنها بەم مانایە کە ئاسمان هەست بە ڕەنگی شین لە ناو زەینی مندا دروست دەکات نەک ئەوەی کە ڕەنگی شین کوالیتە یان سیفەتێک بێت کە لەناو ئاسماندا دەردەکەوێت. لەبەرئەوەی کە ئەمانە حاڵەتگەلێکی زەینیین هەربۆیە دەچنە ریزی"تاثرات"وە. واتە بەرهۆ یان کاریگەریەتی گەلێکن کە لە ئێمەدا پەیدا بوون. هۆی دروستبوونی ئەمانە مادە یان کەلوپەلی مادیین کە لە رێگەی ئەندامە هەستکارەکانەوە لەسەر ئەعساب و مێشکی ئێمەدا کاریگەریەتی دادەنێن. ئەم هۆیە مادییە بە پێکدان و پێوەندیەوە کار دەکات. کەواتە دەبێ خاوەنی تایبەتمەندی گەلێک بێت وەک: شێواز، قەبارە، پتەو بوون و راوەستاویی.

**بێرکلی**[1] یەکەمین فەیلەسووف بوو کە تیۆری سەبارەت بە مادە، وەک هۆی نەناسراوی هەستەکانی ئێمەی بە باتڵ زانی. لە سەردەمی ئێمەدا پرۆفیسۆر *وایتهد* – بیرکار و زانیاری ناودار– بە شێوەیەکی بنبڕ ئەوەی سەلماند کە تیوری کۆنی مادە بە تەواوەتی لەرزۆکە. دیارە کە بە هۆی ئەم تیورەوە رەنگ و دەنگ و دیکەی بابەتەکان تەنها حاڵەتگەلی زەینیین و هیچکام لە بەشەکانی سرووشت لەوانەوە ساز

[1]– بێرکلی ١٦٨٥–١٧٥٣، باوەری بەوە هەبوو کە گشت کوالیتەکان چ سەرەتایی و چ ثانوی دەگەڕێنەوە بۆ خودی زەین. کەواتە ئەوەی کە هەیە هەمان شتە کە زەین بە هەستەکانی خۆیەوە درکی پێ دەکات و ئیتر هیچ بوونی نییە مەگەر ئەوەی کە لە دەرەوەی ئەم درکە دا بێت. ئەمە هەمان ڕوانگە بە ناوبانگەکەیەتی کە دەڵێت بوون و هەبوون بە واتای ئەوەیە کە درک بکرێت

نەبووە. ئەوەی کە دەچێتە ناو چاو و گوێمانەوە، ڕەنگ و دەنگ نییە بەڵکو شەپۆلە نەبیندراوەکانی غازی"ئێتێر"و هەوای نەبیستراوە. سرووشت بەو شێوەیە نییە کە ئێمە دەیناسین. شتە بینراوەکانی ئێمە لە داوی هەڵەی چاودان. ناکرێ وەک ئاشکراکارەکانی نهێنی و واقعی سروشتی پشتیان پێ ببەستین کە بەپێی ئەم تیورە دابەش دەبێتە سەر دوو بەشەوە: یەکێکیان کاریگەریەتی زەینی و ئەویدی جەوهەری زاتی نادیار و درک پێنەکراو کە ئەم کاریگەریەتیانە لەوێوە دێن. ئەگەر فیزیا، زانستی پێوەندی لۆژیک و دروست و هەروەها مەعریفەی ڕەسەن بێت بۆ درککردنی شتەکان، تیوری سوننەتی سەبارەت بە مادە بەم هۆیە و بە ئاشکرا ڕەفز دەکرێتەوە:

ئاستی شایەتیدانی هەستەکانی ئێمە بەهەمان شێوە کە فیزیاناسێک وەک شایەتی توێژەر و ئەزموونکار دەبێ پشتی پێ ببەستێت، دەهێنێتە خوارەوە و تا ئاستی کاریگەریەتی کەسی بینەر ڕایدەوەستێنێت. ئەم تیورە چاڵێک لە نێوان سرووشت و کەسی توێژەری سرووشتدا دروست دەکات. ئەو ناچار دەکات کە بە چنگ هاوێشتن بە تیوری شک ئامێزی شتێک کە درکی پێناکرێت، پردێک لەم نێوانەدا ساز بکات. تیۆریەک کە ئەم فەزا ڕەهایەی وەک شتێک کە برێژرێتە ناو زەرفێک پڕ کردۆتەوە و بە جۆرێک پێوەندی دەبێتە هۆی ئیدراکی ئێمە.

بەپێی وتەی پرۆفیسۆر **وایتهد**، ئەم تیورە نیوەی سرووشتی کردووە بە"خەون"و نیوەیتری بە"گومان". بەم شێوەیە زانستی فیزیا بە پێویستی زانی کە لە بنەڕەتەوە خۆی بخاتە بەر ڕەخنە و لە ئاکامدا لەم هەڵسەنگاندنە دووبارەدا، هۆیەکی دۆزیەوە بۆ شکستی بوتەکەی خۆی. روانینی ئەزمونیی کە بە ڕەواڵەت مادەخوازیی زانستی بە پێویست دەزانی بووە یاخی بوونێک دژ بە مادە.

بابەتە بینراوەکان یان لەمسکراوەکان حاڵەتگەلی زەینی نین کە شتێکی درک پێنەکراو کە مادەی ناوە، هۆی بوونی ئەوانە بێت. ئەوانە دیاردەگەلێکی ڕەسەنن کە هەمان جەوهەری سرووشت پێکدەهێنن و ناسینی ئێمە لەوانە وەهایە کە لە ناو سرووشتدان. چەمکی مادە گەورەترین زەربەتی لە دەست **ئەنیشتاین**، فیزیاناسی بەناوبانگ وەرگرت کە تیۆری و ئەزموونەکانی بووە بناغەی شۆڕشێکی مەزن لە ناو گشت پانتای ئەندێشەی مرۆییدا.

ئاغای **بێرتراند راسێل** دەڵێت: تیۆری ڕێژەیی بە هێنانی کات لە ناو شوێن – کاتدا، زیاتر لە گشت بورهانە فەلسەفیەکانیتر خەساری تووشی باوەرێکی سوننەتی سەبارەت بە جەوهەر کردووە. مادە لە واتایەکی گشتییدا شتێکە کە لە ناو زەماندا بوونی هەیە و لەناو شوێندا حەرەکە دەکات. لە ڕوانینی تیوری نوێی ڕێژەییدا ئەم ئایدیایە لایەنگریی لێناکرێت. ئیتر وردەیەک لە مادە شتێکی هەمیشەیی نییە بە حاڵەتگەلێکی جوراوجۆرەوە، بەڵکو کۆپلەیەکە لە ڕووداوگەلی پەیوەستە بە یەکترەوە. ئەو ڕەق و پتەوویەتیەی قەدیم بەو سیفەتانەوە کە مادەخوازەکان بەستوویانەتهوە بە مادەوە هەتاکو ئەوە بە واقیعییتر لە ئەندێشە جیاوازەکان پیشان بدەن، ئەو ئەندێشانەی کە ناجێگیرن.

بەم شێوەیە بەپێی وتەی پرۆفیسۆر **وایتهد**، سرووشت واقیعێکی ڕاوەستاو نییە کە لەناو بۆشاییەکی گەشەکردوودا دانرابێت، بەڵکو ئاوێتەیەکە لەو ڕووداوانەی کە تایبەتمەندییان لەوەدایە کە بەردەوام دەبوژێنەوە. ئەندێشە ئەوە دەکاتە بەشگەلێکی بێ جوڵە و جیا لەیەکتر. چەمکەکانی شوێن و کات لە ناخی پێوەندیە بەرامبەرەکانی بەشەکانەوە سەردەردەهێنێت. ئاوەهایە کە تێدەگەین زانستی نوێ تا چ ڕادە لەگەڵ ڕەخنەکانی **برکلی** دا سازگار دەبێت لە حاڵێکدا کە بەرلەوە ئەوەی وەک

زەربەتێک دەزانی کە لە بناغەکەی دەدرێت. ئەو روانینە زانستییەی کە سرووشت بە مادەی ڕەها دەزانێت دەگەڕێتەوە بۆ تیۆری **نیۆتۆن** سەبارەت بە فەزا، واتە بۆشاییەکی ڕەها کە شتەکان لەوێدا دانراون. بێگومان ئەم شێوەیە لە بیرکردنەوە گەرەنتی پێشکەوتنی خێرای زانست بووە. ئەم رۆژانە دوولقە بوونی ئەزموونێکی گشتی و دابەشبوون بە دوو دەڤەری دژ بەیەکی زەین و مادە، زانستی ناچار کردووە کە بە توێژینەوە سەبارەت بەو گرفتانەی کە خۆی هەیەتی، ئاوڕ لەو بابەتانە بداتەوە کە لەسەرەتای پێشکەوتنییەوە بە تەواوەتی ئەوانەی لەبەرچاو نەگرتبوو. ڕەخنە لە بناغەکانی زانستی بیرکاریی بە تەواوەتی ئەوەی ئاشکرا کردووە کە تیۆری مادیەتی ڕەها، واتە شتێکی ڕەق و جێگر کە لە ناو فەزایەکی ڕەهادا دانراوە، کارامە نییە. ئایا فەزا بۆشاییەکی سەربەخۆیە کە شتەکان لەوێدا دانراون و ئەگەر بێت لەوێ بهێنرێنە دەرەوە، هەروا بێ دەستێوەردان دەبن؟

**زنون**[1]، فەیلەسووفی یۆنانی کەونارا لەرێگەی بابەتی حەرەکە لە ناو فەزادا دێتە سەر باسکردن سەبارەت بە خودی فەزا. هۆیەکانی ئەو بۆ بابەتی بە ناواقیع پیشاندانی حەرەکە بۆ توێژەرانی فەلسەفە بەناوبانگە. ئەو بابەتە لە سەردەمی خۆیەوە هەتا ئێستا لەناو مێژووی فیکردا ماوەتەوە و زۆرترین سەرنجی بیرمەندانی بەرەولای خۆی راکێشاوە. لێرەدا دوو نموونە لەم بورهانانە باس دەکەم. **زنون** کە فەزای بە شیاوی دابەشکردن دەزانی بە بەشگەلی بێ ئەژمار، باس لەوە دەکات کە حەرەکە لەناو فەزا ئەستەمە. لەبەرئەوەی کە بەر لەوەی شتی بزۆک

[1]- زنون ٤٣٠-٤٩٥، بۆ نەفی و رەفزکردنی حەرەکە، دێت ئاشیلی چوست و چالاک کە ئوستورەیەکی ئیلیادی هۆمێرە لەگەڵ کیسەڵێکدا قیاس دەکات و دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە ئاشیل لە حەرەکە دا هەرگیز ناتوانێت پێش ئەو کیسەڵە بکەوێت.

بتوانێت بگاتە شوێنی مەبەستی خۆی، دەبێ نیوەی خاڵی دەستپێک هەتا شوێنی مەبەست تێپەڕ بکات. بەرلەوەی کە بتوانێت لەو نیوەیە تێپەڕ بکات دەبێ لە نیوەی ئەو نیوەیەش تێپەڕ بێت و بەم شێوەیە هەتا کۆتایی ئەو بابەتە بەو جۆرە دەبێت. کەواتە بێ تێپەڕبوون لە نوقتەگەلی بێ ئەژمار لەناو فەزادا ناتوانین لە خاڵێکەوە بەرەو خاڵێکتر بڕۆیین. لەلایەکیترەوە ئەمە ئەستەمە کە بکرێ لە زەمانێکی بەرتەسکدا لە خاڵگەلی بێئەژمارەوە تێپەڕ بین. هەروەها ئەوە دەسەلمێنێت کە تیری ڕسکاو لە کەوان حەرەکی نییە، لەبەرئەوەی کە لە هەر قۆناغێک لە پەڕینەوەی خۆی لە خاڵێک لەناو فەزادا ڕاوەستاوە. بەم شێوەیە زنون ئەوەی بە بڕاوە دەزانی کە حەرەکە تەنها فریوێکی ڕەواڵەتییە و ئەمە حەقیقەتە کە تاقانە و نەگۆڕە. ناواقیعی بوونی حەرەکە بە واتای ناواقیعی بوونی فەزایەکی سەربەخۆیە. بیرمەندانی موسوڵمانی قوتابخانەی ئەشعەری باوەڕیان بەوە نەبوو کە فەزا و زەمەن دابەش بکرێتە سەر بێ ژمار. لە ڕوانگەی ئەوانەوە فەزا، زەمەن و حەرەکە لە خاڵ و چرکەگەلێک پێکهاتوون کە ئیتر ناکرێت دابەش ببنە سەر بەشگەلێکی بچوکترەوە. بەم شێوەیە ئەوان ئیمکانی بوونی حەرەکەیان بەپێی ئەم تیۆرە سەلماند و ئەوەش کە پاژەگەلی"لا یتجزا"بوونی هەیە. ئەگەر بۆ دابەشکاریی زەمەن و شوێن سنوورێک هەبێت، حەرەکە لە خاڵێکەوە لە ناو فەزادا بۆ خاڵێکیتر لە کاتێکی سنوورداردا ئیمکانی هەیە.

**ئیبن حەزم** ، بیرۆکەی ئەشعەریەکانی سەبارەت بە بەشە جیانەکراوەکان ڕەفز کردەوە و بیرکاریی نوێی باسەکانی ئەوی تەئید کرد. بەم شێوەیە هۆکانی ئەشعەریەکان لە باری لۆژیکەوە ناتوانێت ناسازگاریی **زنون** ڕەفز بکاتەوە. لەناو بیرمەندە نوێکاندا، **برگسون،** فەیلەسووفی فەرەنسی و **برتراند راسێل**، بیرکاری بریتانیایی هەوڵیاندا

کە بورهانەکانی زنون لە روانگەی تایبەتی خۆیانەوە رەفز بکەن. بە باوەڕی **برگسون،** حەرەکە وەک گۆڕانێکی راستەقینە، واقیعێکی بنەڕەتییە. ناسازگاریی زنون دەگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتنی نادروستی خۆی لە فەزا و زەمەن کە **برگسون** تەنها وەکو دیمەنە عەقڵییەکان سەرنجیان پێ دەدات. لێرەدا ئیمکانی باسێکی بەربڵاومان نییە سەبارەت بە هۆکانی **برگسون** بێ ئەوەی کە بە تەواوەتی ئاوڕێکی گشتی بدەینەوە لە چەمکی"ما بعد الطبيعة"ی ژیان کە هەمووی ئەو بورهانە پشتی پێ بەستووە. بورهانی **راسێل** لەسەر تیوری **کانتۆر** سەبارەت بە پەیوەستەیی بیرکاریی دامەزراوە کە **راسێل** ئەوە بە یەکێک لە گەورەترین داهێنانەکانی بیرکاریی نوێ دەزانێت.

بورهانی **زنون** بە ئاشکرا پشتی بەم تیۆرە بەستووە کە شوێن و زەمەن پێکهاتەی ژمارەیەکی زۆری خاڵەکان و ساتەکانە. بەم تیۆرەوە دەکرێ بە ئاسانی هۆ بهێنینەوە، لەبەرئەوەی کە شتی بزۆک لە نێوان دوو خاڵدا بێ حەرەکە دەمێنێتەوە، هەربۆیە جوڵە ئەستەمە. لەبەرئەوەی کە شوێنێک نییە کە پڕی بکاتەوە. کەشفەکانی **کانتۆر** ئەوە دەسەلمێنێت کە زەمەن و شوێن پێکەوە بەستراو و پەیوەستەن. لە نێوان هەردوو خاڵ لەناو فەزادا بێ ئەژمار خاڵ بوونی هەیە و لە یەکرێزی بێ ئەژماریشدا هەرگیز دوو خاڵ وەها نین کە یەکێکیان پاش ئەوە بێت. دابەشبوونی بێ سنووری زەمەن و شوێن بە واتای گووشراویی خاڵەکانە لە ریزێکدا. خاڵەکان بەم شێوەیە لێک جیان کە لە نێوان هەردوو دانەیاندا فاسیلەیەک هەیە. وەڵامی **راسێل** بۆ **زنون** بەم شێوەیە:

"**زنون** دەپرسێت: چۆن دەتوانن لە بارودۆخێکەوە بۆ بارودۆخیکیتر و لە یەک ساتدا بڕۆن، بێ ئەوەی لەم گواستنەوەدا لە هیچ بارودۆخیکی شوێن و کاتدا نەبین؟ وەڵام ئەمەیە کە بۆ هیچ بارودۆخێکی شوێن و

هیچ ساتێکدا بارودۆخێکیتر بوونی نییە. بەردەوام لە نێوان ئەم دوو بارودۆخە شوێن و زەمەنەدا، بێ ژمار خاڵ و سات هەیە. ئەگەر زەڕەی جیانەکراوە بوونیان هەبوایە، کەواتە حەرەکە ئەستەم دەبوو. بەڵام بەوشێوەیە نییە. هەربۆیە **زنون** لەو شوێنەدا کە دەڵێ تیر لە هەر چرکەیەکدا لە ڕسکانی خۆیدا لە بێ حەرەکەیدایە، قسەکەی **زنون** لێرەدا راستە، بەڵام دەرهێنجانەکەی سەبارەت بەوە کەواتە تیر حەرەکە ناکات، هەڵەیە. لە حەرەکە لە نێوان زنجیرەی بێ کۆتایی بارودۆخی شوێن و زنجیرەی بێ کۆتایی ساتەکاندا یەک لەسەر یەک یەکسان کراون. بەپێی ئەم تیۆرە سەلماندنی واقیعی فەزا، شوێن و کات و حەرەکە ئیمکانی هەیە و لەهەمان حاڵدا بەر بە ناسازگاریی بورهانی زنون دەگرێت".

بەم شێوەیە **برتێراند راسێل** واقیعی حەرەکەی بەپێی تیۆری بەردەوامیی بیرکاری **کانتۆر** سەلماندووە. واقیعی حەرەکە بە واتای سەربەخۆیی شوێن و عەینی بوونی سرووشتە. لەهەمانکاتدا لێکچوونی بەردەوامیی بیرکاری و دابەشکاریی شوێن بەبێ ژمار، نابێتە ڕێگەچارەی ئەم گرفتە. ئاوای دابنێین کە ژمارەی لەرادەبەدەری ساتەکان لە یەک فاسیلەی بەرتەسکی زەمەنی و ژمارەی لەڕادەبەدەری خاڵەکان لە بەشێک لە فەزای سنووردارردا یەک لەسەریەک لێکچوون هەیە. لەهەمانکاتدا کێشەیەک کە لە دابەشکارییەوە دێتە دەر، وەها دەمێنێتەوە. چەمکی بیرکاریی پەیوەستە بوون وەک زنجیرەیەکی بێ ئەژمار، یەکسان نابێت لەگەڵ حەرەکە بە واتای کردەوەدا. زیاتر لەسەر وێنەی حەرەکە بەو شێوەیە کە لەدەرەوە دێتە بەرچاو، یەکسان دەکرێت. کردەوەی حەرەکە، واتە حەرەکە وەک توخمێکی زیندوو و نە بابەتێکی فیکری بە هیچ شێوە دابەش ناکرێت. ڕسکانی تیر کە وەک تێپەڕین لەناو فەزادا دەبیندرێت دەکرێ دابەش بێت، بەڵام خودی

ڕسکانەکەی وەک کردەوەیەک کە ڕوودانی لە ناو شوێندا لەبەرچاو نەگرین، یەکەیەکە و ناکرێت بە دابەشبوون زیاتر بێت، فەنای ئەوە لە دابەشکردنەکەیدا شاراوەتەوە.

بە باوەڕی **ئەنشتاین** فەزا واقیعە، بەڵام بەرامبەر بە کەسی چاودێر. ئەو چەمکی نیۆتۆنی فەزای ڕەها ڕەفز دەکاتەوە. ئەگەر شتی بیندراو، بگۆڕە ئەوە بەرامبەر بە کەسی چاودێرە. بارستایی، شکڵ و قەبارەی شتەکە بە نیسبەت باروودۆخی شوێن و گۆڕانی خێرایی کەسی چاودێرەوە لە نسبەتدایە. هەروەها حەرەکە و وەستاویی لەگەڵ کەسی چاودێردا نیسبەتیان هەیە. کەواتە هیچ شتێک بە ناوی مادیەتی پشت بەستوو بە زاتی خۆی- بە لێکدانەوەی فیزیای کلاسیک- بوونی نییە. لێرەدا بە پێویستی دەزانم کە خۆمان لە تێگەیشتنی هەڵە بەدوور بگرین. لەم پێوەندیەدا بەکارهێنانی وشەی چاودێر observer لە ڕوانگەی **ویلدنکار**، ئەوی کێشایە ناو ئەم بیرە هەڵەوە کە تیوری ڕێژەیی دەبێ حەتمەن بگاتە ئیدەیالیسمی مونادی[1]. دروستە کە بە پێی ئەم تیورە قەبارە و مانەوە و بەردەوامیی دیاردەکان رەهانییە، بەڵام هەربەو شێوەیە کە پرۆفیسۆر **نون** باسی لێدەکات، قاڵبی شوێن- زەمەن ناگەڕێتەوە تەنها بۆ زەینی کەسی چاودێر بەڵکو بە خاڵێک لە جیهانی مادیەوە بەستراوە کە جەستەی ئەو سەر بەو شوێنەیە. لە ڕاستییدا دەکرێ لە جیاتی چاودێر، ئامێرێکی تۆمارکار دابندرێت. من خۆم لەسەر ئەو باوەڕەم کە تایبەتمەندیی نیهایی واقیع، مەعنەوی و ڕۆحانییە، بەڵام

---

[1] monadistitic idealism باوەڕێکە کە جیهان بە ئاوێتەیەک لە جەوهەر یان زاتەکان دەزانێت. ئەم باوەڕە لە لایەن فەیلسووفی ئەڵمانی لایب نیتس هاتە ئاراوە. بە باوەڕی ئەو جیهان لەو مونادانەوە پێکهاتووە کە لە نێوانیاندا هاوئاهەنگیەکی تەواو هەیە.

به مەبەستی دوورکەوتنەوە لەوەی کە خراپ حاڵیبوونێک بێتە ئاراوە دەبێ باس لەوە بکەین کە تیوری **ئەنیشتاین** وەک تیوریەکی زانستی تەنها ئاوڕ لە ستراکچێری شتەکان دەداتەوە و سەرنج ناداتە چییەتی ناخی شتەکان. ئەم تیورە لە دوو لایەنەوە بایەخی فەلسەفی هەیە، یەکەم ئەوەی کە نکولی لە عەینی بوونی سرووشت ناکات بەڵکو ئەو تیۆرە باتڵ دەکاتەوە کە بۆ جەوهەر، مەحەلێکی ساکار لە ناو شوێندا دادەنێت. تیۆریەک کە سەری لەناو مادەخوازیی فیزیای کلاسیکدایە."جەوهەر"لە روانگەی تیوری رێژەیی فیزیای نوێوە، شتێکی سەقامگرتوو بە حاڵەتگەلی بگۆڕەوە بەڵکو کۆیەکە لە ڕووداوگەلی پەیوەست بە یەکترەوە. لە پێشکەشکردنی ئەم تیورەدا لەلایەن **وایتهد**، چەمکی ئۆرگانیزم لە جیاتی چەمکی"مادە"دا بەکارهاتووە. هەروەها ئەم تیۆرە شوێن وابەستە بە مادە دەزانێت. بەپێی تیوری ئەنشتاین، جیهان وەک جەزیرەیەک نییە لە ناو فەزایەکی بێ سنووردا، پانتای دیارە بەڵام بەستراو نییە و لەوپەڕیدا فەزایەکی بۆش بوونی نییە. جیهان ئەگەر زاتی مادە بوونی نەبێت ئەوەندە دەگووشرێت هەتا وەک نووقتەیەکی لێدێت. تیوری ڕێژەیی **ئەنشتاین** بەو شێوەیە کە من لەم باسانەدا پێشکەشی دەکەم، گرفتێکی گەورەمان بۆ دروست دەکات و ئەویش ناواقعبوونی زەمانە. وادێتە بەرچاو کە ئەو تیوریەی کە زەمان بە لایەنی چوارەم دەزانێت، دەبێ وەک بابەتێک بروانێتە داهاتوو کە هەیە و وەک رابردوو راوەستاوە. زەمان وەک حەرەکیەکی داهێنەرانە و ئازاد چەمکێکی بۆ ئەم تیۆرە نییە. زەمان تێپەڕ نابێت، ڕووداوەکان ڕوونادەن، بەڵکو ئەوە ئێمەین کە دەچینە دیداریان. بەهەر شێوە نابێ ئەوە فەرامۆش بکەین کە ئەم تیۆرە تایبەتمەندییە قبوولکراوەکانی زەمان، بەو شێوەیە کە ئێمە ئەزموونمان کردووە نابێ لەبەرچاو بزر

ببێت. ناکرێ باس لەوە بکەین کە چییەتی زەمان بەو تایبەتمەندیانەی کە ئەم تیۆرە بۆمان باس دەکەن، لەناو دەچێت. لەبەرئەوەی کە ئاوڕ لەو لایەنەی سرووشت دەداتەوە کە لە ڕەوتی لۆژیکی بیرکارییدا بێت. ئێمە کە لەگەڵ تیوریەکەی ئەنشتایندا نامۆین، تێگەیشتن لە وەی کە زەمەن بە ڕاستی چییە و لە روانگەی ئەودا لە چی پێکهاتووە، بۆمان ئەستەمە. دیارە کە زەمەن بە باوەری **ئەنشتاین** نە ئەو درێژخایەنیە ڕەهایەیە کە **برگسون** باسی لێدەکات و نە دەکرێ ناوی زەمەنی تەسەلسوولی لێبنرێت. زەمەنی تەسەلسوول بەو شێوەیە کە **کانت** پێناسەی دەکات جەوهەر و بنەڕەتی علیەتە. هۆ و بەرهۆ وەها پێکەوە تەنراون کە لە ڕوانگەی تەرتیبی زەمەنییەوە یەکەمیان پێشترە لە دووهەمیان. کەواتە ئەگەر یەکەمیان نەبێت، ئەویدی ناکرێ هەبێت. ئەگەر زەمەن لە باری بیرکارییەوە هەمان زەمەنی تەسەلسوولی بێت، ئەوکاتە بە پێی ئەم تیورە دەکرێ بە هەڵبژاردنێکی ورد لەو خێراییە جیاوازانەی کە کەسی چاودێر دەیکات و ئەو ئامێرانەی کە ئەم خێراییە تۆمار دەکەن، کارێکی وەها بکرێت کە بەرهۆ پێش هۆکەی بکەوێت.

بە باوەڕی من ئەگەر زەمەن وەک لایەنی چوارەمی فەزا لەبەرچاو بگیردرێت، بەڕاستی چەمکی زەمەن لەوێداڕادەوەستێت. یەکێک لە نووسەرە دواییەکانی رووسیا بە ناوی **ئاوسپنسکی**، لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی سێهەمین ئەرغەنوون، وای دەهێنێتە بەرچاو کە لایەنی چوارەم لەدایکبووی حەرەکی شێوازێکی سێ لایەنە لە ناو هێڵێکی راستدا. سێ لایەن فەزایەکی ئاسایی دەداتە ئێمە، هەر بەوشێوەیە کە حەرەکە شکڵێکی سێ لایەنی نییە لە ناو ئەو هێڵێکدا و دەبێ لایەنی چوارەمی فەزامان پێ بدات. زەمەن ئەو نێوانەیە کە ڕووداوەکان بە تەرتیب جیادەکاتەوە و ئەوانە لە جۆرە جیاوازەکاندا یان گشتە فرە چەشنەکاندا

پۆلێنبەندی دەکات. دیارە کە فاسیلە لە ناو هێڵی راستدایە نەک ئەوەی کە بەشێک بێت لە فەزای سێ لایەنە. نێوان وەک لایەنێکی تازە کە ڕووداوەکان بە پێی کاتی ڕوودانیان ساز دەکات بە قەبارەی فەزای سێ لایەنە هەڵناسەنگێندرێت. بەهەمانشێوە کە بە یەکساڵ ناکرێ"سن پطرزبورگ"هەڵبسەنگێنین. ئەم نێوانە بەسەر گشت هێڵەکانی فەزای سێ لایەنەدا عەموودە و لەگەڵ هیچکامیاندا تەریب نییە. **ئاوسپنسکی** لە شوێنێکیتری هەمان کتێبدا هەستەکانی ئێمە لە زەمەن وەک هەستی نادیار و نامەعلوومێک کە دەتوانین لە شوێن هەمانبێت، وەسف دەکات و بەپێی ستراکچێری دەروونی خۆمان حوکم دەکات کە بە باوەڕی بوونەوەرگەلێک کە خاوەنی یەک، دوو یان سێ لایەنن، لایەنی سەرتر دەبێ هەمیشە لە شێوازی تەوالی لە ناو زەمەندا خۆی دەربخات. ئەم وتەیە ئاشکرا و بەومانایە کە ئەو شتەی کە بەسەر ئێمەدا، بوونەوەرگەلی سێ لایەنە وەک زەمەن ئاشکرا دەبێت لە واقیعدا هەستێکی نوقسانە لەو لایەنە فەزایەی کە لە زاتی خۆیدا بە درکێکی کامڵ لە لایەنەکانی فەزایی هەندەسەی **ئۆقلیدۆس** پێی دەگەین و جیاوازی نییە. بە وتەیەکیتر زەمەن حەرەکەی داهێنەرانە و خاوەنی ڕەسەنایەتی نییە، هەربۆیە ڕووداوەکانی داهاتوو بە ڕووداوگەلی نوێ نازانین، بەڵکو شتگەلێکن کە لەوەو پێش دیار بوون، بەڵام لە شوێنێکی نادیاردا بوون. **ئاوسپنسکی** هێشتا لە گەڕانەکەی خۆیدا بە شوێن لایەنی تازەدا، بێجگە لە سێ لایەنی هەندەسەی ئۆقلیدۆسی پێویستی بە زەمەنی موسەلسەلی ڕاستەقینەش هەیە. واتە ئەو نێوانەی کە ڕووداوەکان بەپێی کاتی ڕوودان لە یەکتر جودا دەکاتەوە. بەم شێوەیە زەمەن کە بۆ مەبەستەکانی قۆناغێک لە ئیستدلال پێویست بوو و هەربۆیە وەک تەوالی لەبەرچاو دەگیرا، لە قۆناغیکی دیکەدا بەری و

بەتاڵ دەبێت لە تایبەتمەندییەکانی تەسەلسوول. تا ڕادەیەک تەنازوول دەکات کە ئیتر لە هیچ شتێکدا لەگەڵ هێڵ و لایەنەکاندا جیاوازی نەبێت. بەهۆی تایبەتمەندی تەسەلسوولی زەمەنە کە **ئاوسپنسکی** توانی زەمەن وەک پانتایەکی تازەی ڕەسەن لەناو فەزادا بخاتە بەر سەرنج. ئەگەر ئەم تایبەتمەندیە بە ڕاستی وەهم و خەیاڵە ئەی چۆن دەتوانێت پێویستییەکانی **ئاوسپنسکی** وەک لایەنێکی سەرەکی دەستەبەر بکات؟

ئێستا ئاوڕ لە لایەنێکیتری ئەزموون دەدەینەوە کە بریتییە لە ژیان و خودئاگایی. خودئاگایی دەکرێ وەک تێکشکانی نوورێک لەبەرچاو بگرین کە لە سەرچاوەی ژیانەوە دێت و ئەرکەکەی پێکهێنانی خاڵێکی ڕۆشنە وەها کە گەڕیانی بەپەلەی ژیان ڕووناک بکاتەوە. خودئاگایی بریتییە لە هەوڵ و تێکۆشان، حاڵەتێکە لە کۆی زەین و بە هۆی ئەوەوە ژیان دەتوانێت گشت بیرەوەری و ئەندێشە کەونەکان کە هیچ کاریگەریەتییەکان لەسەر هێنانی ئێستادا نییە، لە خۆ دوور بخاتەوە.

پەراوێزەکەی بە هیچ شێوە داخراو نییە و بەپێی پێویستی دەگووشرێت یان دەکرێتەوە. وەسفیکردنی خودئاگایی یان شعوور وەک نموودێک کە لەدایکبووی پرۆسە مادیەکانە واتە نکولی لە چالاکی سەربەخۆی ئەوە و نکولی لەم چالاکییە بە واتای لەبەرچاونەگرتنی هەر جۆرە ناسینێک، لە حاڵێکدا کە مەعریفە تەنها لێکدانەوەیەکە لە شعوور یان خودئاگایی بەدیسیپلین. کەواتە خودئاگایی بەشێکە لە بنەڕەتی بە تەواوەتی مەعنەوی ژیان کە جەوهەر نییە بەڵکو بناغەیەکی تایبەت و حاڵەتێکی دیاریکراوی ڕەفتارە کە بە گشتی جیاوازی هەیە لەگەڵ شێوازی کاری دام و دەزگا یان ماشینێک کە بە هۆی بابەتێکی دەرەکییەوە دەکەوێتە ئیشکردن. لەبەرئەوەی کە ناتوانین هێزێکی بە تەواوەتی مەعنەوی وێنا بکەین بێجگە لە کاتێک کە بە تەواوەتی لەگەڵ

توخمە هەستپێکراوەکاندا ئاوێتە دەبێت و خۆی نیشان دەدات، هەربۆیە ئامادەین تاکو ئەم ئاوێتەییە وەک پێگەی کۆتایی هێزێکی مەعنەوی قبووڵ بکەین. بابەتە دەرهێنەرانەکانی **نیوتۆن** لە بواری مادە و هەروەها **داروین** لە بواری مێژووی سرووشتییدا، پیشاندەری میکانیزمن. وابیر دەکرایەوە کە هەموو بابەتەکان لە ڕاستییدا دەگەڕێتەوە بۆ فیزیا. هێز و ئەتۆم بە تایبەتمەندی زاتی خۆیانەوە دەتوانن هەرچی کە پێوەندی بە ژیان، ئەندێشە و ئیرادە و هەستەوە دەبێت دەربخەن. چەمکی میکانیزم کە بە تەواوەتی چەمکێکی فیزیکی و مادییە و بانگەشەی پێناسەکردنی گشت سرووشت بوو. هێشتا شەڕێکی توندوتیژانە لە بەرژەوەندی و دژ بە میکانیزم لە پانتای زیندەوەرناسییدا لە ئارادایە.

کەواتە گرفت لەوەدایە کە ئایا گەیشتن بە حەقیقەت لە ڕێگەی دەرکەوتەکانی بەرهەمهاتوو لە درککردنی هەست دەگاتە دارشتنی تیۆریەک سەبارەت بە ناسینی حەقیقەت کە خۆی لە بنەڕەتەوە لەگەڵ ئەو ڕوانگەیەدا کە ئایین لە ناخی خۆیدا هەڵیگرتووە، دژایەتی هەبێت؟ ئایا لە ئاکامدا زانستی سرووشتی ئیختیاری خۆی دەداتە مادەخوازی؟ هیچ گومانێک لەوەدا نییە کە تیۆرە زانستیەکان ئاگاییەکی جێی متمانە دروست دەکەن لەبەرئەوەی شیاویی تاقیکردنەوەن و ئەم تواناییەمان پێ دەبەخشن تاکو ڕووداوە سرووشتیەکان پێشبینی و دەستەمۆ بکەین. نابێ ئەوە فەرامۆش بکەین کە ئەوەی کە ناوی زانستی لەسەرە، تیۆریەکی خاوەن فۆرم سەبارەت بە واقع نییە، بەڵکو کۆمەڵێکە لە تیۆریە تاکی و ڕووکەشیەکان سەبارەت بە واقیع و بەشگەلێکی یەک ئەزموونی گشتییە کە نادیار نییە پێکەوە نسبەتێکیان هەبێت. زاستە سرووشتیەکان سەبارەت بە مادە، ژیان و فیکر دەدوێن و لەهەمانکاتدا ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە کە چۆن مادە، ژیان و زەین لەگەڵ یەکتردا

پێوەندیان هەیە، بەم شێوەیە دەردەکەوێت کە هەرکام لەم زانستانە بە تەنها ناتوانن وەڵامێکی کامڵ بە پرسیارەکان بدەنەوە. لەڕاستییدا زانستە سرووشتیە جیاوازەکان لە ژمارێکی زۆر کەمتیار دەچن کە بەسەر جەستەی سرووشتەوە وەستابێتن و هەرکامیان لەتێک لە گۆشتەکەی دەپچڕن و هەڵدێن. سرووشت لە باری زانستییەوە بابەتێکی بە تەواوەتی دەستکرد و دروستکراوە و ئەم دەستکردبوونەی بەرهەمی هەڵبژاردنی ئەو پرۆسەیە کە زانست بۆ دەستگەیشتن بە باوەڕ و دڵنیایی، سرووشت بە دروستکراو دەزانێت. لەهەمانکاتەوە کە بابەتی زانست هاتە ناو کۆی ئەزموونی مرۆییەوە دەستی کرد بە پیشاندانی رۆڵێکی جیاواز. بەم شێوەیە ئایین کە خوازیاری گشتی حەقیقەتە، دەبێ شوێنێک لە سەنتەری کۆیەک لە دەستەکەوتەکان و تیۆرەکانی ئەزموونی مرۆیی بۆ خۆی دەستەبەر بکات. هیچ هۆیەکی نییە کە ئایین لە تیۆرە تاکیەکانی زانست سەبارەت بە ڕاستییەکان بترسێت. تیۆری زانستی سرووشتی لەڕاستییدا تاکییە و ئەگەر سەبارەت بە چییەتی و کارکردی خۆی راستبێژە، ناتوانێت بابەتەکەی خۆی وەک روانگەیەکی گشتگیر سەبارەت بە واقع و حەقیقەت ئاراستە بکات.

کەواتە ئەو چەمکانەی کە لە بەدیسیپلینکردنی مەعریفە بەکاریان دەبەین، خاوەنی تایبەتمەندی تاکین و کارکردیان دەگەڕێتەوە بۆ رادەی ئەو ئەزموونەی کە لەوێدا بەکارهاتووە. بۆ وێنە چەمکی هۆ کە چییەتیەکە لە زاتی خۆیدا پێش لەبەرهۆ دێت، بابەتی بنەڕەتی زانستە مادیەکان پێکدەهێنێت. هەروەها جۆرێکی تایبەت لە چالاکی – بەدەر لە دیکەی شکڵەکانی چالاکی کە سەرنجی دیکەی زانستەکانی راکێشاوە- دەخاتە بەر موتالا و هەڵسەنگاندن. کاتێک هۆ لە بەرزایی ژیان و رەواندا دادەنێین لەم بوارەدا پێویستمان دەبێت بە چەمکگەلێکیتر لە

ئـەندێشـە. کـاری بوونـەوەرە زینـدووەکـان بـە مـەبـەسـتی گـەیـشتن بـە ئەنجامێکە و بۆ ئەوە دارێژراوە کە بە گشتی لەگەڵ کردەوەی هۆکارییدا جیـاوازە. کـەواتـە بابـەتـی سـەرەکـی لێکۆڵینـەوەی ئێمـە پێویـستی بـە چەمکی"ئەنجام"و"مـەبـەست"هـەیە کـە کار و کـردەوەیـان نـاوەکییە. نـەک وەکـو چـەمکـی هـۆ کـە بـە نیـسبەت بـەرهـۆ، دەرەکییـە و لـەدەرەوە کـار دەکـات. بێگومـان لـە یـەک ئـەندامی زینـدووی جـەستـەدا لایـەنگـەلێک لـە چـالاکی بوونیـان هـەیـە کـە لـەم بـوارەدا لـەگـەڵ دیکـەی شـتەکـانی نـاو سرووشـتدا هاوبـەشیان هـەیـە. بـۆ بینینـی ئـەم لایـەنانـە، پێویـستمان بـە چـەمکـەکـانی فیزیـا و کیمیـا هـەیـە. رەفتـاری بوونـەوەری زینـدوو لـە بنەڕەتەوە بابەتێکی ژینێتیکە کە ناکرێ لە نێوان چەمکە باوەکانی فیزیای مولوکۆلی، پێناسەیەکی وەهای بکرێت کـە ئیقناعمـان بکـات. لـەبـەرئـەوەی کە چەمکی میکانیزمیان بە هاوتـای ژیـان بـەکـاربردووە، ناچـارین لـەوەی کە ئەو خاڵە روون بکەینەوە کە ئەم هەوڵە تـا چ ڕادەیـەک سـەرکـەوتـوو بووە. مەخابن کە زیندەوەرنـاس نیم و وتـەکـانم دەبـێ پشت ئـەستوور بێت بە روانگەی زیندەوەرناسەکان.

**ج. اس. هالـدین** پـاش ئـەوەی کـە بـاس لـە جیـاوازی بنـەڕەتـی نێـوان بوونەوەری زیندوو و کەرەستەیەک دەکات لەبەرئەوەی کە یەکێکیان دەتوانێت خۆی بپارێزێت و هەروەها زاوزێ بکات، ئاوەها دەڵێت:

"کەواتە ئاشکرایە کـە لـە بوونـەوەرە زینـدووەکانـدا دیـاردەگـەلـی زۆر دەبینین کە ئەگەر بە وردی سەرنجیان نـەدەیـن، دەتـوانن پێناسـە بکـرێن بــە میکــانیزمی فیزیــایی و کیمیــایی، بــەڵام رێــک لــەلای ئــەوانــەوە، دیاردەگەلیتریش هـەن وەک خودپاراستن یان زاوزێکردن کە پێناسـەی هاوشێوە بۆ ئـەوانـە دروست نییـە. پـەیـڕەوەکانی میکـانیزم لـەسـەر ئـەو بــاوەڕەن کــە میکانیزمــە جــەســتەییــەکــان وەهــا دروســتکراون کــە

خودپاراستن، خۆچاککردنەوە و زاوزێکردن بەرهەمی ئەوانەیە. میکانیزمگەلی ئاوەها لە پرۆسەی درێژخایەنی هەڵبژاردنی سرووشتییدا بەرەبەرە کامڵ بوون. باشتروایە ڕامانێکمان هەبێت لە چۆنیەتی و چیەتی ئەم تیۆرەدا. کاتێک کە ڕووداوێک بە چەمک و زاراوەگەلی میکانیکی دەگێڕینەوە یان بۆ باسکردنی ڕووداوێک رووده‌کەینە زارەوە میکانیکیەکان بەو مانایە کە ئەوەمان بە بەرهەمی حاشاهەڵنەگر و پێویستی هەندێک لە تایبەتمەندیە سادەکانی ئەو بەشە جیایانە دەبینین کە لەو ڕووداوەدا کاریگەریەتی بەرامبەریان لەسەر یەکتر داناوە. بە کورت و بە ڕوونی ئەم باسە ئەوەمان پێ دەڵێت کە ئێمە پاش موتالا و هەڵسەنگاندن کاریگەریەتی بەرامبەری بەشە جیاکانی ڕووداوێکمان وەها قبووڵ کردووە کە خاوەنی تایبەتمەندی ساکارە. ئاوەها وەرمانگرتووە کە ئەو بەشانە بەردەوام لە ناو بارودۆخێکی یەکساندا بە جۆرێکی یەک ئاهەنگ کاریگەریەتی بەرامبەریان لەسەر یەکتر داناوە. بۆ گێڕانەوەیەکی میکانیکی سەرەتا دەبێ ئەو بەشانە دەربخرێن کە لەسەر یەکتر کاریگەریەتی دادەنێن. ئەگەر دیسیپلین و ڕێکی ئەو بەشانە بە تایبەتمەندی بەرتەسک و دیاریکراو لە بەردەستدا نەبێت، باسکردن و پێناسەی میکانیکی بێ مانا دەکەوێت. بە بناغەدانانی بوونی میکانیزمی زاوزێکردن یان خودپاراستن لەوە دەچێت کە شتێکی بێ واتامان بە پایە و بناغە دانابێت. برێجار فیزیۆلۆژیستەکان زاراوەگەلی بێ مانا بە کاردەهێنن، بەڵام چەمکێکی ئەوەندە بێ واتا وەک"میکانیزمی زاوزێکردن"هەر نییە. هەر میکانیزمێک وێدەچێت لە میکانیزمی باوک یان دایکدا هەبێت کە لەناو پرۆسەی زاوزێکردندا نەبێت. دەبێ خۆی لە جیلی نوێدا خۆی ببوژێنێتەوە لەبەرئەوەی کە ئۆرگانیزمی باوک یان دایک تەنها لە زەڕەیەکی بچووک لە جەستەی خودی ئەوانەوە دروستکراوە.

ئـەم بـاوەڕە کـە میکانیزمێـک بـوونی هـەیـە و بـە شـێوەی بـەردەوام لـە ستراکچێری خۆی پارێزگاریی دەکات و هاوشـێوەکەی دروست دەکات لـە نـاخی خۆیـدا دژایـەتـی هـەیـە. ئـەو مکانیزمـەی کـە وەک خـۆی سـاز دەکاتەوە، میکانیزمێکە کە دەبێ بەشگەلی جیای نەبێت و لەبەرئەوەی کە ئەوە راست نییە کەواتە ئیتر میکانزیم نییە".

ژیان دیاردەیەکی بێ هاوتا و تاقانەیە کە چەمکی میکانیزم شایستەیی لێکدانەوە و شیکاریی ئەوەی نییە. بە وتـەی **دریش** کە زیندەوەرناسێکی بەرجەستەیە،"گشتیەتی راستەقینـەی ژیـان"جۆرێک یـەکیـەتییـە و ئـەگـەر لـە روانگەیەکی دیکەوە سـەیر بکرێت لـەخـۆگری چـەندایـەتـی و زۆرئـەژمـاری دەبێت. هـەمـوو پرۆسـەکانی گـەشـەکردن مـەبـەستێکی سـازگاریان لـەگـەڵ دەوروپشتیاندا هەیە. ئەم سازگاربوونە یـان بـە دروسـتبوونی خـودی تـازە پێکهاتووە یان لە گۆڕانکاریی عادەتە کەونـەکانـەوە سـاز بـووە کە خـاوەنـی پرەنسیپ و رەوشتی تایبەتە و تێگەیشتن لـەوە لـە توانـای ماشـینێکدا نییـە. خاوەنـی پـرەنـسیپ بـوون بـەو واتایـە کـە سـەرچاوەی چالاکیـەکانی بێجگـە لەوەی کە بگەڕێنیەوە بۆ رابردووی دووری، شی ناکرێتەوە. کـەواتـە دەبـێ بنچینە و بناغەکـەی کـە لـە نـاو واقیعێکـی مـەعنـەویدایـە بدۆزرێتـەوە، بـەڵام دۆزینەوەی ئەم بابەتـە بـە هـیچ جـۆرە لێککردنـەوە و شـیکاریی ئـەزمـوونی فەزا یان مادە مسۆگەر نابێت.

بەم شێوەیە دەردەکەوێت کە ژیان بابەتێکی ژێر بناغـە و بنـەڕەتـی و لـەپێـشترە بـەنیـسبەت پرۆسـە فیزیـایی و کیمیاییـە بـاوەکانـەوە. ئـەم پرۆسانە دەکرێ تـەنها وەک جۆرێک رەفتاری چـەقبـەستوو و فۆرمـدار لەناو دەورەیەکی کامڵبوونی درێژخایەندا بخرێتـە بـەر سـەرنج و موتـالا. بـەدەر لـەوە ناولێنـانی چـەمکـە میکانیکییـەکـان لـەسـەر ژیـان لـەخـۆگری قبووڵکردنی ئەم تیۆرەیـە کـە عـەقڵ خـۆی بـەرهـەم و ئاکامی کامڵبوونـە.

ئەم باوەڕە زانست دەکێشێنێت بەرەو دژایەتی و شەڕکردن لەگەڵ بناغەی عەینی توێژینەوە و لێکۆڵینەوە کە تایبەتمەندیەکەیەتی. سەبارەت بەم باسە بەشێک لە نووسراوێکی **ویلدن کار** دەگێڕمەوە کە بە ئاشکرا سەبارەت بەم دژایەتییە قسەی کردووە:

"ئەگەر عەقڵ بەرهەمی کامڵبوونە، کەواتە گشت چەمکی میکانیکی سرووشت و بناغەی ژیان پوچ و بێ واتایە ئەو مەبنایەی کە زانست قبووڵی کردووە، دەبێ بەشێوەیەکی جیددی بخرێتە بەر هەڵسەنگاندنی دووبارە. دەبێ ئەم بابەتە باس بکەین کە ئەو پارادۆکسەی کە لەخۆیدا هەڵیگرتووە ئاشکرا بکرێت. چۆن عەقڵ دەتوانێت وەک لایەنی وەرگری واقیع کامڵبووی شتێک بێت کە خودی ئەو شتە تەنها وەک ئابسترەیەک لەو لایەنەی وەرگری واقیعە کە عەقڵە، پێک دێت؟

ئەگەر عەقڵ لە ژیانەوە کامڵ بووە، کەواتە چەمکی ژیان کە دەتوانێت عەقڵ وەک لایەنێکی بەرچاوی فەهمی واقیع کامڵ بکات، دەبێ چالاکیەکی بەرچاوتری لە هەر حەرەکەیەکی میکانیکی ئابسترە هەبێت. حەرەکەیەک کە عەقڵ دەتوانێت بە لێکدانەوە و شیکاریی ناوەرۆکی درک  کارەکەی بۆ خۆی پێناسە بکات. بەدەر لەوە، ئەگەر عەقڵ بەرهەمی کامڵبوونە ئیتر ناتوانێت رەها بێت، بەڵکو پەیوەندی بە رادەی چالاکی ئەو هۆکارەوە هەیە کە ئەوە کامڵ دەکات. لەوەها بارودۆخێکدا چۆن زانست دەتوانێت لایەنی زەینی ئاگایی و زانین لەبەرچاو نەگرێت و تەنها ئەو شتەی کە عەینییە و دەبیندرێت بە بابەتی رەها بزانێت و بناغەی خۆی لەسەر دابڕێژێت؟ پێویستە کە زیندەوەرناسیی دووبارە هەڵسەنگاندنێک بکات لە بنەمای زانستی خۆیدا".

ئێستا هەوڵ دەدەم کە لە رێگەیەکی دیکەوە دەستمان بگاتە سەرتربوونی ژیان و ئەندێشە و بە لێکدانەوەکانمان کە لەسەر ئەزموون

دامەزراوە، ئێوە هەنگاوێک بەرەوپێش بەرم. ئەم کارە تیشکێکی زیاتر دەخاتە سەر بالا بوون و مەزنایەتی ژیان. هەروەها روانینی ئێمە بەرفراوانتر دەکات سەبارەت بە چییەتی و بوونی ژیان وەک هۆکاری بزوێنەری رەوان. ئەوەمان بینی کە پرۆفیسۆر **وایتهد**، جیهان وەک بابەتێکی ڕاوەستاو نەگۆڕ لێک ناداتەوە، بەڵکو بە ئاوێتەیەک لە ڕووداوەکان و ئەو واقیعانەی دەزانێت کە گەڕیانی ئافراندنی بەردەوام، خەسڵەت و تایبەتمەندیەکەیەتی. رەنگە ئەمە چییەتی تێپەڕینی دنیا بێت لە ناو لانکەی زەمەندا. یان سەرترین لایەنی لێکدانەوە بێت کە بەتایبەتی قورئان جەختی لەسەر دەکاتەوە. من هیوادارم کە توانایی ئەوەم هەبێت کە لە کۆتاییدا، باشترین رێگە پیشان بدەم بۆ گەیشتن بە چییەتی نیهایی واقیع. بەرلەوە سەرنجتان رادەکێشم بۆ هەندێ لە ئایەتەکان ( ٢:١٦٤، ٣:١٩٠، ٢٤:٤٤) کە سەبارەت بەو خاڵانەیە. لەبەرئەوەی کە ئەم بابەتە گرنگایەتیەکی زۆری هەیە، لێرەدا چەند نموونەیەکیتر باس دەکەم:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((إِنَّ فِي اخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَمَا خَلَقَ اللّهُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَّقُونَ)). واتە: "**بە ڕاستی لە جیاوازی نێوان شەو و رۆژ و ئەو شتانەی کە خودا لە ئاسمانەکان و زەویدا خوڵقاندوویەتی، بۆ ئەو گروپەی کە خۆپارێزیی دەکەن، ئامۆژگاریی هەیە**". (سورەتی یونس، ئایەتی ٦).

خوای گەورە دەفەرموێت: ((وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ خِلْفَةً لِّمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُوراً)). واتە: "**هەر ئەوە کە شەو و رۆژی بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێت پەندوەرگرێت و دەیەوێ سپاسگوزار بێت، بە پێچەوانەی یەک دانا**". (سورەتی الفرقان، ئایەتی ٦٢).

خوای گەورە دەفەرموێت: ((أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى وَأَنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ)). واتە: "**مەگەر نابینی کە خودا شەو دەکاتە رۆژ و رۆژ بە شەو و هەتاو و مانگی خستۆتە خزمەت کە هەرکامێکیان ماوەیەک هەن و خودا لەو کردەوانە ئاگادارە کە ئێوە دەیکەن**". (سورەتی لقمان:٢٩).

خوای گەورە دەفەرموێت: ((وَلَهُ اخْتِلَافُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ)) واتە: "**جیاوازی نێوان شەو و رۆژ تایبەت بەوە...**". (سورەتی المؤمنون، ئایەتی ٨٠).

ئایەتی دیکەش هەن کە پیشاندەری بەراوردی رێژەیی ئێمەن لە زەمەن و گریمانەی هەبوونی لایەنگەلێکی خودئاگایی دەهێننە ئاراوە. من خۆم ئاوەهام پێ باشە کە بە یارمەتی وەرگرتن لە لایەنی خووپێگرتوو، بەڵام زۆر قووڵی ئەزموون کە لە ئایەتە ئاماژەپێکراوەکاندا ئیشارەتی پێکراوە باسی بابەتەکە بکەم. لەناو نوێنەرانی ئەندێشەی هاوچەرخدا **برگسۆن** تەنها بیرمەندێکە کە سەبارەت بە دیاردەی بەردەوامیی لە ناو زەمەندا لێکۆڵینەوەیەکی زیرەکانەی کردووە. سەرەتا بە کورتی باسەکەی ئەو سەبارەت بە بەردەوامیی بۆ ئێوە شەرح دەکەم و پاشان بێتوانایی لێکدانەوە و شیکارییەکەی ئەوتان پیشان دەدەم، لەبەرئەوەی کە باوڕێکی سەرتر و کامڵتر کە سەبارەت بە لایەنی ناسەقامگرتووی بوون باسکراوە بهێنێتە ئاراوە. بابەتێک کە سەبارەت بە بوونناسیی لە بەرامبەر ئێمەدایە ئەمەیە کە چۆن زاتی نیهایی بوون و ژیان پێناسە بکەین. گومانێک لەوەدا نییە کە جیهان لە زەمەندا تێپەڕ دەبێت، بەڵام لەبەرئەوەی کە جیهان لە دەرەوەی ئێمەدا هەیە وێدەچێت کە بە نیسبەت بوونەوە گومانی تێدا بکەین. بۆ ئەوەی کە لە چەمکی تێپەڕینی جیهان لە ناو زەمەندا بە تەواوەتی تێبگەین دەبێ لە ناو بارودۆخێکدا

بین تاکو ئەم ئیمتیازە تایبەتەی بوون کە بە هیچ شێوە گومانی لێ ناکرێت و لە ڕوانینی راستەوخۆی بەردەوامیی زەمەندا متمانەی پێ دەکەین، بخەینە بەر موتالا.

ئێستا تێگەیشتنی "من" لەو شتانەی کە لە بەرامبەرمدا هەن، دەرەکی و رواڵەتییە، بەڵام تێگەیشتنی من لە بوونی خودی دەروونی، زاتی و قووڵە. کەواتە ئەمە بەو مانایە کە ئەزموونی پشتبەستوو بە خودئاگایی هەمان حاڵەتی بێ وێنە هەیە کە لەوێدا پێوەندێکی بێ بڕانەوەمان لەگەڵ واقیعدا هەیە، ئەگەربێتو لێکدانەوەیەکمان هەبێت لەم ئیمتیازە تایبەتە وێدەچێت کە خەرمانێک لە ڕووناکی بپرژێتە سەر چەمکی نیهایی بوونەوە. کاتێک کە سەیری ئەزموونی خودئاگای خۆم دەکەم، چ شتێک دەدۆزمەوە؟ بەپێی وتەکەی **برگسۆن**: "لە حاڵەتێکەوە دەڕۆم بۆ حاڵەتێکیتر. گەرمم یان ساردم. شادمانم یان غەمگینم. یان خەریکی ئیشێکم یان بێ کارم. یان سەیری دەوروپشتم دەکەم یان دڵم لە شوێنیکیترە. حەواس، هەستەکان، مەیلەکان، وێنەکان و بابەتەکانی دیکە ئەو گۆڕانکارییانەن کە بوونی من دابەش بۆتە هەرکام لەوانە و هەرکامیان بە نۆبەی خۆیان نەخشێکی لەسەر دادەنێن. کەواتە من بەردەوام دەگۆڕدرێم".

لە ژیانی ناوەکی و ناخی من هیچ شتێک چەقبەستوو نییە و گشتی ئەوانە لە گۆڕانکاریی بەردەوامدایە و گەڕیانی بەردەوامی حاڵەتەکانە. حەرەکەیەکی بێ راوەستانە کە هیچ ڕاوەستاویی و مانەوەیەکی تێدا نییە. بەهەر شێوە گۆڕانکاریی بەردەوام بێ لەبەرچاوگرتنی زەمەن درک پێناکرێت. بەم شێوەیە بوون یان خودئاگا لە قیاس لەگەڵ ئەزموونی دروونی ئێمەدا مانای ژیان لە ناو زەمەندا دەدات. کە بەقووڵی ورد دەبینەوە لەناو زاتی ئەزموونی خودئاگادا، بۆمان ئاشکرا دەبێت

که"خود"له ژیانی ناوەکی و ناخی خۆیدا لە سەنتەرەوە بەرەو دەرەوە حەرەکە دەکات. وەک ئەوەی دوو لایەنی هەبێت کە یەکێکیان وەک وەرگر و درک کار و ئەویدی وەک کارا دەردەکەوێت. ئەو لایەنەی کە کارایە لەگەڵ ئەو شتەی کە عالەمی شوێنی ناودەنێین، لە پێوەندیدایە. خودی کارا بابەتی ئەندێشە بیرهێنەرەوەکانە لە دەروناسیدا. واتە ئەو خودەی کە بەپێی راهاتن کار دەکات و لە ژیانی رۆژانەدا لەگەڵ دیسیپلینی شتە دەرەکیەکاندا بەرەو رووە. ئەم شتە دەرەکیانە حاڵەتە تێپەڕبووەکانی خودئاگایی و شعووری ئێمە دەستنیشان دەکەن و تایبەتمەندی جیاکاریی شوێنەکەیان کاریگەریەتی دادەنێت لەسەر ئەم حاڵەتانە. لێرەدا"خود"وەک ژیانی ناوەکی خۆی لەدەرەوەی خۆشیدا دەژی و لەهەمانکاتدا کە وەک گشتییەتێک یەکگرتوویی خۆی دەپارێزێت، خۆی زیاتر لە ریزێک حاڵەتی دیار و شیاویی بژاردن نیشان نادات. هەربۆیە زەمانێک کە"خودی کارا"لەوێدا بەسەری دەبات زەمەنێکە کە ئێمە نیسبەتی کورت یان درێژی پێ دەدەین و جیاکردنەوەی لە شوێن زۆر دژوارە. ئەم زەمەنە وەک هێڵێکی راست دەتوانین بهێنینە بەرچاو کە لە خاڵگەلێکی شوێن دروست بووە و هەروەک ماڵە جیاوازەکان لە گەڕیانی سەفەرێکدا لەیەکتر جودان. لەحاڵێکدا کە بەپێی باوەڕی **برگسۆن** زەمەنێک کە بەم شێوەیە باسی لێدەکرێت، ئیتر زەمەنی حەقیقی نییە. بوونێک کە لەناو زەمەندا خاوەن شوێن بێت، بوونێکی درۆیە. بە لێکدانەوەیەکی قووڵتر، لە ئەزموونی خودئاگا شتێکمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە من بە لایەنی وەرگر و درککراوی"خود"ناوی لێدەبەم. بە وەرگرتنی دیسیپلینی بابەتە دەرەکیەکان کە بارودۆخی ئێستای ئێمە داوای دەکات، روانینێکی ساکار بۆ"خود"ی درککار، ئیشێکی زۆر دژوارە. لە هەوڵی بەردەوامی خۆمان

بۆ تێگەیشتن لە شتە دەرەکیەکان جۆرێک حیجاب بەدەوراندەوری "خود"ی درککارمان دەتەنین کە بەم شێوەیە بابەتەکە بە تەواوەتی بۆ ئێمە نامۆ دەبێت. ئێمە تەنها لەوکاتانەی بیرکردنەوەی قووڵ و کاتێک کە"خود"ی کارا کەوتۆتە ناو نادیاریی و حاڵەتێکی بێ دەرەتان، دەچینە ناو خودی قووڵترمانەوە و دەگەینە ناخی ئەزموون. لە پرۆسەی ژیاندا ئەم منە قووڵترە و حاڵەتەکانی خودئاگایی لە یەکتردا دەتوێنەوە. یەکگرتنی منی درککار، لە یەکگرتنی ناو نوتفەیەک دەچێت کە ئەزموونەکانی یەک بەیەکی پێشینیان لەوەدا هەیە، بەڵام نەک لە شێوازی زۆرینەدا، بەڵکو وەک یەکیەتیەک کە هەر ئەزموونێک لە گشتیەتیدا جێگر دەبێت. لە ناو ئەو گشتیەیەتەی مندا، حاڵەتە دیار و روونەکان بوونیان نییە کە بکرێت ژمارە بکرێن و زۆربوونی توخمەکانیشی بە تەواوەتی لە کوالیتەکەیدایە و لە خودی کارا ناچێت. لێرەدا گۆڕانکاریی و حەرەکەیەک لەئارادایە، بەڵام ئەم گۆڕانکاریی و حەرەکەیە دابەش ناکرێت، توخمەکانیان لەیەکتردا دزە دەکەن و تایبەتمەندیەکی بەتەواوەتی نا تەسەلسوولیان هەیە، وادێتە بەرچاو کە زەمەنی "خودی" درککار، "ئێستا"ی تاقانەیە کە خودی کارا لە دانوستانیدا لەگەڵ جیهانی شوێندا، ئەوە وەک رشتەیەک لە مرواری دابەش دەکاتە سەر"ئێستاکان"، کەواتە لێرەدا زەمەن بەردەوامی ڕەهایە کە شوێن، ئەوەی تووشی گۆڕان نەکردووە. قورئان لەم ئایەتانەدا بە گێڕانەوەی سادەی خۆی ئاماژە بە لایەنە تەسەلسوول و نا تەسەلسولەکانی زەمەن دەکات:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((وَتَوَكَّلْ عَلَى الْحَيِّ الَّذِي لَا يَمُوتُ وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِ)) واتە: **"تەوەکول بەو کەسەی زیندوو دەکاتەوە و نامرێ و ئەوە بە ستایشتەوە یاد بکە..."**. (سورەتی الفرقان بەشێک لە ئایەتی ٥٨).

خوای گەورە دەفەرموێت: ((الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ الرَّحْمَنُ)) واتە: **"ئەوەی کە ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لەنێوانیاندایە لە شەش ڕۆژدا خوڵقاند و پاشان جلووسی کردە سەر عەرش و ئەوە خودای بەخشندە..."**. (سورەتی الفرقان بەشێک لە ئایەتی ٥٩).

هەروەها دەفەرموێت: ((إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ)) واتە: **"ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازە خوڵقاندووە"**. (سورەتی القمر، ئایەتی ٤٩).

هەروەها دەفەرموێت: ((وَمَا أَمْرُنَا إِلَّا وَاحِدَةٌ كَلَمْحٍ بِالْبَصَرِ)) واتە: **"فەرمانی ئێمە بێجگە لە یەکێک نییە و هەروەک چاوتروکاندنێکە"**. (سورەتی القمر، ئایەتی ٥٠).

ئەگەر لە دەرەوە سەرنج بدەینە ئەو حەرەکەیە کە لە ناو ئافراندندا دیارە، واتە ئەگەر لە ڕێگەی عەقڵ و هزرەوە لێی تێبگەین، پرۆسەیەکە کە هەزاران ساڵ درێژەی هەبووە. لە چەمکەکانی ناو قورئان و هەروەها تەوراتدا یەک ڕۆژی ئیلاهی دەبێتە هەزار ساڵی ئاسایی. لە بارێکی ترەوە پرۆسەی ئافراندن کە هەزاران ساڵ درێژەی هەبووە کردەوە یان ئەکشنێکی ساکارە کە دابەش ناکرێت و خێراییەکەی دەبێتە چاوتروکاندنێک.

بەهەر شێوە لێکدانەوەی ئەم ئەزموونە دەروونی و بەردەوامییە لەناو ئەم قاڵبی کەلامی ئێمەدا ناگونجێت، لەبەرئەوەی کە زمان لە زەمەنی بەردەوامیی خودی کارای ڕۆژانەی ئێمەدا فۆرمی وەرگرتووە. ڕەنگە باسکردن و وێنە هێنانەوە ئەم خاڵە زیاتر ڕوون بکاتەوە. بەپێی زانستی فیزیا، هۆی هەستکردن بە ڕەنگی سوور بە هۆی خێرایی حەرەکەی شەپۆلی نووری ئەم ڕەنگەوەیە کە فریکانسەکەی لە یەک

چرکەدا دەبێتە چوار سەد بلیۆن. گەر بتانتوانیبا لە دەرەوە شایەتی ئەم ئەم فریکانسە سەرسوورهێنەرەبن، لەهەر چرکەیەکیشدا دوو هەزار دانەتان بژماردایە، ئەوکات زیاتر لە شەش هەزار ساڵ کاتتان پێویست بوو تاکو یەک بەیەکیان ژمارە بکەن. لەحاڵێکدا کە لە کردەوەی زەین و سادەی درککردندا، ئەو حەرەکە فریکانسیە کە بەڕاستی ناژمێردرێت لەیەک کاتدا وەردەگرن. ئاوەهایە کە کردەوەی زەینی، تەوالی دەکات بە سەقامگرتوویی. بەم شێوەیە"خود"ی درککار کەم تاکورتێک چاکسازی"خود"ی کارایە تا ئەو ڕادەیە کە گشت"ئێرە"و"ئێستا"کان لە ناو گشتیەتی کەسایەتیەکی بێ پارادۆکسدا ئاوێتە دەکات. بەم شێوەیە بە لێکدانەوەیەکی قووڵی ئەزموونی خودئاگا دەردەکەوێت، زەمەنی رەها رشتەیەکی پچراو یان چرکەساتی بێ گەڕانەوە نییە، بەڵکو کۆیەکی یەکڕیز و رێکە کە رابردوو لە پەردەی پشتەوەیدا رەهای نەکردووە و هاوکاتی ئەوە حەرەکەی کردووە و لەهەمان حاڵدا هەر لەوێدا کار دەکات. داهاتوو بەم شێوەیە نییە کە وەک بابەتێکی دیاریکراو لەبەردەماندا بێت و هێشتا کاتمان پێویستە تا لەوێوە تێپەڕ بین، هەروەها بەم مانایە کە لە زاتی خۆیدا وەک ئیمکانێکی ئازاد و دەست گەیشتوو بوونی هەبێت. زەمەنی باسکراو کە وەک گشتیەتێکی رێک دەخرێتە بەر باس، هەمان شتە کە قورئان وەک"قەدەر"، یان چارەنووس باسی لێدەکات. وشەیەک کە هەم لە ناو و هەم لەدرەوەی جیهانی ئیسلامدا تووشی خراپ حاڵیبوون بووە. چارەنووس هەمان زەمەنە، بەڵام هێشتا ئیمکانیاتەکەی دەرنەکەوتووە. ئەم زەمەنە لە کۆت و بەندی تەسەلسوولی هۆ و بەرهۆ ئازادە. تایبەتمەندیەک کە پێویستیی ناسینی لۆژیکە. گەر بابەتەکە کورت بکەمەوە دەبێ بڵێم کە زەمەن ئەوەیە کە هەستی پێدەکرێت نەک ئەوەی کە بیری لێدەکرێتەوە یان حسێب

دەکرێت. ئەگەر پرسیار لە من بکەن کە بۆچی ئیمپراتۆر هومایون و شا تەهماسبی یەکەم پادشای ئێرانی هاوچەرخ بوون، هیچ وەڵامێکی پشتئەستوور بە هۆ و بەرهۆم نییە کە بۆتان باس بکەم. رەنگە تەنها وەڵامێک کە بتوانم بیدەمەوە ئەمە بێت کە خەسڵەتی واقیع وای پێش هێناوە تاکو لە نێوان ئیمکانیاتە بێ سنوورەکانیدا دوو ئیمکانی ناسراو وەک ژیانەکانی هومایون و شا تەهامسب دەبوا لە یەک زەمەنی دارێژراودا هەبن. زەمەن کە ناوی چارەنووسی لێدەنرێت هەمان بابەتە کە جەوهەری شتەکان پێک دەهێنێت. بەو شێوەیە کە قورئان باسی دەکات: ((إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ))

"**خودا گشت شتەکانی خوڵقاند و بۆ هەرکامیان سنوور و رادەیەکی لەبەرچاو گرت**".(سورەتی القمر: ٤٩)

بەم شێوەیە چارەنووسی شتەکان، قەدەرێکی بێ بەزەییانە نییە کە وەک خاوەن کارێک لەدەرەوە ئیش بکات، بەڵکو مەیلی لەسەر ناخی شتەکانە. ئەو ئیمکانیاتە خاوەن وزانەی کە لەناو ناخییدا خەوتووە، بە دوای یەکدا و بێ هیچ هەستکردنێک بە جەبر یان گووشار دەبنە کردەوە. کەواتە گشتیەتی بنەڕەتی بەردەوامیی بەو مانایە نییە کە ڕووداوە شکڵگرتووەکان دەبێ بە هەمان شێوە ڕوو بدەن. لە ناو منداڵدانی واقیعدا خەوتوون و وەک دانە بەرد و زیخەکان یەک بە یەک دەڕژێنە ناو کاتژمێری زەمەنەوە. ئەگەر زەمەن راستەقینەیە و تەنها چرکە هاوشێوەکان ڕەها نین کە ئەزموونی خودئاگا بکەن بە فریوێک، هەر چرکەساتێک لە ژیانی واقیعدا ڕەسەنە. ژیان دەبەخشن بە هەرچی کە بە شێوەیەکی رەها تازە و پێشبینی نەکراوە. قورئان دەڵێت:((كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ)) "**ئەو هەر رۆژەو لە کارێکدایە**"(سورەتی الرحمن: ٢٩).

بوون لەناو زەمەنی واقیعیدا بە واتای ئەوە نییە کە لە کۆت و بەندی زەمەنی تەسەلسوولیدایە، بەڵکو بە مانای ئافراندنیەتی لە ساتێکەوە بۆ ساتێکیتر و داهێنەرایەتی. لەڕاستییدا هەر چالاکییەکی داهێنەرانە چالاکییەکە کە بە ئیختیاری کەسەکان دەکرێت. ئافراندن دژوازیی هەیە لەگەڵ دووپاتکردنەوە و دووبارەکاریی کە تایبەتمەندی هەر کردەوەیەکی میکانیکییە. هەربۆیە شیکاریی هەر چالاکییەکی داهێنەرانە و ژیانبەخش بە چەمکە میکانیکیەکان ئەستەمە. زانست بە دوای یەک شێوەیی ئەزموون واتە دارشتنی یاساکانی دووپاتکاریی میکانیکییە. ژیان بە مەیلێکی زۆر بۆ ئەوەی هەڵقوولاویی خۆی بێت، پێکهێنەری سەنتەری سرینەوەی جەبرە. بەم شێوەیە لەدەرەوەی دەڤەری پێویستیی و جەبردایە، هەربۆیە زانست ناتوانێت لە ژیان تێبگات. زیندەوەرناس کە بە شوێن دۆزینەوەی پێناسەی میکانیکییە بۆ ژیان، بۆیە بەم ڕێگەیەدا دەڕوات کە موتالا و توێژینەوەکانی بەرتەسک دەکاتەوە بۆ شکڵە خوارەوەکانی ژیان کە بارودۆخ و رەفتارەکانیان لێکچوونی هەیە لەگەڵ کردەوەی میکانیکییدا. ئەگەر ئەم بیرمەندە زیندەوەرناسە، ژیان بەو شێوەیە کە لەناو خۆیدا دەردەکەوێت بخاتە بەر هەڵسەنگاندن، واتە زەینی خۆی کە بە شێوەی ئازاد هەڵدەبژێرێت، لادەبات و بیری قووڵ دەکاتەوە و ئێستا و رابردوو هەڵدەسەنگێنێت و داهاتوو وێنا دەکات. هەروەها دەیخاتە بەر شیکاریی و موتالا، دیارە قەناعەت دەهێنێت بەوەی کە دەرئەنجامە میکانیکیەکانی ئەو، کارامە نین.

بەم شێوە بۆمان روون دەبێتەوە کە جیهان لە قیاس لەگەڵ ئەزموونی خودئاگای ئێمەدا حەرەکەیەکی داهێنەرانە و موختارە، بەڵام چۆن دەتوانین حەرەکە بە جیا لە شتێکی واقیعی کە لە حەرەکەدایە وێنا بکەین؟ وەڵام ئەوەیە کە چەمک و ڕوخساری لۆژیکاڵی شتێک

لەسەر"جیاکاریی"دامەزراوە، دەتوانین حەرەکە لە شتەکان جیا بکەینەوە، بەڵام ناتوانین لەو شتانەی کە هێشتا بێ حەرەکەن، حەرەکەکەیان لێ بستێنینەوە و جیای بکەینەوە، ئەگەر بۆ وێنە وایدابنێین کە زەڕە مادییەکان وەک ئەو زەڕە بچووکانەی کە بە باوەڕی **دیمۆکریتۆس** هەرگیز جیا ناکرێنەوە، واقیعی ڕاستەقینە بن، کەواتە دەبێ حەرەکە وەک شتێک کە لەگەڵ زاتی ئەوانەدا نامۆیە و لەدەرەوەی خۆیاندا دەسەپێت بەسەریاندا لەبەرچاو بگرین. لە حاڵێکدا کە ئەگەر حەرەکە وەک بنەڕەتێک قبووڵ بکەین رەنگە بتوانین شتە ڕاوەستاوەکان لەوە جیا بکەینەوە. لە ڕاستییدا زانستی فیزیای نوێ، گشت شتەکان شیاوی گۆڕینەکان بە حەرەکە دەزانێت. سرووشتی پێکهێنەری ئەتۆم لە زانستی نوێدا ئیلێکتریسیتەیە نەک شتێک کە کارەبای پێدرابێت. بەدەر لەم بابەتە، ئەزموونکردنی راستەوخۆ و بێ واسیتە، سنووری شتەکان بەو شێوەیە کە پێشتر بوون دەرناخات. لەبەرئەوەی کە ئەزموونی بێ واسیتە پێوەندیەکە بێ ئەوەی کە هیچ لێکدانەوەیەکی تێدا بێت. ئەو بابەتانەی کە بە شتەکان ناویان دەبەین، ڕووداوگەلێکن لە پێوەندی لەگەڵ سرووشتدا کە ئەندێشە چەمکی شوێن لە ناخیاندا دادەنێت و بەم شێوە بۆ مەبەستە زانستیەکان و وەک شتی جیا لە یەکتر دەیخاتە بەر سەرنج.

ئەو جیهانەی کە لەبەرچاوی ئێمەدا وەک گشتیەتێک لە شتەکانە، کەرەستەیەکی جامد نییە کە بەشێک لە بۆشایی پڕ کردبێتەوە. جیهان شتێک نییە، بەڵکو جیهان کردەوەیەکە. بەپێی باوەری **برگسۆن**، ئەندێشە تایبەتمەندی تەسەلسوولی هەیە کە ناتوانێت سەروکاری لەگەڵ حەرەکەدا بێت. مەگەر ئەوەی کە وەک ریزێک لە خاڵە چەقبەستووەکان ببیندرێت. ئەمە تایبەتمەندی ئەندێشەیە کە بە چەمکە ڕاوەستاوەکان ئیش دەکات و بەو شتەی کە لە بنەڕەتی زاتی خۆیدا گەشەکراو و

بگۆڕە و ڕووکەشێک لە تەسەلسوولی حەرەکەنەکردنی پێدەبەخشێت. پێکەوەبوون و تەوالی ئەم خاڵە چەقبەستووانە، سەرچاوە و ژێدەری هەمان شتە کە پێی دەوترێت شوێن و زەمەن.

بەپێی باوەڕی **برگسۆن** واقیع وەک ئیرادەی هێزێکی داهێنەرانە، بگۆڕێکی ئازاد و موختارە. پێشبینی ناکرێت و ئەندێشە واتای شوێنی پێ دەبەخشێت و وەک زۆرینەیەک لە شتەکان چاوی لێدەکات. لێرەدا مەجالی ڕەخنەگرتنی تەواو لەو بوارە نییە. هەر ئەمەندە بەسە کە بوترێت ژیانخوازیی **برگسۆن** لە ناو دوالیتەی بێ ئاکامی ئیرادە و ئەندێشەدا کۆتایی پێ دێت و هیچکامیان بەسەر ئەویتردا زاڵبوون و بەرزاییان نییە. ئەمە بە هۆی ئەو ئیدە ناتەواوەیە کە ئەو سەبارەت بە عەقڵ هەیەتی. بە باوەڕی ئەو عەقڵ بابەتێکی خاوەن شوێنە کە تەنها بەسەر مادەدا شکڵی هەیە و تەنها مەقوولاتی میکانیکی لە ئیختیاری خۆیدا هەیە، بەڵام بەهەمان شێوە کە لە یەکەمین لێدوانی خۆمدا باسم لێکرد، ئەندێشە حەرەکەیەکی قووڵتریشی هەیە، ئەوکاتەی کە وا دێتە بەرچاو کە واقیع وەک شتگەلێکی بچووکی ڕاوەستاو پیشان دەدات، لە واقیعدا ئەرکە ڕاستەقینەکەی ئاوێتەکردنی توخمەکانی ئەزموونە بۆ ئەوەی بەکارهێنانی ئەو مەقوولاتەی کە ئەزموون لە ئاستە جیاوازەکانیدا پیشانی دەدات، هاوسان بێت. ئەندێشە بە هەمان رادە ئۆرگانیکە کە ژیان. حەرەکەی ژیان هەروەک گەشەکردنی ئۆرگانیک، قۆناغە جیاوازەکانی ئاوێتەبوونی گەشەی بەردەوامی بەدواوەیە. بێ ئەم ئاوێتەبوونە لە گەشەکردن و پەرەسەندنی ئۆرگانیک دوور دەکەوێتەوە. دەرەنجامەکانن کە حەرەکەی ژیان دیار و ئاشکرا دەکەن. هەبوونی ئەم دەرەنجام و مەبەستانە بەم واتایە کە عەقڵ دزەی تێکردووە و چالاکی عەقڵ بێ بوونی مەبەستەکان ئەستەمە. لە ئەزموونی خودئاگادا ژیان و

ئەندێشە لە ناو یەکتردا ئاوێتە دەبن و یەکگرتنێک شکڵ دەدەن. کەواتە چییەتی ڕاستەقینەی ئەندێشە لەگەڵ ژیاندا هاوسانە. لەلایەکیترەوە بە باوەڕی **برگسۆن** پەڕینەوەی بەرەوپێشەوەی هێزی ژیان لە ئازادی داهێنەرانەی خۆیدا بە تیشکی ئەنجامی ڕاستەوخۆ یان ئەوەی کە دوورەدەستە، ڕووناک و دیار نابێت. ئەم هێزە بە شوێن ئەنجامێکەوە نییە، بەڵکو ڕەفتارەکەی بە تەواوەتی لە ئیختیاریدایە، بێ لایەنە، بێ دیسیپلینە و پێشبینی ناکرێت.

بەم شێوەیە کە ڕەفزکردنەوەی لێکدانەوەکەی **برگسۆن** لە ئەزموونی خودئاگا ئاشکرا دەبێت. ئەو وەک ڕابردوویەک سەیری ئەزموونی خودئاگا دەکات کە هاوڕێی زەمەن حەرەکە دەکات و خاوەن کردەوەیە. لەهەمانکاتدا لەوە غافڵە کە یەکگرتنی خودئاگاییش لایەنێکی پێشڕەوی هەیە. ژیان بەدەر نییە لە ریزێک کردەوەی راوەستاو لەسەر سەرنجدان و کردەوەی ئاوێتە لەگەڵ سەرنجیش بێ گەڕانەوە بۆ دەرەنجامی خودئاگا و ناخودئاگا، لێکدانەوەی بۆ ناکرێت. تەنانەت کردەوە درک کراوەکانی ئێمەش دەرخەری مەبەست و بەرژەوەندیە کاتییەکانمانن. عارفی **شیرازی** سەبارەت بەم باسە لە ئیدراکی مرۆیی لێکدانەوەیەکی جوانی هەیە. ئەو دەڵێت:

**ز نقض تشنه لبی دان به عقل خویش مناز**

**دلت فریب گر از جلوه سراب نخورد**

شاعیر دەیەوێت بڵێت کە ئەگەر مەیلێکی زۆرتان بۆ خواردنەوەی ئاو هەبێت، زیخ و ڕمڵەکانی بیابانیش بە گۆمێک ئاو دەزانن، بەڵام ئەگەر لەم فریوە دەرباز بوون بە هۆی ئەوەیە کە لە تینوویەتی زۆر رزگار بوون. ئەگەر بەو شێوەیە لە شتەکان تێگەیشتوون کە دەیبینن بە هۆی ئەوەیە کە بۆ تێگەیشتنەکەی بەو شێوەیە کە پێویست بووە بەردەوام

نەبوون، کەواتە مەبەستەکان و دەرەنجامەکان چ بە شێوەی مەیلی ئاگایانە بن و چ نیوە ئاگا، تان و پۆی ئەزموونێکی خودئاگا پێک دەهێنن. چەمکی دەرەنجام بێجگە لە گەڕانەوە بۆ داهاتوو درک ناکرێت. بێ هیچ گومانێک رابردوو لە ناو ئێستادا ئارام دەبێت و لەوێدا ئیش دەکات، بەڵام ئەم کردەوەی رابردوو لە کاتی ئێستادا شموولی هەموو خودئاگاییەکە ناکات. توخمی دەرەنجام جۆرێک لە ڕوانین و سەرنج بەرەو پێشەوە لە ناو خودئاگادا ئاشکرا دەکات. دەرەنجامەکان نە تەنها حاڵەتەکانی ئێستای خودئاگایی ئێمە دەردەخەن، بەڵکو ریگەی داهاتووش ئاشکرا دەکەن. لەڕاستییدا ئامانج و مەبەستەکانن کە پێکهێنەری بزوتنەوەی ژیانن و بەمشێوەیە پێشبینی ئەو حاڵەتانەی کە هێشتا پێکنەهاتوون دەکەن و کاریگەریەتییان لەسەر دادەنێن. کاتێ شتێک بە ئامانج و مەبەستێکەوە ئاشکرا دەبێت و دەردەکەوێت، بە واتای ئەوەیە کە لەمەبەدوا شتەکەی داهاتووش ئاشکرا دەبێت. بەمشێوەیە رابردوو و داهاتوو هەردووکیان لە حاڵەتی خودئاگایی ئێستادا کار دەکەن. داهاتوو بەو شێوەیە کە **برگسۆن** لە ئەزموونی خودئاگا باسی لێدەکات بابەتێکی بێ متمانە نییە. حاڵەتێکی زیرەکانەی تێکەڵ بە ڕوانین، هەم بیرەوەری و هەم زەین وەک دوو هۆکاری کاریگەر ئاوێتە دەکات و پێویستی بەوانەیە. کەواتە واقیع بە نیسبەت ئەزموونی نەستەوە، خوازەیەکی کوێر نییە کە بە تەواوەتی لە تیشکی ئەندێشە بێبەش بێت، بەڵکو سرووشتێکی بە تەواوەتی ئەنجام ناسانەی هەیە.

**برگسۆن** تایبەتمەندی ئەنجامناسیی واقیع قبوڵ ناکات بە هۆی ئەوەی کە زەمەن دەکاتە ناواقیع. بەپێی وتەی ئەو، دەروازەکانی داهاتوو دەبێ لە بەرامبەر واقیعدا بە تەواوەتی کراوە بن. ئەگەرنا واقیع

نە موختار دەبێت و نە داهێنەر. ئەگەر مەبەست لە ئەنجامناسیی دۆزینەوەی نەخشەیەک بێت بۆ گەیشتن بە ئاکام یان ئەنجامێکی لەوە پێش داڕێژراو، ئەوە گومانی تێدا نییە کە زەمەن دەبێتە ناواقیع. جیهان دەگۆڕێ بۆ بینا یان تەرحێکی هەمیشەیی کە زاوزێ دەکات و ناسەقامگرتووە. وەک ئەوەی کە ڕووداوە تاکیەکان شوێنە تایبەتیەکانی خۆیان لەوە پێش دۆزیبێتەوە و چاوەڕوان بن هەتا نۆبەیان دێت و لەگەڵ گەڕیانی زەمەنی مێژوودا پێوەند بدرێن. هەموو ئەوانە لەوەپێش لە شوێنێک لە هەرمانییدا هەن و بەم شێوەیە تەرتیبی زەمەنی ڕووداوەکان شتێک نییە بێجگە لە لاساییکردنێکی ڕەها لە قاڵب و دیسیپلینێکی هەمیشەیی. بە دژواریی دەکرێت لە نێوان ئەم تیۆرە و تیۆری کوانتۆمدا کە پێشتر ڕەفزمان کردبووەوە، جیاوازی دابنێین. لەڕاستییدا جۆرێک مادەخوازیی شاراوەیە کە لەوێدا قەدەر یان چارەنووس جێی جەبرخوازیی ڕەهای گرتۆتەوە و هیچ ڕوانگەیەک لە بەرامبەر ئازادی مرۆیی یان ئازادی ئیلاهی دانانێت. ئەگەر جیهان وەک پرۆسەیەک لەبەرچاو بگیردرێت کە مەبەستێکی لەوە پێش بکاتە واقیع، ئیتر جیهانێکی موختار و هۆکارە ئەخلاقییەکانی بەرپرس نابن بەڵکو وەک بوکۆکەگەلێکن کە دروستکراون بۆ ئەوەی کە بە گووشاری دەستێک لە پشتیانەوە حەرەکە بکەن. بە هەموو ئەم باسانەوە ئەنجامناسیی مانایەکی دیکەشی هەیە. بەپێی ئەزموونی خودئاگا بۆمان دەرکەوتووە کە ژیان واتە شکڵبەخشین و گۆڕانی مەبەستەکان و ئاکامەکان و لەهەمانکاتدا بە هۆی ئەوانەوە ڕێنموونی بوون. ژیانی زەینی ئەنجامخوازە، بەو واتایە کە مەبەستێکی دوور بۆ حەرەکە بەرەو ئەوانە بوونی نییە. بیچمگرتنی بەرەبەرەی مەبەست و ئاکامەکان و پلەکانی مەبەستە نوێ و بەرزەکان لە ڕوخساری پرۆسەی ژیاندا گەشە

دەکـات و پـەرە دەسـەنێـت. لـەو شـتەی کـە بـووین، رادەوەسـتین و شوناسـێکی تـازە وەردەگـرین، ژیـان ئـەو پـردەیـە کـە لـە نێـوان ریزێـک مەرگەوە تێپەڕ دەبێت. لەهەمانکاتدا دیسیپلینێک لە پەیوەستەیی ئەم پـردەدا بـوونی هـەیـە. هـەرچـەنـد کـە گۆڕانکـاریی خێـرا سـەبـارەت بـە هەڵسەنگاندنی ئێمە بۆ شتەکان لە ئارادایە، بەڵام قۆناغە جیاوازەکانی بـە شێوازێکی ستراکچێریی لەگەڵ یەکتردا پێوەندیان هـەیـە. مێژووی ژیـانی تاک، بە گشتی یەکگرتنێکە و تەنها رشتەگەلێک لە ڕووداوە بەرامبەرە ناسەرکەوتووەکان نییە. ئەگەر مەبەستمان لە ئەنجام، ئاکامێکی پێشبینی کراو بێت واتە ئەگەر ئەنجامیکی دوور و سەقامگرتوومان مەبەست بێت کـە هـەمـوو جیهـان بـەرەو ئـەو شـوێنە حـەرەکـە دەکـات، وادیـارە کـە پرۆسەی جیهان یان حەرەکە و گەشـەی جیهان لـە زەمـەندا بـەتاڵە لـە ئەنجام. بەم شێوەیە ئەنجام بە وەها واتایەکەوە کە بە جیهانی دەدات لە هەر جۆرە داهێنەرایەتی و خەسڵەتی تایبەت بەتاڵی دەکات. مەبەستەکان و ئاکامـەکـانی پرۆسـەی جیهـان نوقتـەگـەلـی کۆتـایی دەورەیـەکـی پێشکەوتنن. ئەمانە ئەنجام و مەبەستگەلێکن کە روو دەدەن نـەک ئـەوەی کە بڕیارێکی لەوە پێش سەبارەت بـەوانـە گیرابێت. نـاکرێ لـە پرۆسـەی زەمەنی وەک هێڵێکی لەوە پێش راکێشراو تێبگەین. ئەم پرۆسەیـە هێڵێکـە لە خاڵی راکێشاندا کە بەئیمکانیاتی بەربڵاوەوە پەرە دەستێنێت. هـەربۆیـە خاوەنی مەبەستە چونکە تایبەتمەندی هـەڵبژاردنی هـەیـە و لـەهـەمانکاتدا کە زەمەنی رابردوو سـەرلەنوێ دەپارێزێت و کـامڵی دەکـات، خۆشـی لـە زەمەنی ئێستادا دەگەیەنێت بە جۆرێک لە کامڵبوون. بە باوەڕی مـن هـیچ روانینێک زیاتر لەمە لەگەڵ جیهانبینی قورئاندا جیاوازی نییـە کـە بێین و بابەتەکانی عالەم وەک تەرحێکی چەقبەستووی ناسەقامگرتوو لەوە پێش دارێژراو لـەبـەرچـاو بگـرین. هـەروەک پێشتر باسـم کـرد بـەپێی وتـەی

قورئـان، عالـەم دەتوانێـت زیـاد ببێـت، جیهانێکـە گـەشـە کـردوو و نـە بـەرهـەمێک کـە لـەوە پـێش کامڵ بووبێت و خالقەکـەی لـە سـەردەمـی رابردوودا رەهای کردبێت و ئێستا وەک کۆمـەڵـەیـەک لـە کـەرەستەکان کە زەمەن هیچ کاریگەریەتیەکی لەسەر دانانێت و هیچ و پووچە، هـەروا فڕێ درابێت و لە فەزادا کەوتبێت.

هیوادارم ئێستا لە بارودۆخێکدابین کە لە چەمکی ئەم ئایەتە تێبگەیین ((وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ خِلْفَةً لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا)) (سـورەتی الفرقان: ٦٢) **"هەر ئەو کەسە کە شەو و رۆژی خوڵقاندووە دژ بە یەکتر بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێ ئامۆژگاریی وەرگرێت و سپاس بکات".**

لێکدانەوەیەکی رەخنەگرانە لە تەسەلسوولی زەمـەن بـەو جۆرەی کە لە ناو ئێمەدا دەردەکەوێت ئێمە بەرەو ئەو چەمکە دەبات کـە حـەقیقـەتی نیهایی بـە هـەمـان بـەردەوامیی رەهـا بـزانین. لـەوێدا ئـەندێشە، ژیـان و ئەنجام لە یەکتردا دزە دەکـەن تـاکو یـەکیـەتیـەکی بـە سـتراکچێر و رێک دروسـت بکـەن. ئـەم یـەکگرتنـە وێنـا ناکرێـت مـەگـەر ئـەوەی کـە ئـەو یـەکگرتنـە بـە"خـود"بزانین- خودێک کـە عـەینییە و هـەمـوو شـتەکان لـە خۆدەگرێت و سەرچاوەی سەرەکی هەر ژیان و هەر ئەندێشەیەکە.

بـە بـاوەڕی مـن هـەڵـەی **برگسۆن** لێرەدایـە کـە ئـەولـەویـەتی خـود بـەرامبـەر بـە زەمـەنی رەهـا لـەبـەرچـاو ناگرێت، لـە حاڵێکدا کـە تـەنها بەردەوامیی رەهـای جێی بـاوەڕە. نـە شـوێنی رەهـا و نـە زەمـەنی رەهـا هیچکامیان ناتوانن زۆرینەیی شتەکان و ڕووداوەکان لـە یـەک شـوێن و لە یەککاتدا ڕابگرن. ئەم کردەوە ئاگایانە تەنها لـە خـودێکی سـەقامگرتوو و خاوەن بەردەوامیی دەوەشێتەوە کـە دەتـوانێ زۆریـی بـەردەوامیی کـە وەک بـێ ژمـار چرکـەسـاتی لێهـاتووە، بپارێزێت و ڕاییبگرێت، هـەروەهـا بیکات بە گشتیەتێکی رێکی سەنتێزێک. لـە بـەردەوامیی رەهـادا هـەبوون،

واته خودبوون و خودبوونیش واته ئەمەی کە بکرێ بڵێیت: من هەم. تەنها ئەو کەسە دەتوانێت بڵێت کە من هەم کە لە ڕاستییدا هەبێت. ئەم رادەیە لە ناسینی شهوودی خود یان ئەنائیتە کە پلە و پایەی شتێک لە قیاس لەگەڵ جیهاندا دەستنیشان دەکات. ئێمەش دەڵێین: من هەم، بەڵام خودیەتی ئێمە وابەستەیە و لە جیابوونەوەی نێوان خود و ناخودەوە سەرچاوە دەگرێت.

بە وتەی قورئان، خودی نیهایی لە هەموو جیهان بێ نیازە و لای خودا، ئەو خودەی کە ئەویدیە لە ڕوخساری ئەویدیەکی بەرامبەردا دەرناکەوێت. ئەگەر وەها بێت بەو واتایە کە خودی نیهایی وەک خودی موتەناهی ئێمە لە پێوەندی بەردەوامی شوێندا بێت لەگەڵ ئەویدی، کەواتە دەبێتە بەرامبەرەکەی. ئەو شتەی بە عالەم یان ناخودی دەزانین، تەنها چرکەساتێکی خێرا لە ژیانی خودا دایە. خودیەتی ئیلاهی، نا پەیوەستە، سەربەخۆ، بنەڕەتی و ڕەهایە. ئەستەمە گەر بتوانین لە وەها خودێک وێنەیەکی دڵخوازمان هەبێت. هەروەک قورئان باسی لێدەکات:

"هیچ شتێک لەو ناچێت". لەهەمانکاتدا"ئەوە کە بیستەر و بینەرە". ئێستا دەبێ بڵێین کە خودی بێ کەسایەتی واتە خودێک کە رەفتارێکی رێکوپێکی نەبێت و ناکرێ لێی تێبگەین. هەروەک زانیمان جیهان کۆمەڵێکی زەبەلاحی شتەکان نییە کە بۆشاییەکی پڕکردبێتەوە. ئاوێتەیەکە لە ڕووداوەکان و ڕەفتارگەلێکی بە دیسپلین کە بە هۆی ئەم رێکیەوەیە کە دەبێتە خودی نیهایی. نیسبەتی سرووشت بە خودی ئیلاهی وەک نیسبەتی کەسایەتییە بە خودی مرۆڤ. قورئان لە باسێکی بەرجەستە و ڕووناکدا ئەوە بە ئایەت و (سنة الله) دەزانێت. ئێمە لە بارودۆخ و پێگەیەکی وەهاوە لە روانگەی مرۆیی خۆمانەوە ئەو بابەتە بە چالاکی داهێنەرانەی منی ڕەها پێناسە دەکەین.

لـه كـاتێكی تایبـەتـی وردداﺓ، خـود لـه بـەرەوپێـشچوونی خۆمانـدا موتەناهییە، بەڵام لەبەرئەوەی کە خود لەگەڵ شتێکدا پێوەندی ڕێکی هەیە کەواتە داهێنەرە و دەکرێ زیاد ببێت و لە واتایەکدا بەربڵاو بوونی هیچ سنوور و ئاستێکی بۆ نییە.

ناموتەناهی بوونەکەی"بالفعل"نییە بەڵکو"بالقوة"یە. کەواتە بۆمان دەرکەوتووە کە عالەم توخمێکی زیندووە بە گەشەکردنێکی بەستراکچێری بەردەوامەوە کە گەشە کردن و زیادبوونی سنووری دەرەکی نییە. تەنها یەک سەرەتا و یەک کۆتایی هەیە کە ناوخۆییە واتە خودی ناوەکی و زاتی کە ژیان دەبەخشێتە گشت و پارێزگاریی لێدەکات. هەروەک چۆن قورئان دەڵێت: (وَأَنَّ إِلَى رَبِّكَ الْمُنتَهَى). واتە: "**ئاكامی هەمووان بەرەو تۆیە**". (سورەتی النجم، ئایەتی٤٢)

بەم شێوەیە بۆمان روون دەبێتەوە کە ئەو تیۆرەی کە ئێمە لێی تێگەیشتووین واتایەکی رۆحی دەبەخشێتە زانستە مرۆییەکان. ناسینی عالەم بە مانای مەعریفەیە بە نیسبەت چییەتی کردەوەکانی خودا. لە تێڕوانین بۆ سرووشت و بە ڕامان لەوەدا لە ڕاستییدا بە شوێن دۆزینەوەی جۆرێک یەکیەتی لەگەڵ منی رەهاداییین و ئەمە شتێک نییە بێجگە لە شێوەیەکیتری ستایشتی خودا.

ئەو باسە زەمەن وەک بناغەیەکی سەرەکی حەقیقەتی نیهایی دەهێنێتە ئاراوە. بەم شێوە خاڵێکی سەرەکیتر کە لەبەردەم ئێمەدایە هەڵسەنگاندنی باسەکەی خوالێخۆشبوو دوکتۆر **مەک تاگارت** سەبارەت بە ناواقیعبوونی زەمەنە. بە پێی وتەی ئەو زەمەن ناواقیعە لەبەرئەوەی کە هەر ڕووداوێک دەتوانێت هەم لە رابردوودا بێت و هەم لە ئێستادا و هەم لە داهاتوودا. بۆ وێنە مەرگی مەلیکە ئان، بە نیسبەت ئێمە لە رابردوودا روویداوە، بۆ کەسانی هاوچەرخی خۆی لە زەمەنی ئێستادا

و بۆ ویلیامی سێهەم، ڕووداوێکە لە داهاتوودا. بەم پێیە ڕووداوی مەرگی ئان ئەو تایبەتمەندیانەی کە لەگەڵ یەکتردا ناسازگارن ئاوێتە دەکات. دیارە کە ئەم هۆیانە لەو تیۆرەوە سەرچاوە دەگرێت کە سرووشتی تەسەلسوولیی زەمەن سنووردارە. ئەگەر رابردوو، ئێستا و داهاتوو وەک بناغەکانی زەمەن لەبەرچاو بگرین کەواتە زەمەنمان وەک هێڵێکی راست لەبەرچاو گرتووە کە بەشێک لەوەی تێپەڕ کردووە و خستوویەتیە پشت سەری خۆیەوە. هێشتا بەشێکی ماوە و لەبەردەم ئێمەدایە. ئەم باسە زەمەن وەک چرکەیەکی داهێنەری زیندوو نابینێت، بەڵکو ئەوە بە سەقامگرتووی رەها دەزانێت کە خاوەنی ژمارەی ڕووداوی شێوازگرتووی جیهانیە. وەک ئەوەی کە ئاڵقەکانی فیلمێک بۆ ئەو بینەرانە نمایش دەکات کە لەدەرەوەی ژووری شانۆکەن. وەڵامدانەوە بۆ باسەکەی دکتۆر **مەک تاگارت** ئەمەیە کە داهاتوو نەک وەک واقیعێک، بەڵکو تەنها وەک ئیمکانێکی کراوە بوونی هەیە. ناکرێ بوترێت کە ڕووداوێک تایبەتمەندیە ناسازگارەکان پێکەوە ئاوێتە دەکات لەحاڵێکدا کە هەم وەک رابردوو وەسف کراوە هەم وەک زەمەنی ئێستا پێناسە کراوە. کاتێک کە ڕووداوێ روو دەدات لەگەڵ گشت ئەو ڕووداوانەدا پێوەندی نەگۆڕ دەگرێت کە بەر لەوە رووی داوە. ئەم پێوەندیانە بە هیچ شێوەیەک لە ژێر کاریگەریەتی پێوەندیەکانی لەگەڵ دیکەی ڕووداوەکاندا نییە کە لە دواییدا بە دەرکەوتنی زۆربەی ڕاستییەکان روو دەدات. هیچ باوەڕێکی دروست یان نادروست سەبارەت بەم پێوەندانە نە هەرگیز دەبێتە نادروست و نە هیچ کات دەگۆڕدرێت بۆ بابەتێکی دروست. بەم شێوەیە سەرنجدان بە ڕووداوێک هەم وەک رابردوو، هەم وەک کاتی ئێستا هیچ گرفتێکی لۆژیکی تێدا نییە، بەڵام دەبێ ئاگادار بین کە ئەم خاڵە بێ کێشە نییە و پێویستی بە

بیرکردنەوەی زیاتر هەیە. کردنەوەی نهێنی زەمەن کارێکی ئاسان نییە. ئەمڕۆکە وتە حەکیمانەکانی **ئاگۆستین** وەک ئەو کاتەی کە باسی لێکردووە، راستە کە دەڵێ:"ئەگەر کەسێک پرسیارێک سەبارەت بە زەمەن لە من نەپرسێت، ئەوە دەناسم، بەڵام ئەگەر بمەوێ هەر ئەوە بۆ پرسیارکارێک شی بکەمەوە، نازانم چ بڵێم".

خۆم لەسەر ئەو باوەڕەم کە زەمەن توخمی سەرەکی واقیعە، بەڵام زەمەنی راستەقینە زەمەنی تەسەلسوولی نییە کە جیاوازیەکی بنەڕەتی هەبێت لە نێوان رابردوو، ئێستا و داهاتوود، بەڵکو بەردەوامیی رەهایە، واتە گۆڕانکاریی و جیاوازی بێ تەوالی کە لە هۆکانی **مەک تاگارت** دا هیچ ئاماژەیەکی پێ نەکراوە، زەمەنی تەسەلسوولی هەمان بەردەوامیی رەهایە کە ئەندێشە سوواوی کردووە و رەفزی کردووە، ئەمە شێوەیەکە کە واقیع دێت و چالاکی داهێنەرانەی بە شێوەی بەردەوام لەم رێگەوە دەخاتە بەر هەڵسەنگاندنی ڕادە و چەندایەتی. هەربۆیە قورئان باس لەوە دەکات کە جیاوازی نێوان شەو و رۆژ تایبەتە بەو.

رەنگە بتانەوێ پرسیار لەوە بکەن کە: ئایا جیاوازی و گۆڕانکاریی لەسەر منی نیهاییدا دەکرێت؟

ئێمە بوونەوەرگەلی مرۆیی لە رووی بەرپرسایەتییەوە وابەستەی پرۆسەیەکی جیهانیین. بەشی زۆری بارودۆخی ژیانمان بە نیسبەت خۆمانەوە دەرەکییە. تەنها جۆری ژیان کە بۆ ئێمە ناسراوە دەبێت کونجکۆڵی و گەڕان بەشوێن حەقیقەتدا، شکست یان سەرکەوتنە واتە جیاوازیی و گۆڕانیی بەردەوام و ئەمە لە بنەڕەتەوە شتێکی ناتەواوە. هەروەها لەبەرئەوەی کە ئەزموونی خودئاگای ئێمە تەنها خاڵی حەرەکەیە بەرەو هەر جۆرە ناسین و مەعریفەیەک، ناتوانین خۆمان

دوور بگرین لە سنوورەکانی لێکدانەوەی ڕاستییە ئاشکراکان کە بە ئەزموونی دەروونی خۆمان دەست دەکەون.

لە بنەڕەتەوە بۆ تێگەیشتن لە چەمکی ژیان، چارەیەک نییە بێجگە لەوەی کە خودا لە کالبودی مرۆڤدا ببینین. لەبەرئەوەی کە ژیان تەنها لە دەروونەوە شیاویی تێگەیشتنە. هەروەک چۆن **ناسر عەلی** شاعیری سەرهەندی وتەی بوتێکی لەگەڵ بەرەهمەن دا بەم شێوەیە لە خەیاڵی خۆیدا وێنا کردووە:

**مرا بر صورت خویش آفریدی برون      از خویشتن آخر چه دیدی**

واتە منت وەک خۆت خوڵقاندووە، مەگەر لەدەرەوەی خۆت چت دیوە؟ لەبەر ئەو ترسەی کە لە بەراوردکردنی ژیانی ئیلاهی لەسەر ڕوخساری ژیانی مرۆییدا هەیە، **ئیبن حەزم،** زانای موسوڵمانی ئەندۆلۆسی وای لێهات کە تووشی گومان بێت کە سیفەتی ژیان بدات بە خودا. هەربۆیە بە شێوەیەکی کارامە باسی لەوە کرد کە خودا دەبێ وەک بوونەوەرێکی زیندوو وەسف بکرێت، بەڵام نەک بەو شێوەیە کە ئێمە ژیان تەجرەبە دەکەین بەڵکو تەنها لەبەرئەوەی کە لە قورئاندا وەها وەسفێکی لێکراوە. **ئیبن حەزم** خۆی لە ناو چوارچێوەی ڕەواڵەتی ئەزموونی خودئاگا حەبس کرد بێئەوەی کە لە لایەنە قووڵترەکانی بڕوانێت. لەوە دەچێت کە ئەو ژیانی بە گۆڕانکارییەکی تەسەلسوولی لێکدابێتەوە کە بەردەوام لەگەڵ لەمپەرە دەورانەدەورەکانی خۆیدا بەرەورووە. گۆڕانکاریی تەسەلسوولی بە ئاشکرا نیشانەی ناتەواوی و نوقسانە و ئەگەر سەبارەت بە گۆڕانکاریی خۆمان لەم بوارەدا ببەستینەوە، گرفتی بەراوردکردنی گشتایەتی و تەواوبوون و کەمالی خودایی لەگەڵ ژیانی ئیلاهییدا ناگاتە ئەنجام و هەروا دەمێنێتەوە.

وێدەچێت کە **ئیبن حەزم** وای بیر کردبێتەوە کە کەمالی خودا تەنها بە لەبەرچاونەگرتنی ژیانی ئەو دەکرێ بپارێزرێت، بەڵام ڕێگەیەکمان لەبەردەمدایە بۆ دەرچوون لەم کێشەیە، هەوەک تێگەیشتین منی ڕەها، گشت حەقیقەتە و لەوەها بارودۆخێکدا نییە کە لە دوورەوە نیگایەک بکات لە عالەمێکی بێجگە لە خۆی. کەواتە گشت قۆناغەکانی ژیانی ئەو بە تەواوەتی لە ناوەوە داڕێژراوە. دیارە کە گۆڕانکاریی و جیاوازی بە واتای حەرەکە لە حاڵەتێکی ناتەواو و نوقسانە بۆ حاڵەتێکی تاڕادەیەک کامڵ یان بە پێچەوانەوە ناکرێت لەگەڵ ژیانی ئەودا بەراورد بکرێت، بەڵام گۆڕانکاریی لەم واتایەدا تەنها شێوازی ئیمکانی ژیان نییە ڕوانینێکی قووڵتر لە ئەزموونی ناخودئاگادا ئەوە ئاشکرا دەکات کە لە ژێر ڕووکەشی ڕەواڵەتی بەردەوامیی تەسەلسولدا بەردەوامیی ڕاستەقینە بوونی هەیە و منی ئاکامدار لە بەردەوامیی ڕاستەقینەی ڕەهادا دەژی. لە شوێنێکدا کە گۆڕانکاریی لە جیاوازی حاڵەتەکاندا بەردەوام رادەوەستێت و خەسڵەتی ڕاستەقینەی خۆی کە ئافراندنی بەردەوامە دەردەخات. ماندوو نابێت و خەو چ سووک بێت و چ قورس ئەو ناباتەوە. لەم واتایە لە گۆڕانکارییدا کە هاتە ئاراوە منی ئاکامدار ئەگەر بێ گۆڕانکاریی بخرێتە بەر چاو، واتە ئەوە ئاوەها وێنا کراوە:

بێ حەرەکە، بێ خوازە، بێ کەڵک، ڕاوەستاو و نەبوونی ڕەها. گۆڕانکاریی بۆ خودی داهێنەر ناتوانێت بە واتای نوقسانی و ناتەواویی بێت. وێدەچێت کە **ئیبن حەزم** لە ژێر کاریگەریەتی ئەرستۆدا بووبێت. کەمالی"ئەو"فەزایەکی بەربلاوترە کە شموولی داهێنەرایەتییەکەی دەبێت و هەروەها ڕوانینێکی بێسنوور لە ڕوانگەی داهێنەرانەی ئەو. ژیانی خودا خۆی لە تەجەلییدایە و وەها نییە کە هەوڵێک بێت بۆ گەیشتن بە کەمالی خوازراو."هێشتا نا"ی مرۆڤ قبوولکردنی ژیانی بێ کۆتایی مانا

دەبەخشێت بە ئیمکانەکانی داهێنەرانە و بێ سنووری بوونی ئەو کە گشتی لە سەرەتاوە تا کۆتایی ئەو پرۆسەیە رادەگرێت:

**لە دووپاتکردنەوەی بێ کۆتاییدا**
**ئەوە کە بەردەوام دەڕوا**
**هەزاران تاقی شەکاوە و بەرز**
**سەریان خستۆتە یەک**
**پارێزەری ئەم بینا مەزنەن**
**عەشق بە ژیان لە هەموو شتێکدا لە گەڕیاندایە**
**لە بەشکۆترین ئەستێرەوە بگرە هەتا بچووکترین وردە بەرد**
**هەر هەوڵ و هەر بزووتنەوەیەک**
**لە خوا دا هێمنایەتیەکی ئەبەدییە.**

**"گۆتە"**

کەواتە ڕەخنەیەکی فەلسەفی و گشتگیر لە هۆکانی دیاری ئەزموون هەم بە پێی کارامەیی و هەم بە هۆی ئەوە کە ناسێنەرە و درک دەکات، ئێمە دەگەیەنێتە ئەم ئەنجامەی کە حەقیقەتی کۆتایی، ژیانی داهێنەرە کە بە عەقڵ ڕێنموونی کرابێت. لێکدانەوەی ئەم ژیانە بە"من"بە مانای بەراوردی خودا لە کالبودی مرۆڤدا نییە. تەنها ئەوەندە بەسە کە ئەم حەقیقەتە ساکارەی ئەزموون قبووڵ بکەین کە ژیانی هەبوو بابەتێکی بگۆڕی یەک شێواز نییە، بەڵکو بنەڕەتێکی یەکگرتنە کە خۆی ڕێک و پێکی دەبەخشێتە شتەکان. چالاکییەکی ئاوێتەییە کە حاڵەتە پرژ و بڵاوەکانی ستراکچێرێکی زیندوو بۆ مەبەستێکی داهێنەرانە لە شوێنێکدا کۆ دەکاتەوە. کردەوەی بیرکردنەوە کە خەسڵەتێکی سەمبۆلیکە وەک حیجابێک وایە لەسەر چییەتی راستەقینەی ژیان و ئەوە تەنها وەک جۆرێک گەڕیانی گشتی کە لە تەواوی شتەکاندا جێگرە، وێنا دەکەن و

گەر بە فۆڕمێکی عەقڵانی چاو لە ژیان بکەین دەگەینە ئەم ئەنجامە کە ژیان ناچارە لەوەی کە بگاتە یەکگرتنی بوون، بەڵام پێویستمان هەیە بە ناسینێکی بێ حیجاب و بێ واسیتە لە دەروونی خۆمانەوە سەبارەت بە لایەنی درککاری ژیان. دۆزینەوە و ئیشراق، ژیان بە ناوی"مـن"ی کونجکوڵ دەردەخات، ئەم مەعریفەیە هەر چەند نوقسانە لەبەرئەوەی کە تەنها خاڵی چوون بۆ ئێمە دەردەخات، بەڵام دەرکەوتەی بێواسیتەی چییەتی نیهایی حەقیقەتە. کەواتە واقیعەکانی ئەزموون ئەم لێکدانەوەیە تەئید دەکەن کە چییەتی نیهایی واقیع هەمان لایەنی رۆحییە و دەبێ وەک"خود"ێک وێنا بکەیت. فڕینی ئایین زۆر سەرترە لە فەلسەفە. فەلسەفە لە روانگەی عەقڵەوە سەیری هەموو بابەتەکان دەکات هەر بۆیە گرنگایەتی نادات بەوەی کە بەرەو ئەو چەمکە بڕوات کە بتوانێت گشت ئەزموونە دەوڵەمەندەکان بکات بە دام و دەزگایەکی فیکری. وەک ئەوەی کە فەلسەفە حەقیقەت لە دوورەوە ببینێت. لەکاتێکدا کە ئایین خوازیاری تەماس و پێوەندییەکی نزیکترە لەگەڵ حەقیقەتدا. یەکێکیان تیۆری و ئەویدی ئەزموونێکی زیندووە بە ڕوخساری پێوەندی و یەکگرتن. ئەندێشە بۆ گەیشتن بە وەها یەکگرتنێک دەبێ لە ئاستی ئاسایی خۆی سەرتر بڕوات و کەمالی خۆی لە حاڵەتێک لە زەیندا بزانێت کە ئایین بە ناوی"نوێژ"وەسف دەکات. یەکێک لە دوایین وشەکان کە بەسەر زمانی پێغەمبەردا هات.

## پێناسەی خودا و مەبەست لە عیبادەتی خودا

ئێمە بەو ئەنجامە گەیشتین کە ئەو حوکمەی لەسەر بنەمای ئەزموونی ئایینی دامەزرابێت بە تەواوەتی لە لایەن عەقڵەوە تەئید دەبێت. لایەنە گرنگەکانی ئەزموون کە بە روانینێکی ئاوێتەییەوە دەبیندرێت، دوایین بواری هەر ئەزموونێک بە ئیرادەیەکی داهێنەر دەزانێت کە بە عەقڵێک پاساودراورە کە ئێمە توانیومانە بە هۆکانمانەوە بە "من"ێک وەسفی بکەین. قورئان بۆ ئەوەی کە جەخت بکاتە سەر لایەنی تاکایەتی منی نیهایی، ناوی "الله"ی لێ دەنێت و ئەوە ئاوەها وەسف دەکات:

((قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ (١) اللَّهُ الصَّمَدُ (٢) لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ (٣) وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُواً أَحَدٌ (٤))

**واتە: "بڵێ: الله یەکێکە.**

**بێ نیازە و دیتران هەموو پێویستییان بەوە.**

**نە کەسی دەبێت و نە لە کەس بووە.**

**هیچ کەس هاوتای ئەو نییە". (سورەتی الاخلاص، ١ـ ٤).**

تێگەیشتن لەوەی کە تاک چییە، بابەتێکی دژوارە. هەروەک **برگسۆن** لە کتێبی "کامڵبوونی داهێنەر"دا باسی لێکردووە تاکایەتی بابەتێکە کە پلەی جیاوازی هەیە و تەنانەت لە یەکانگیریی بە رواڵەت داخراوی بوونەوەرێک بە ناوی مرۆڤ بە شێوەی کامڵ دەرناکەوێت. **برگسۆن** باس لەوە دەکات:

"بەتایبەت سەبارەت بە تاکایەتی دەتوانین بڵێین کە هەرچەند مەیل هەیە بۆ تاکبوون لە گشت جیهانی ئالییدا و پێکهێنەری رەواڵەتە بەردەوام لەگەڵ مەیل بۆ سک و زاکردن بەرامبەر دەوەستێت. بۆ ئەوەی کە تاکایەتی کامڵ بێت پێویستە کە هیچ بەشێکی جیاکراوەی ئەو ستراکچێرە نەتوانێت بە جیا بژی، بەڵام لەو کاتەدا زاوزێکردن ئەستەم دەبێت. ئایا منداڵ بوون شتێکە بەدەر لە دروستکردنی ستراکچێرێکی نوێ بە هۆی لایەنی جیاکراوەی ستراکچێرێکی کۆنەوە؟ بەم شێوەیە کە تاکایەتی دوژمن لە ناو ماڵی خۆیدا حەشار دەدات".

لێرەدا دەردەکەوێت کە تاکی کامڵ خودێکی سەربەخۆی بێ هاوتای تاقانەیە کە نابێ وابیر بکەینەوە کە دژەکەی خۆی لە ناخیدا هەڵگرتووە. دەبێ سەرتر لە مەیل بۆ منداڵ بوون لەبەرچاو بگیردرێت. ئەم تایبەتمەندییەی"خود"ی کامڵ یەکێک لە بنەڕەتیترین توخمەکانە لە چەمکێکدا کە قورئان لە خودای باسکردووە و چەندینجار ئاماژەی پێکردووە. بێ ئەوەی کە بیەوێت بەم روانینەوە هێرش بباتە سەر وێنەی باو سەبارەت بە مەسیحیەت و بەم شێوەیە جەخت دەکاتە سەر روانگەی خۆی لەبارەی تاکی کامڵەوە. لەهەمانکاتدا دەتوانین بڵێین کە مێژووی فیکری ئایینی رێگە جیاوازەکانی ئیماژی تاکخوازانە لەوەدا دەبینێت کە لە حەقیقەتی نیهایی ڕا بکات. لەبەر ئەوەیە کە تاکخواز نەیتوانیوە لە حەقیقەتی نیهایی تێبگات. ئەوەی وەک شتێک وێنا کردووە لە جنسی نوور، توخمێکی ئاسمانی بڵاوەبووی لێڵ و بەربڵاوە. ئەمە باوەڕێکە کە **فارنێل** لە دەرس گوتارەکانی **گیفۆرد** دا سەبارەت بە سیفەتەکانی خودا باس کراوە. من ئەوە قبووڵ دەکەم کە مێژووی ئایین ئەو شێوازانەی فیکر ئاشکرا دەکات کە مەیلی بەرەو ئایینی یەکگرتنی بوونە، بەڵام بە باوەڕی من روانینی **فارنێل** لەبەرئەوەی کە سەبارەت بە

یەکگرتن و هاوشێوەسازیی چەمکی قورئانی خودا لەگەڵ نووردایە، هەڵەیە. دەقی کاملی ئەو ئایەی کە ئەو تەنها بەشێک لەوە دەگەڕێنێتەوە ئاوەهایە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكَاةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ الْمِصْبَاحُ فِي زُجَاجَةٍ الزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ)). واتە: "**خودا نووری ئاسمانەکان و زەویە. نوورەکەی ئەو وەک زەرفێکە کە چرایەکی تێدا بێت و چرا لە ناو ئاوێنەدایە. ئاوێنەیەک کە دەڵێی ئەستێرەیەکی گەشاوەیە**". (سورەتی النور سەرەتای ئایەتی ٣٥).

گومانێک لەوەدا نییە کە لە رستەی سەرەتای ئەم ئایەتەوە بۆنی هەڵاتن لە وێنەکردنی تاکایەتی خودا دێت. کاتێک لێرەدا بە شوێن هاوشێوەیی نوور لە درێژەی ئایەتەکەدا دەڕۆین، رێک مانایەکی دژبەخۆی هەیە. بە پەرەسەندنی ئەو هاوشێوەییە لە ناو ئایەتەکەدا لەوە دەگەین کە زیاتر نەفیکردن و لابردنی وێنەکان سەبارەت بە توخمی ئاسمانی و بێ شکڵی حەقیقەتی کۆتایی مەبەستە. وەها کە نوور لە ناو بڵێسەی چرایەکدا کۆدەکاتەوە و زیاتر لەوە بە جێگرکردنی ئەو لە ناو ئاوێنەیەکدا کە لە ئەستێرەیەکی درەوشاوە دەچێت تاک بوونەکەی دەردەخرێت.

من بەشبەحاڵی خۆم وا بیردەکەمەوە کە کاتی ئەوە هاتووە کە لێکدانەوەی وەسفکردنی خودا بە نوور لە کتێب و دەقە پیرۆزەکانی یەهوودیەت، مەسیحیەت و ئیسلام دەبێ بە شێوەیەکیتر ئاوڕی لێبدرێتەوە.

فیزیای نوێ باس لەوە دەکات کە ناتوانین پێش خێرایی نوور بکەوین و ئەمە بۆ گشت چاودێرەکان بە هەر ئامێرێکی بزوێنەرەوە هاوسانە. هەربۆیە لە ناو جیهانی گۆڕانکارییدا نوور نزیکترین ئامێری

نزیکبوونەوە لەو شتەیە کە"ڕەها"یە. لە ڕوانگەی زانستی نوێوە شوبهاندنی خودا بە نوور دەبێ بە واتای "ڕەها"بوونی خودا بێت و نە بە واتای هەبوونی ڕەهای ئەو لە هەموو شوێنێکدا کە لێکدانەوەی قوتابخانەی یەکیەتی بوون لە خودایە.

لێرەدا پرسیارێک سەبارەت بەم باسە دێتە ئاراوە و ئەویش ئەمەیە کە ئایا تاکایەتی و یەکیەتی شموولی سنوورداریی نابێت؟ ئەگەر خودا یەک خود و بە ناچار تاقانە و تاکە ئەوکاتە چۆن دەتوانین ئەو لە شێوازی ناموتەناهییدا وێنا بکەین؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە کە ناکرێ خودا بە شێوازێکی ناموتەناهی و وەک بێسنووری شوێن لەبەرچاو بگرین. لە هەڵسەنگاندنی بابەتە ڕۆحانییەکاندا گەورەیی و مەزن بوون خۆی بە تەنها شتێکی ئەوتۆ نییە، هەروەها هەروەک پێشتر بینیمان بێ سنووریە زەمەنی و شوێنییەکان ڕەها نین. زانستی نوێی سرووشت وەک شتێکی ڕاوەستاو، کە لەناو بۆشاییەکی بێ سنووردابێت ناخاتە بەر سەرنج، بەڵکو ئەوە وەک بینایەک لە ڕووداوگەلێکی پەیوەستە بە یەکترەوە لەبەرچاو دەگرێت کە لە پێوەندیە بەرامبەرەکانیانەوە چەمکگەلی شوێن و زەمەن دێتە ئاراوە. مەبەست لەم باسە گێڕانەوەی ئەم خاڵەیە کە شوێن و زەمەن بریتین لە لێکدانەوەگەلێک کە ئەندێشەی داهێنەری منی ڕەها دایڕشتووە. هەر ئەم ئیمکانیاتی منەیە کە تەنها لە شێوازی بەشێک لە ناو فۆرمی شوێن و زەمەنی بیرکاریی ئێمەدا هاتۆتە دی. لەوپەڕی خودا و جیا لە چالاکی داهێنەرانەی ئەو نە زەم و ڕێکییەک بوونی هەیە و نە شوێنیک کە ئەو لە پێوەندی لەگەڵ دیکەی منەکاندا جیا بکاتەوە. کەواتە منی نیهایی نە بە مانای بێسنووریی شوێنە و نە بە مانای بێسنووریی لە جۆری منی مرۆڤ کە کەوتۆتە ناو شوێنێکی سنووردارەوە و جەستەی ئەو لە

پێوەندی لەگەڵ دیکەی منەکاندا جیا دەکاتەوە. بێسنووریی منی نیهایی بریتییە لە: ئیمکانیاتی ناوەکی و بێسنووری چالاکی داهێنەرانەی ئەو بە شێوازێک کە عالەم وەها کە ناسیومانە، تەنها ڕوخسارێکی ناتەواویەتی. بە کورتی ئەو بڵێم کە بێسنورری خودا کۆکراوەیە نەک بەربڵاو، شموولی کۆمەڵێکی بێسنوور دەکات، بەڵام "ئەو" ئەو کۆمەڵە نییە.

دیکەی توخمە گرنگەکان لەو وێنەکردنەی کە قورئان لە باری عەقڵی بێ خەوش لە خودا هەیەتی بریتیین لە: ئافراندن، زانایی، هەرمانیی کە یەکبەیەکیان دەخەینە بەرباس. زەینە سنووردارەکان وا سەیری سرووشت دەکەن کە لە روخسارێکی دیکەدا بە شێوەی زاتیی ڕووبەڕووی خۆی بۆتەوە کە زەین دەیناسێت، بەڵام سازی ناکات. بەم پێیە بوارێک لە ئێمەدا دروست دەبێت کە کردەوەی خوڵقاندن وەک ڕووداوێکی تایبەت ببینین کە لە رابردوودا روویداوە. عالەم لە چاوی ئێمەدا وەک بەرهەمێکی دروستکراوە و هیچ پێوەندیەکی تۆکمەی لەگەڵ ژیانی دەستکردی خۆیدا نییە وەها کە ئەو "خوڵقێنەرە" بەدەر نییە لە بینەرێکی تەنها. گشت موجادەلە زارەکیەکان کە لە ئەندێشە بەتاڵن سەبارەت بە واتای خوڵقاندن، هەر لەم ڕوانینە ڕووکەشیەی زەینی سنووردار و بەرتەسکەوە هاتوون. عالەمێک کە ئاوەها و بەم روانینەوە دەبیندرێت هیچ نییە بێجگە لە یەک چرکە سات لە ناو ژیانی خودادا کە وێدەچوو کە نەخوڵقێت. ئەو پرسیارە باشەی کە داوا کراوە بیپرسین ئەمەیە: ئایا ئەو مەودایە لە باری شوێنەوە کە لە نێوان عالەم و خودادا هەیە دەبێتە هۆی ئەوەی کە عالەم لەگەڵ ئەودا وەک غەیر و ئەویدیەکیتری لێ بێت؟ وەڵامەکەی ئەمەیە:

لە ڕوانینی ئیلاهییەوە ئافراندنێک بە واتای تایبەتەوە بوونی نییە کە"ما قبل"و"ما بعد"ێکی هەبێت. ناکرێ عالەم بە واقیعێک بزانین کە لە

حاستی ئەوەدا راوەستاوە. وەها روانینێک لەمبارەوە خودا و جیهان، هەردووکیان دەکاتە دوو بوونەوەری جودا لەیەکتر کە لە شوێنێکی چۆڵ و ناموتەناهییدا لە دژایەتیدان و بەرامبەر بەیەک راوەستاون. بەر لەوە زانیمان کە شوێن، زەمەن و کەرەستە ئەو چەمکانەن کە ئەندێشە سەبارەت بە هێزی داهێنەر و ئازادی خودا بەکاریان دەبات. ئەوان لە زاتی خۆیاندا بوونی واقیعی و سەربەخۆیان نییە، بەڵکو تەنها برێک حاڵەتی عەقڵیین کە دەبنە هۆی ئیدراکی ژیانی خودا. جارێک کە لە نێوان موریدەکانی **بایەزید بستامی**، عارفی بەناوبانگدا بابەتی ئافراندن هاتە ئاراوە، یەکێک لە موریدەکان ئەم ئیدەیەی کە هەستێکی گشتییە بە شێوازێکی زۆر تەشەراویی باس کرد کە:"یەکێک هەبوو، یەکێک نەبوو، بێجگە لە خودا کەس نەبوو". بایزید گوتی:

"ئێستاش رێک وەهایە کە ئەو کاتە بووە".

کەواتە جیهانی مادە شتێکی ئەزەلی و هاوتای خودا نییە، بەو شێوە کە تۆ بڵێی لە نێوانێکی دوورەوە لە ژێر چاودێری و کاریگەریەتی ئەودا بێت. عالەم لە سرووشتی ڕاستەقینەی خۆیدا کردەوەیەکی پەیوەستە کە ئەندێشە وەک زۆرینەیەکی دژ بە یەکتری لێدەکات. پرۆفیسۆر **ئێدینگتۆن** ئەم خاڵە گرنگەی زیاتر روون کردۆتەوە. باشتر وایە کە ئەم بەشە لە کتێبەکەی ئەو وەرگرین کە ناوی"شوێن، زەمەن و کێشەرییە":

"ئێمە خاوەنی جیهانێکین بە ڕووداوگەلێکەوە کە دەکرێ ئەوانە بە خاڵی لێکچوو بشوبهێنین کە پەیوەندیە سەرەتاییەکانی خۆیان هەیە، بەدەر لەمانە. هەروەها بەپێی یاسا و لۆژیکی بیرکاریی، دەکرێ ژمارەیەکی زۆر و بێسنووری پەیوەندی و کوالیتەی جۆراوجۆر بەرهەم بێت کە تایبەتمەندییە جیاوازەکانی جیهان لێکدەدەنەوە. ئەم پەیوەندی و کوالیەتەیە بە هەمان واتا لە سرووشتدا هەیە کە بۆ وێنە لە ژمارەیەکی

بێ ئەژماری ڕێگە لە ناو قامیشەڵانێکی بەریندا کە بوونەکەیان دەرناکەوێت. دەڵێی پێویستی بە کەسێک هەیە کە بە چوونە ناویەوە واتایەک ببەخشێت بە بوونی ئەو ڕێگەیە و ئەوە دەربخات. بوونی ئەم کوالیتەیەی کە لە جیهاندایە بەم شێوەیە. واتە تەنها کاتێک بۆتە خاوەنی چەمک و دەردەکەوێت کە زەینێک هەرکام لەوانە لە نێوان هاوسانەکانییدا بۆ ناساندن هەڵبژێرێت. زەین، مادە بە پاڵافتەکردنی شتە زیادەکانی کوالیتە دروست دەکات. بەهەمانشێوەیە کە مەنشوورێک ڕەنگەکانی کۆلکەزێڕینە بە پاڵافتەکردنی تیشکە پرژ و بڵاوەکانی نووری سپی دەردەخات. زەین ئەو شتەی کە جێگرە، بە مەزنی دادەنێت و ئەوەی کە کاتییە لەبەرچاو بزر دەکات. لە لێکدانەوەی بیرکاریی لە بواری نیسبەتەکاندا بۆمان ئاشکرا دەبێت کە تەنها ڕێگەیەک کە زەین دەتوانێت لە بابەتی مەبەستەکەی خۆی تێبگات، هەڵبژاردنی کوالیتەیەکی تایبەتە کە هەمان زات و جەوهەری هەرمانییە لە دنیای بینراودا. جیاکردنەوەی زەمەن و شوێنی بینراو لەبەرئەوەیە کە دەبێ لەوێدا هەرمانیی بێت و ئاکامی پێویستیی وەها بابەتێک دەبێتە ئەوەی کە پەیڕەوی یاسا و ڕێساکانی زانستی میکانیک و فیزیا و هەندەسە بێت. ئایا ئەمە وتەیەکی بێهوودەیە گەر باس لەوە بکەین کە"گەڕانی زەین لە دووی دۆزینەوەی هەرمانیی دەبێتە هۆی دروستبوونی دنیای فیزیا؟".

دوایین ڕستە کە لە کتێبەکەی ئەومان گێڕایەوە دەبێت بە یەکێک لە قووڵترین بابەتەکانی کتێبی پرۆفیسۆر **ئێدینگتۆن**. هێشتا کاتی پێویستە هەتا فیزیازانێک بەشێوازە تایبەتەکانی خۆیەوە لەوە تێبگات کە ئەم ڕوخسارە کاتییەی دنیایەک کە لە ڕەواڵەتدا هەرمانییە و فیزیاییە و زەین، لە کاتی گەڕان بۆ دۆزینەوەی هەرمانی پەیدای کردووە خۆی ڕەگ و ڕیشەی لە شتێکی هەرمانیتردایە. بابەتێک کە تەنها وەک خودێک

کە دەتوانێت سیفەتە دژ بەیەکەکانی گۆڕان و بەردەوامیی لە خۆیدا ئاوێتە بکات. بەمشێوەیە کە دەتوانین ئەوەش بە بابەتی هەم جێگر و هەم بگۆڕ بزانین.

بەرلەوەی کە لەم بابەتەدا زیاتر بڕۆینە پێش پرسیارێک دەمێنێتەوە کە دەبێ وەڵامی بدەینەوە، ئەویش ئەمەیە کە چالاکی داهێنەرانەی خودا چۆن دەست دەداتە ئافراندن؟ بنەڕەتیترین و هەروەها باوەڕپێکراوترین قوتابخانەی کەلامی ئیسلام واتە ئەشعەریە، هێزی ئافراندنی ئیلاهی بەوە دەزانێت کە دامەزراوە لەسەر ئەتۆمە و دیارە کە باوەڕکردنیان بەپێی ئەم ئایەتەی قورئانە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((**وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ عِندَنَا خَزَائِنُهُ وَمَا نُنَزِّلُهُ إِلاَّ بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ**)). واتە: "**هەرچی هەیە خەزێنەکانی لای ئێمەیە و ئەوە تەنها بە ئەندازەی رێکی خۆی دەنێرینە خوارەوە**". (سورەتی الحجر، ئایەتی ٢١).

سەرنج دان بە ئەتۆم لەناو ئیسلامدا واتە یەکەمین نیشانەی دەرکەوتنی شۆڕشێکی عەقڵی دژ بە وێنەی ئەرەستۆیی لە عالهمێکی نەگۆڕ و ئەمە یەکێک لە درەوشاوەترین وەرزەکانی لەناو مێژووی ئەندێشەی ئیسلامییدا دروست دەکات. ئیدەکانی قوتابخانەی بەسرە سەرەتا لە لایەن ئەبو هاشم ٩٣٣ زایینی و روانگەکانی قوتابخانەی بەغداد لە لایەن **ئەبوبەکر باقلانی** ١٠١٢ زایینی، کە موتەکەلیمێکی زۆر ورد و ئازا بووە هاتۆتە ئاراوە.

لە سەرەتای سەدەی سێزدەهەمی زایینیدا کە دەبێتە حەوتی کۆچی، لە کتێبێکدا بە ناوی"دلالة الحائرین"بەرهەمی **موسا بن مەیموون** زانایەکی جوولەکەیە کە دەرچووی زانکۆ ئیسلامییەکانی ئەندۆلۆس بووە، لەوێدا لێکدانەوەیەکی زۆر رێکی لێکراوە.

**مونک** له ساڵی ١٨١٦دا ئهم کتێبهی وهرگێراوهته سهر زمانی فهرهنسی و لهم دواییانهدا پرۆفیسۆر **مهک دانالدی** ئهمریکایی پێداچوونهوه و باسێکی زۆر بهنرخی سهبارهت بهوه کردووه و له گۆڤاری (ایسیز)دا بڵاوی کردۆتهوه. دکتۆر **تسۆمێر** جارێکی دیکه له مانگنامهی جیهانی ئیسلامدا له ڕێکهوتی ژانویهی ١٩٢٨ دا بڵاوی کردۆتهوه. بهم حاڵهوه پرۆفیسۆر **مهک دانالد** هیچ ههوڵێکی نهداوه بۆ کهشفی دهروونناسانهی ئهو هێزانهی که گهشهی زانستی کهلامیان لهسهر بنهمای ئهتۆم و زهڕه کردووه. ئهو قبووڵی دهکات که بابهتێک وهک زهڕهخوازیی ئیسلامی له ناو فیکری یۆنانییدا بوونی نییه، بهڵام مهیلی نهبووه بۆ ئهوهی که متمانه بدات بهو فیکره سهرهکییهی که تایبهت بووه به زانا ئیسلامییهکان. لهبهرئهوهی که لێکچوونێکی ڕووکهشی دهبینێت له نێوان تیۆری ئیسلامی و تیۆریهکانی فیرقهیهک له بوودا، بهجارێک دهگاته ئهم ئاکامهی که بناغهی ئهم تیۆره، بووداییه و فیکری ئیسلامی کاریگهریهتی لهوه وهرگرتووه. به داخهوه که لهم لێدوانهدا ناکرێ سهبارهت به سهرچاوهی ئهم تیۆرهی که به تهواوهتی توێژینهوه باسێکی بهربڵاومان ههبێت. لێرهدا تهنها ههندێک له لایهنه بهرجهستهترهکانی ئهوهتان بۆ باس دهکهم و لهههمانکاتدا ئهو ڕێگهیانهش نیشان دهدهم که به باوهڕی من سازکردنهوهی ئهندێشه دهبێ له تیشکی زانستی نوێی فیزیادا لهوێدا ئهنجام بگرێت.

کهواته بهپێی ڕوانگهی بیرمهندانی قوتابخانهی ئهشعهریهکان جیهان ئاوێتهیهکه لهو شتانهی که ئهوان به"جهواهیر"ناوی لێدهبهن واته بێئهژمار زهڕه یان ئهتۆم که ئیتر ناکرێ دابهش بکرێن. لهبهرئهوهی که چالاکی داهێنهرانهی خودا ڕاناوهستێت، ژمارهی ئهتۆمهکان ناتوانێت سنووردار بێت و ههردهم ئهتۆمی نوێ ساز دهکرێت و کهواته عالهم

بەردەوام لە گەشەکردندایە. بەو شێوەیە کە قورئان باسی لێدەکات:"لە خولقاندندا هەرچی بیەوێت زیادی دەکات". چییەتی و گەوهەری ئەتۆم لە بوونەکەی سەربەخۆیە و ئەمە بەو واتایە کە بوون، کوالیتە و شوناسێکە کە خودا لەسەر جۆری ئەتۆم دایدەنێت. وەک ئەوەی کە ئەتۆم بەرلەوەی کە ئەم کوالیتەیە وەربگرێت، نەگۆڕ و بێ جوولە لەناو هێزی داهێنەری خودادا نووستوە. بوونەکەی بەدەر لەوەی کە هێزی ئیلاهی دەربخات هیچ چەمکێکیتری نییە. ئەتۆم هیچ قەبارەیەکی نییە بەڵکو"پۆزیشێن"ی هەیە کە ئەوەش نابێتە هۆی پڕکردنەوەی شوێنێک. بە کۆبوونەوەی ئەوانەیە کە ئەتۆمەکان بڵاوە دەکەن و شوێن کامڵ دەبێت. **ئیبن حەزم**، رەخنەگریی زەڕەخوازیی بە جەختکردنەوە باس لەوە دەکات کە قورئان لە نێوان کردەوەی خوڵقاندن و شتی خوڵقاودا جیاوازیی دانانێت. کەواتە چییەتی ڕاستەقینەی ئەو شتەی کە بە بابەت ناوی دەنێین هەمان کۆمەڵێکە لە"کردەوە"کانی زەڕەکان. هەڵبەت دیارە کە وێناکردنی"کردەوەی زەڕە"و شکڵدان بەوە لەناو زەیندا بابەتێکی دژوارە. فیزیای نوێش لە چەندایەتی فیزیکی ئەتۆمێکی راستەقینە، ئیماژی کردەوەیەکی هەیە. بەهەمان شێوە کە پرۆفیسۆر **ئێدینگتۆن** وەبیری هێناینەوە تا ئێستا دارشتنەوەیەکی ورد لە تیۆری کوانتا سەبارەت بە کردەوە نەهاتۆتە ئاراوە. تەنانەت تیۆری زەڕەبوونی کردەوەش بە ناوی یاسایەکی گشتی و هەروەها رەواڵەتی ئێلێکترۆنەکان کە لەسەری دامەزراوە بە شێوازێکی لێڵ پەسند کراوە. جارێکیتر زانیمان کە هەر ئەتۆمێک یەک پۆزیشێن داگیر دەکات کە پێویستی بە شوێن نییە. کەواتە بەم شێوەیە چییەتی حەرەکە کامەیە کە ئەوە بێجگە لە شکڵی تێپەڕ بووی ئەتۆم لە ناو مەکاندا ناتوانین وێنا بکەین؟ لەبەرئەوەی کە ئەشعەریەکان شوێنیان بە کامڵبووی

کۆبوونـەوەی ئـەتۆمـەکـان دەزانـی نـەیانـدەتـوانی حـەرەکـە بـە شـێوەی تێپەڕینی جەستە لە گشت خاڵەکانی سەرەتا هەتا شوێنی مـەبـەست لێک بداتـەوە. بـەوەهـا لێکدانـەوەیـەک دەبیّ بـوونی بۆشـایی وەک واقیعێکـی سەربەخۆ قبووڵ بکەین. بەمشێوەیە سیستەم بۆ زاڵبوون بەسـەر شـکڵی شـوێن یـان فـەزای بـەتـاڵ، چـارەی لـە نـاو تیـۆری"خـۆدەربـازکردن"یـان پـەڕینـەوە دۆزیـەوە. ئـاوەهـای دانـا کـە بابـەتـی بـزۆک لـە کـاتی تێپەڕین لـەگـەڵ تـەواوی ئـەو خاڵانـەی کـە لـەنـاو شـوێندان تـەماسـی نییـە بـەڵکو لـەسـەر مـەودای بـەتـاڵی خاڵێکـەوە هـەتـا خاڵـەکـەیتـر تێپـەڕ دەبێت و دەپەڕێتەوە. بەم شێوە لەسەر بنەمای روانگەکەی ئەو حەرەکەی خێرا و حـەرەکـەی ئـارام خێراییـەکـی یـەکسانیان هـەیـە. حـەرەکـەی ئـارام تـەنهـا ژمـارەی خـاڵی راوەسـتانی زۆرتـری هـەیـە. ئیعتـراف دەکـەم کـە رێگەچـارەی ئـەم دژوارییـەم نـەدۆزیـوەتـەوە. دەبیّ بـاس لـەوە بکـەم کـە زەڕەخوازیی نویّ تووشی گرفتێکی هاوشـێوە بـووە و رێگـە چـارەیـەکـی هاوشێوەی هەمان بابەتی دۆزیوەتەوە، بە هەڵسەنگاندنی ئـەزموونـەکانی پەیوەست بە تیۆریـەکانی کوانتـای **پلانک**، وەهـای دادەنێین کـە ئـەتۆمی بزۆک بەشێوەی بەردەوام لە رێگەی شـوێنەوە تێپـەڕ دەبێت. پرۆفیسـۆر **وایتهید** لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی"زانست و دنیای نوێدا"دەنووسێت:

"یەکێک لەو رێگەیانەی کە دەتوانین بۆ لێکدانەوەی ئەم بابـەتـە هیـوای پـیّ ببـەسـتین ئـەمـەیـە کـە وایـدانێین کـە ئەلیکتـرۆن حـەرەکـەیـەکـی پـەیـوەسـتەی لـە نـاو شـوێنی خۆیـدا نییـە. لایـەنـی دیکـەی تیـۆر بـە هـۆی لایـەنـی وجـوودی حـەرەکـە ئـەوەی کـە وای دابنێین کـە ئەلیکتـرۆن لـە ریزێک لە خاڵەکانی پەیوەندیدا ئامادە دەبێت و ئـەم پڕکردنـەوە بـە هـۆی تەوالی لەناو بەردەوامیی زەمـەندایـە. وەک سـەیارەیـەک کـە بـە شـێوەی مامناوەندی هەر کاتژمێر ٣٠ میل لە درێژایی ناو جادەیـەکدا بـە شـێوەی

ناپەیوەست حەرەکە دەکات و پاش گەیشتن بە هەرکام لە نیشانەکانی پێوەری مەسافەی تەنیشت جادە بۆ ماوەی دوو دەقە رادەوەستێت".

لایەنی دیکەی ئەم تیۆرەی خولْقاندن، باوەڕێکی پەیوەندیدار بە خولْقاندنی بەردەوامە. وەها کە پەیوەستەبوونی ئەتۆمێک بە ناوی بوونەوەرێک پەیوەندی بەوە هەیە. ئەگەر خودا ئیتر بوونەوەرەکان نەخولْقێنێت، ئەتۆم لە ئەتۆم بوون رادەوەستێت. ئەتۆم خاوەنی خالْگەلی ئیجابی یان سەلبی پێویستە. ئەم سیفەتانە دوو بە دوو و بە شێوەی دژ بەیەک لەوەدا ئامادەن وەک ژیان و مەرگ، حەرەکە و بێ حەرەکەیی و. . . کە لە بنەڕەتەوە هیچ جۆرە سەقامگیرییەکیان نییە. ئەو بابەتەی کە باسمانکرد دوو ئەنجامی لێدەکەوێتەوە:

- هیچ شتێک زاتی سەقامگرتووی نییە.
- ئەتۆمەکان خاوەنی دیسیپلینی تاقانەن. واتە ئەو شتەی کە بە رۆح ناوی لێدەبەین یان جۆرە شەفاف و ناسکتری مادەیە یان تەنها ڕوخسارێکە.

دەمەوێ باس لەوە بکەم کە کاتێک کە تیۆری خولْقاندنی بەردەوام هەلْدەسەنگێنین کە ئەشعەرییەکان دەیانویست پتەوی بکەن، توخمی حەقیقەت لە ناو بابەتی یەکەمدا دەدۆزینەوە. پێشتر باسمان لەوە کردبوو کە بە باوەڕی من رۆحی قورئان بە گشتی دژ بە فیکری یۆنانییە. بیرۆکەی ئەشعەریەکان سەبارەت بەم باسە وەک هەولْێکی ڕاستین دەبینم کە ویستویەتی بەپێی"هێز یان ئیرادەی نیهایی"تیۆریەک سەبارەت بە ئافراندن دابڕێژێت و بلاْوی بکاتەوە کە بە گشت نوقسانییەکانیەوە زۆر زیاتر لە تیۆری جیهانی سەقامگرتووی ئەرستۆ لە حەقیقەتی رۆحی قورئان نزیکترە. ئەرکی سەرشانی زانا ئاییینیەکان لە داهاتوودا ئەمەیە کە گیانێکی نوێ بخەنە ناو جەستەی ئەم تیۆریە کە بە تەواوەتی توێژینەوەی لەسەر

کراوە. هەروەها تەماسەکەی لەگەڵ زانستی نوێدا نزیکتر بکەن کە وادێتە بەرچاو کە هەر لەم بوارەدا حەرەکە دەکات. بابەتی دووهەم هاوشێوەیی هەیە لەگەڵ مادەخوازیی ڕەهادا.

بە باوەڕی من ئەشعەریەکان کە رۆح بە ڕوخسار دەزانن، لەگەڵ مەیلی راستەقینەی تیۆریەکەیاندا دژ بەیەکەن کە پەیوەستەبوونی ئەتۆم دەبەستنەوە بە ئافراندنی بێ راوەستانی ڕوخسارەکان لە ناخی ئەتۆمدا. دیارە کە حەرەکە بێ زەمەن وێنا ناکرێت و لەبەرئەوەی کە زەمەن لە ژیانی رۆحانییەوە سەرچاوە دەگرێت کەواتە ژیانی رۆحانی بنەڕەتیترە لە حەرەکە. ئەگەر ژیانی رۆحانی نەبێت، زەمەن بوونی نییە، زەمەن نەبێت حەرەکە بوونی نییە. بەڕاستی ئەو شتەی کە ئەشعەریەکان بەو مانایەوە بە دەرکەوتە و روخساری شتەکانی ناو دەبەن، هەمان شتە کە دەبێتە هۆی پەیوەستەیی ئەتۆم. کاتێ ئەتۆم سیفەتی بوون قبووڵ دەکات وادێتە بەرچاو کە بە تەواوەتی یان بە لانی کەمەوە بەستراوی شوێن بووە. ئەگەر ئەتۆم وەک نمودێک لە هێزی ئیلاهی ببیندرێت دیارە کە رۆحانییە. رۆح کردەوەی رەهایە و جەستە تەنها کردەوەیە کە دەردەکەوێت و هەربۆیە دەکرێ پێوانە بکرێت. لە ڕاستییدا ئەشعەریەکان تیۆری نوێی"خاڵ- چرکە"یان بەشێوەیەکی لێڵ پێشبینی کردبوو، بەڵام لە تێگەیشتن لە چییەتی پەیوەندی نێوان خاڵ و چرکەدا سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا. هەربۆیە چرکە بنەڕەتیترە، بەڵام خاڵ لە چرکە جیا نابێتەوە، لەبەرئەوەی کە لایەنێکی پێویستە بۆ دەرکەوتن و پەیدابوونی چرکە. خاڵ چرکە نییە تەنها جۆرێک روانینە بۆ چرکە. مەولەوی لەو شوینەدا کە دەڵێت:

**بادە از مام سست شد، نی ما از او**

**قالب از ما هست شد، نی ما از او**

واتە بادە لە ئێمە سەرخۆش بووە نەک ئێمە لە بادە و هەروەها جەستە و قاڵب بە ئێمەوە پەیدا بووە نەک ئێمە لەو دروست کرابێتین. ئەم بابەتە زۆر زیاتر لە غەزالی لە رۆحی ئیسلامەوە نزیکە. کەواتە حەقیقەت لە بنەڕەتەوە رۆحانییە، هەڵبەت دیارە کە رۆح دەرەجەی جیاوازی هەیە. لە مێژووی فیکری ئیسلامییدا لە ناو بەرهەمەکانی **شەهابەدین سوهرەوەردی** ئەم بیرۆکە دەبینرێت کە حەقیقەت و واقیع خاوەنی دەرەجەی جیاوازن. لە سەردەمە دواییەکاندا لە ناو بەرهەمەکانی هیگیڵدا ئەوە دەبینین. هەروەها لە ناو دەقەکانی خوالێخۆشبوو **لۆرد هاردین** بە ناوی"فەرمانڕەوایی رێژەیی"کە ماوەیەک پێش مردنەکەی چاپی کرد. باسم کرد کە وێنای من لە حەقیقەتی نیهایی هەمان"من"ە و هەروەها ئەوە زیاد بکەین کە"من"ی مەکان تەنها لە منی نیهاییەوە سەرچاوە دەگرن. هێزی داهێنەری منی نیهایی کە کردەوە و ئەندێشە لەوێدا یەکسانە وەک واحدەکانی من ئیش دەکات. جیهان لە ناو گشت وردەکاریەکانیەوە لە حەرەکەیەکی میکانیکیەوە کە بە ناوی ئەتۆمی مادە ناوی لێدەبەین بگرە هەتا حەرەکەی ئازادی ئەندێشە لە ناو منی مرۆڤدا و"چەمکی من گەورەم"هەموویان خودا لە ناو خۆیاندا دەردەخەن. هەر زەڕەیەک لە هێزی ئیلاهی هەرچەند لە ریزەکانی خوارەوەی بوونیشدا بێت دیسان بە ناوی خود یان منێک دەژمێردرێت، بەڵام لەو شتەدا کە بە ناوی خودی دەیناسین چەندین پلەبەندی هەیە. دەزگای مۆسیقای ژیان ئاهەنگێک بێجگە لە خۆی ناژەنێت. نەوایەک کە بەرەبەرە بەرز دەبێتەوە و لە مرۆڤدا دەگاتە کامڵبوون. هەربۆیە قورئان باس لەوە دەکات کە منی نیهایی لە دەماری مل بە مرۆڤ نزیکترە. ژیان و حەرەکەمان وەک مرواری وایە و ژیانیشمان بەرهەم هاتووی هەڵڕژانی بەردەوامی ژیانی ئیلاهییە. ئەگەربێتو رەخنەیەک بەپێی

باشترین سوننەتەکانی ئەندێشەی ئیسلامی لە تەرحی زەڕەخوازیی ئەشعەریەکان بەدەستەوە بدەین، دەردەکەوێت کە ئەو تەرحە هەمان پلۆرالیزمی رۆحانییە کە هەڵسەنگاندنی وردەکاریەکانی لە داهاتوودا دەبێ لەلایەن بیرمەندانی ئیسلامییەوە بکرێت. وێدەچێت کە ئەم پرسیارە بێتە ئاراوە کە سیفەتی زەڕەیی بوون پێگەیەکی واقیعی هەیە لەناو هێزی داهێنەرانەی خودادا، یان بە هۆی ئیدراکی سنووردارییی ئێمەوە وەهایە؟ ناتوانم بڵێم کە وەڵامی کۆتایی ئەم پرسیارە لە روانگەی زانستی رەهاوە بۆ چ شتێک تەرخان دەکرێت؟ لە باری دەروونناسییەوە بابەتێک دێتە بەرچاوم کە پێموایە دروست بێت. ڕاستیتان دەوێت، تەنها ئەو شتە راستەقینەیە کە لە واقیعی خۆی بێ واسیتە و بە شێوەی راستەوخۆ ئاگادارە. بە گۆڕانی پلەی هەستی"خود"ی پلەی واقیعیش دەگۆڕدرێت. سرووشتی منی نیهایی وەهایە کە بە پێچەوانەی بەرپرسایەتیەکەی بەرامبەر بە منەکانیتر، لە خۆیدا کۆکراوەتەوە و خاوەنی مەدارێکی تایبەتی خۆیەتی. ئەم تەوەرەش بوون و واقیعێکی جیای هەیە و هەموو منەکانیتر بێجگە لە"من"ی ناوەندە لەو شوێنەدا جێگر بووە. حەقیقەتی ئەو بە ناوی من تەنها لەم رێگەیەوە دەردەکەوێت. کەواتە مرۆڤ کە خودێک لە ناو ئەودا گەیشتۆتە کامڵبوونی رێژەیی، پلەیەکی دروست لە ناو دڵی هێزی داهێنەری ئیلاهیدا دەبینێت و هەربۆیە بەرامبەر بە شتەکانی دەوروپشتی خۆی دەبێتە خاوەنی جێگەیەکی راست و زۆر بە نرخ. لە نێوان هەموو بەرهەمە خوڵقاوەکانی خودا تەنها مرۆڤە کە شیاویی ئەوەیە کە بە ئاگاییەوە لە ژیانی داهێنەرانەی خودای خۆیدا بەشداریی بکات. ئەو خاوەنی وەها هێزێکە کە دەتوانێت جیهانێکی باشتر وێنا بکات و خاوەنی هێزێکی وەهایە کە دەتوانێت ئەو شتانەی کە هەیە بگۆڕێت و بیکا بەو

شتانەی کە دەبیَ وابێت. "من" لە ناخی ئەودا تـەمـەنای ئـەوەی هـەیـە کـە گشت ئەوشتانەی کە لە دەوروپشتییدا هەیە یان لـە کـاتی بـەڕێوەبردنـی ئەرکەکەیدا دێتە سەر شانی، بەکاری بەرێت. بۆ پێگەیاندنی تاکایەتییـەکی کۆکراوە و تایبەت بە خۆی کە بـەرەو هـەڵکشان دەڕوات. لێرەدا تکاتـان لێدەکەم کە بۆ ئەوەی بگەینە شێوازێکی کامڵتر سەبارەت بـەم بابـەتـە، تـا کاتی لێدوانی دواییم لە ژێر ناوی "هەرمانیی و ئازادی من"دا چـاوەڕوانـی بکەن. لەم دەرفەتەدا دەمەویَ چەند وتـەیەک بڵێم سـەبـارەت بـە تـیـۆری زەمـــەنـــی زەڕەیـــی کـــە وادەزانـــم لاوازتـــرین بـــەشـــی تیۆریـــەکـــانی ئـەشـعەریـەکانـە سـەبـارەت بـە ئافرانـدن. ئاوڕدانـەوە لـەوە بـەمـەبـەسـتی دۆزینـەوەی روانگـەیـەکـی مـەعقـوول سـەبـارەت بـە سـیفەتـی ئیلاهـی هەرمانی پێویستە.

بابەتی زەمەن بەردەوام سەرنجی بیرمـەندان و عارفـەکانی ئیسلامی بە رەولای خۆی راکێشاوە، بەشێک لـەم سـەرنـج پێدانـە دەگـەڕێتـەوە بـۆ ئـەو واقیعـەی کـە بـەپێی وتـەی قورئـان، بـەدواداهـاتنی رۆژ و شـەوە کـە یەکێکە لە گەورەترین نیشانەکانی خودا. بەشێکی دیکەش پەیوەندی هەیە لـەگـەڵ حـەدیسێکی بـەناوبـانگی پێغـەمبـەر کـە پێشتر ئـامـاژەی پێدرابوو. لـەوێدا خـودا لـەگـەڵ"دەهـر"واتـە زەمـەنـدا هـاوسـان زانـراوە. هـەنـدێک لـە گـەورەتـرین عارفـە ئیسلامیەکـان لـەسـەر ئـەو بـاوەڕە بـوون کـە وشـەی دەهر بارێکی رەمز و رازی عیرفانی پێوەیـە. بـە بـاوەڕی **مەحیەدین بن عەرەبی**، دەهر یەکێکە لە نـاوەکـانی حوسنا. لـە تـەفسیری رازی دا بـاس لەوە کراوە کە هەندێک لە زاهیدەکانی ئیسلام فێری ئـەویـان کـردبـوو کـە وشـەی "دەهر" لەگەڵ "دیهور" و هـەروەها "دیهـار" وەک زیکرێک بڵێتـەوە. رەنگە تیۆری ئەشعەریەکان سەبارەت بە زەمەن یەکەمین هـەوڵ بێت لـە ناو مێژووی ئەندێشەی ئیسلامییدا بۆ فەهمی فـەلسـەفی ئـەو بابـەتـە. بـە

باوەڕی ئەشعەریەکان، زەمەن تەوالی "ئێستا تاکەکان" یان "آنات متتالیە"یە و لەو روانگەیەدا ئەوەمان بە ئاشکرا بۆ دەردەکەوێت کە لە نێوان دوو "ئێستا"ی تاقانەدا چرکەساتگەلێکی بەتاڵ و پڕ نەکراوە لە زەمەن بوونی هەیە کە دەبێ ئەوە بە بۆشایی زەمەن ناوبەرین. بێهوودەبوونی دەستکەوتنی ئەنجامێک لەوەها بابەتێک دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستییەی کە ئەشعەریەکان روانینێکی عەینییان هەبووە بەرامبەر بە بابەتی لێکۆڵینەوەکانیان. ئەوان هیچ وانە و عیبرەتێکیان لە مێژووی فیکری یۆنانی وەرنەگرت کە بە قبووڵکردنی وەها روانگەیەک نەگەیشتنە هیچ ئەنجامێک. لەسەردەمی خۆماندا **نیۆتۆن** زەمەن ئاوەها پێناسە دەکات: بابەتێک کە لە زاتی خۆیدا و بە هۆی سرووشتەکەیەوە بە شێوەیەکی یەکسان لە گەڕیاندایە. شوبهاندنی زەمەن بە رووبارێک کە بە شێوەی لاوەکی لەم وەسفیکردنەدا بەکارهاتووە و عەینیەتی پێداوە، رەخنە و دەنگدەربڕینێکی جیددی بەرەوڕووی **نیۆتۆن** کردووە، بەڵام ناتوانین تێبگەین کە چۆن بابەتێک بە نغرۆبوون لەم رووبارەدا کاریگەریەتییان لێوەردەگرێت. ئەو بابەتانەی کە لەم نغرۆبوونەدابەشدارییان نەکردووە چ جیاوازیەکیان هەیە لەگەڵ ئەوانەیتردا، ئەگەر هەوڵ بدەین کە زەمەن بە شوبهاندن بە گەڕیانی ئاو درک بکەین ناتوانین بۆ سەرەتا و ئەنجام و سنووردارییەتیەکەی وێنایەک بدۆزینەوە. پێویست دەبێت کە زەمەنێکیتر هەبێت تاکو حەرەکەی زەمەنی سەرەتایی بەدیار بکەوێت. دیسان زەمەنێکیتر پێویستە تاکو حەرەکەی زەمەنی دووهەم دەربخات، بەم شێوەیە هەتا بێ ئەژمار. بەم شێوەیە زەمەن بە واتای بابەتێکی تەواو عەینی دەچێتە ناو قاوغی هەندێک کێشەوە. دەبێ قبووڵ بکەین کە زەینی پراکتیکی عەرەبەکان بە پێچەوانەی یۆنانیەکان نەیدەتوانی زەمەن وەک بابەتێکی

ناواقیعی وێنا بکات. ئەگەر هیچ ئامێرێکی هەستپێکردن کە بتوانێت زەمەن درک بکات لە ناو ئێمەدا نەبێت دیسان نکولی لەوە ناکرێت کە زەمەن خۆی جۆرێک گەڕیانە و هەربۆیە عەینیەتیکی رەسەنە کە تایبەتمەندی زەڕەی هەیە.

لە ڕاستییدا روانینی کۆتایی زانستی نوێ سەبارەت بە زەمەن هەمان باوەڕی ئەشعەریەکانە، لەبەرئەوەی کە کەشفکردنەکانی ئەم دواییانەی فیزیا وا دەڕوانێتە چییەتی زەمەن کە مادە ناپەیوەستە. ئەم باسەی کە لە پرۆفیسۆر **رون جی تێر** بە ناوی"فەلسەفە و فیزیا"خاڵێکی جێی سەرنج سەبارەت بەم بابەتەی هەیە کە دەڵێت:

"بە پێچەوانەی ئەو باسە قەدیمییەی کە دەڵێ- دنیا بەیەکجار ناگۆڕدرێت- دەرکەوتووە کە جیهان نەک بەرەبەرە بەڵکو بە هەڵچوونی کتوپڕ دەگۆڕدرێت. دەزگایەکی فیزیایی نە تەنها شیاویی وەرگرتنی ژمارەیەکی سنووردارییی حاڵەتەکانە. لەبەرئەوەی کە جیهان لە نێوان دوو حاڵەتی جیاوازی بێ مەودا و بەردەوام بێ حەرەکە دەمێنێت. زەمەن دەکەوێتە تەعلیقەوە و کەواتە زەمەن خۆی ناپەیوەستەیە واتە زەڕە و ئەتۆمی زەمەن بوونی هەیە".

خاڵی گرنگ لەوەدایە کە هەوڵی بەسوودی ئەشعەریەکان وەک ئەوەی لەم ساڵانەدا کراوە، بە تەواوەتی بێ بەری بووە لە هەر لێکدانەوەیەکی دەروونناسانە. ئەنجامی ئەم نوقسانییە ئەوە بووە کە هیچکامیان نەیانتوانی لایەنی زەینی زەمەن درک بکەن. لە ئاکامی وەها شکستێکدا بوو کە لە تیۆری ئەواندا دەزگاکانی"ئەتۆمە مادی"یەکان و"ئەتۆمە زەمەنیەکان"بێ ئەوەی کە هیچ پێوەندیەکی رێک لە نێوانیاندا هەبێت لێک جودان. دیارە کە ئەگەر زەمەن لە دەلاقەی عەینیەتی رەهاوە بڕوانین، زۆر کێشەی جیددی سەرهەڵدێنێت، لەبەر ئەوەی کە ناتوانین

بەو شێوەی کە پرۆفیسۆر **ئەلیکساندێر** لە کتێبەکەیدا بە ناوی"باسگەلێک سەبارەت بە شوێن، زەمەن و ئیلاهیەت"ئاوڕی لێداوەتەوە، بێین و زەمەنی ئەتۆمی لەگەڵ خودادا یەکسان بکەین و ئەو وەک هۆکارێکی ژیان وێنا بکەین، دەبینین کە خەریکی ئافراندنە. موتەکەلیمە موسڵمانەکانی ئەم دواییانە بە تەواوەتی هەستییان بەو گرفتە کرد. مەلا **جەلالەدین دواتی**، لە بەشێک لە کتێبی"زوراء"کە بیرهێنەرەوەی تیوری پرۆفیسۆر **روویس** لە موتالاکانیدایە سەبارەت بە زەمەن ئاوا دەڵێت: ئەگەر وای لەبەرچاو بگرین کە زەمەن فەزایەکی بچووکە کە دەرکەوتنی ڕووداوەکان وەک رشتەیەکی بزۆک لێدەکات و ئەم فەزا بچووکە بە مەودا یان فاسیلەیەک لەبەرچاو بگرین، ڕێگەیەکمان بۆ نامێنێتەوە بێجگە لەوەی کە ئەوە وەک حاڵەتی سەرەکی چالاکی ئیلاهی وەسف بکەین کە هەموو حاڵەتەکانی بەردەوامیی ئەو چالاکییە لەخۆدەگرێت. دوانی بە وردبینی و پارێزەوە ئەوەش باس دەکات کە ڕامانێکی قووڵ، ڕێژەیی بوونی چییەتی تەوالی ئاشکرا دەکات و ئەوە روون دەکاتەوە کە تەوالی زەمەنی لە خودادا نادیار دەکات کە تەواوی ڕووداوەکان لە یەک کردەوەی تاقانەدا کۆدەکاتەوە.

**عەراقی**، شاعیری سۆفی، روانینێکی هاوشێوەی لەم بارەوە هەیە. ئەو باوەڕی بە ژمارەیەکی بێ سنووری زەمەن هەیە کە لەگەڵ پلە جیاوازەکانی بووندا پێوەندی هەیە و لە نێوان مادیبوون و رۆحانیبوونی رەهادا مسۆگەر دەبێت. زەمەنی شتە گەورە ئاسمانییەکان کە بەرهەمهاتووی حەرەکە ئاسمانی و بەردەوامەکانە دەکرێ دابەش بکرێت بە رابردوو، ئێستا و داهاتوو. چییەتیەکەی وەهایە کە تا رۆژێک تێپەڕ نەبێت، ئەو رۆژە دوایی نایەت. زەمەنی بوونەوەرە غەیرە مادیەکانیش تایبەتمەندی تەسەلسوولیان هەیە، بەڵام تێپەڕبوونی

زەمەنی شتە قەبە ئاسمانییەکان لەوانەدا وەهایە کە یەک ساڵی تەواو هاوسانە بە رۆژێک لە زەمەنی ئەوان. هەرچەند لە پلەی بوونەوەرە غەیرە مادیەکان سەرتر و سەرتر بڕۆین دەگەینە زەمەنی ئیلاهی. زەمەنێک کە بە شێوەی رەها لە کۆتوبەندی گوزەری بوون ئازادە. هەربۆیە نە دابەش دەکرێ، نە قبووڵی تەوالی دەکات و نە دەگۆڕدرێت. سەرترە لە هەرمانیی بوون. نە سەرەتای هەیە و نە ئەنجام. چاوی خودا گشت دیتنیەکان دەبینێت و گوێی هەموو شتە بیستنیەکانە و دەبیستێت و ئەمانە بە کردەوەیەکی دابەش نەکراو روو دەدات کە ناوی ئیدراکە. پێشینە و دێرین بوونی خودا ناگەڕێتەوە بۆ زەمەن، بەڵکو بە پێچەوانەوە زەمەنی ئیلاهی ئەو شتەیە کە قورئان بە ناوی"أم الکتاب"شەرحی دەکات و باس لەوە دەکات کە لەوێدا مێژوو، بەدەر لە ڕایەڵەی تەوالی لە ئێستایەکی ئەوپەڕی ئەبەدی تاقانەدا کۆکراوەتەوە. لەناو موتەکەلیمە ئیسلامییەکاندا زۆرترین سەرنج لە لایەن **فەخرەدین رازییەوە** کراوە سەبارەت بە بابەتی زەمەن. **رازی** لە کتێبی"مباحث المشرقية"گشت تیۆری هاوچەرخەکانی خۆی سەبارەت بە زەمەن خستە ناو شک و لێکۆڵینەوە. ئەویش لە بنەڕەتەوە شێوازەکەی خۆی لەسەر عەینیەت داناوە و هەربۆیە بێ توانایە لە گەیشتن بە ئاکامی بنبڕ. دەڵێت: تا ئێستا نەمدەتوانی هیچ کەشف بکەم کە لەڕاستییدا حەقیقەتێک سەبارەت بە چییەتی زەمەن بێت. مەبەستی سەرەکی لە کتێبەکەی مندا ئەوەیە کە چ شتێک بە گریمانەوە دەتوانێت لە بەرژەوەندی یان دژ بە تیۆریەک کە باس کراوە بێتە ئاراوە. بێ ئەوەی کە ئاوێتەی تەعەسوب و دەمارگرژی نەبێت. ئەو شتەی کە بە گشتی خۆمی لێ دەپارێزم بە تایبەت ئەگەر لە پەیوەندی لەگەڵ بابەتی زەمەندا بێت.

باسەکەی سەرەوە کە ئاراستە کرابە تەواوەتی ئەوە دەردەخات کە لە ناسینی چییەتی زەمەن تەنها بەشێک لە روانینی عەینی بە قازانجە. رێگەی دروست ئەوەیە کە شیکارییەکی دەروونناسانەی ورد لە ئەزموونی خودئاگای ئێمە بکرێت کە ئەم بابەتە بە تەنها چییەتی حەقیقی زەمەن ئاشکرا دەکات. وابیر دەکەمەوە کە ئێوە ئەو جیاوازییەی نێوان دوو لایەنی ناسێنەر و کارای"خود"کە لە بەرچاومان گرت لەبیرتان بێت. خودی ناسێنەر و مودریک لە سەقامگرتوویی رەهادا واتە لە گۆڕانکاریی بێ تەواللییدا ژیان دەباتە سەر. ژیانی خود بریتییە لە حەرەکەی ئەو لە قۆناغی درککردن و ناسینێک بەرەو کارامەیی، واتە لە دەروون بینییەوە و کەشفکردن بەرەو فیکرکردنەوە. لێرەوەیە کە حەرەکەی ئەتۆمی و زەڕەیی لەدایک دەبێت. بەم شێوەیە تایبەتمەندی ئەزموونی خودئاگا واتە خاڵی دەستپێکی ئێمە بەرەو هەرجۆرە مەعریفەیەک دەرگای چەمکێکمان لێ دەکاتەوە کە دژایەتی نێوان سەقامگرتوویی و دژوازی، دژایەتی نێوان زەمەن وەک گشتیەتێکی کۆکراوە لەگەڵ گشتییەتێکی هەرمانیی لەگەڵ زەمەنی ئەتۆمییدا لەناو دەبات. ئەگەر رێنموونی ئەزموونی خودئاگای خۆمان قبووڵ بکەین و ژیانی منی گشتگیر لەسەر قیاسی منی سنووردار وێنا بکەین، لەو کاتەدا زەمەنی منی نیهایی لە شێوازی گۆڕانی بێ تەواللییدا دەردەکەوێت. واتە گشتیەتێکی بە دیسیپلین کە بە هۆی حەرەکەی داهێنەرانەی منەوە لە روخساری زەڕەیەکدا دەردەکەوێت. ئەمەش هەمان بابەتە کە مەبەستی کەسانێکی وەک **میرداماد** و **مەلا باقر** بووە. لەوێدا کە باس دەکەن و دەڵێن زەمەن بە کردەوەی خولقاندنەوە لەدایک بووە، منی نیهایی بەو هۆی ئەوەوە، ئیمکانیاتی بێ ژماری خۆی درک دەکات و هەڵیان دەسەنگێنێت.

"من"لە لایەکەوە لە ناو ئەبەدیەتدا دەژی و مەبەستم لەم ئیستدلالە گۆڕانکارییەکی وەهایە کە تەسەلسوولی نییە و لە لایەکیترەوە من لە زەمەنی تەسەلسوولیدا دەژی. ئەم زەمەنە وەها وێنا دەکەم کە خاوەنی یەکگیریی و هەرمانیەتە بە واتایەک کە ئامێرێک بێت بۆ هەڵسەنگاندنی گۆڕانکاریی بێ تەسەلسوول. بە تێگەیشتن لەم بابەتەیە کە دەتوانین لەم ئایەتەی قورئان تێبگەین: ((وَلَهُ اخْتِلَافُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ)) واتە: "**جیاوازی نێوان شەو و ڕۆژ تایبەتە بەو...**". لە لێدوانەکەی پێشوودا سەبارەت بەم گرفتەی بەباتەکەمان بە ڕادەی پێویست قسەمان کرد. ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە لەم بابەتە تێپەڕ بین و بگەینە دوو سیفەتی مەعریفە و دەسەڵاتی ڕەهای ئیلاهی.

وشەی مەعریفە بەو شێوەی کە بۆ منی سنووردار بەکار دەبرێت، هەموو کات بە واتای مەعریفەی لاوەکی و ئیستدلالییە. واتە پرۆسەیەکی ناسەقامگرتوو کە بەدەوری"ئەویدی"یەکی راستەقینەدا دەگەڕێت کە خۆی بوونەوەرێکی خاوەن زاتە، ئەمە لە بەرامبەر منی ناسێنەردا ڕادەوەستێت. مەعریفە لەم واتایەدا تەنانەت ئەگەر تا پلەی زانستی رەهاش پەرەی پێبدەین هەمیشە دەبێ لەگەڵ ئەویدی بەرامبەری لە حاڵەتێکی رێژەییدا بمێنێتەوە. کەواتە ناکرێ لەخۆگری منی نیهایی بێت کە بە هۆی گشتگیریی و شموولیەتی، لە روانگەیەکدا کە منی سنووردارى تێدایە لەبەرچاو بگیردرێت. هەر بەوشێوەیە کە پێشتر زانیمان عالەمێکیتر لە بەرامبەر خودادا نییە کە خۆی بوونەوەرێکی خاوەن زات بێت، تەنها لەو کاتەدایە کە عالەم لە ڕوخساری ئەویدیەکی سەربەخۆدا دەردەکەوێت و ئێمە وەک ڕووداوێکی دیار لە مێژووی ژیانی خودادا سەیری دەکەین. لە روانگەتی منی گشتگیر و شموولدا ئەویدیەک بوونی نییە. لە بنەڕەتی ئەودا

ئەندێشە و کردەوە، کردەوەی مەعریفە و کردەوەی ئافراندن یەکسانە. وێدەچێت ئەم باسە بێتە ئاراوە کە من، چ موتەناهی بێت و چ ناموتەناهی بێ ئەوەی کە لەگەڵ غەیری مندا رووبەروو بێتەوە، وێنا ناکرێت. ئەگەر شتێک بەدەر لە منی نیهایی بوونی نەبێت ئەوکاتە ناکرێ منی نیهایی لە شێوازی منێکدا وێنا بکرێت. وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە کە بابەتە سلبییەکان لە لۆژیکدا هیچ قازانجێکیان نییە لەوەی کە شێواز ببەخشن بە وێنە ئیجابییەکان. وێنەیەک کە دەبێ لەسەر بنەڕەتی تایبەتمەندی واقیع و حەقیقەتدا وەها کە لە رەواڵەتدا دەردەکەون، دامەزرابێت. ئەگەر ئەزموون بخەینە بەر ڕەخنە بۆمان ئاشکرا دەبێت کە واقیع و حەقیقەتی نیهایی دەبێ ژیانێکی رێنموونی کراویان هەبێت بەپێی عەقڵ. بەپێی ئەزموونی ئێمەی مرۆڤەوە لە ژیان، بێجگە لە گشتیەتێکی تۆکمە نایەتە بەرچاومان. رێک وەک شتێک کە بە وردبینییەوە چندرابێت و خاوەنی خاڵێکی ناوەندییە کە گشت رشتەکانی پێوە تەندراوە. بە هۆی ئەم تایبەتمەندیەی ژیانەوەیە کە ژیانی کۆتایی تەنها لە قاڵبی خودێکدا وێنا دەکرێت. مەعریفە لە واتای ئیستدلالییدا هەرچەندیش کە سنووردار بێت، دیسان ناتوانێت هەڵگری منێکی ناسێنەر بێت کە خۆی هاوکات بواری بابەتی مودریک ساز دەکات. بە داخەوە کە لێرەدا وشە و کەلام ناتوانێت یارمەتیمان بدات. هیچ وشەیەکمان بەدەستەوە نییە تاکو بەوە بتوانین باس لەو جۆرە مەعریفەیە بکەین کە دەبێتە هۆی ئافراندنی بابەتەکەی خۆی. وێنەیەکیتر کە دەکرێ لە مەعریفەی ئیلاهییمان هەبێت، زانستی رەها و بێ سنوورە. واتە کردەوەیەکی ئیدراکی تاقانە و دابەشنەکراو کە خودا بێ راوەستان لە گشت گەڕیانی مێژوو، لە شێوازی ریزێک لە ڕووداوە تایبەتیەکان لە ئێستایەکی ئەبەدی دا ئاگادار دەکاتەوە. ئەمە وێنەیەکە کە **جەلالەدین دواتی، فەخرەدین عەراقی** و

پرۆفیسۆر **رویس** کە هاوچەرخمانە سەبارەت بە مەعریفەی خودا هەیانە. لەم وێناکردنەوەدا توخمێکی حەقیقەت شاراوەیە، بەڵام ئەوەی کە هەیە عالەمێکی داخراو و سنووردار نیشان دەدات کە خاوەنی داهاتوویەکە بە ڕووداوگەلی چەقبەستوو کە مەقەدەر کراوە. رشتەیەکە لە ڕووداوگەلی تایبەت و نەگۆڕ کە وەک چارەنووسێکی بەهێز سەرەتا و کۆتایی رێگەکانی چالاکی داهێنەری خودای دەستنیشان کردووە. دەبینین کە لەڕاستییدا مەعریفەی ئیلاهی بە شێوەیەکی رەها و ناچالاک دەبیندرێت کە شتێک زیاتر لە بابەتی بۆشایی راوەستاو لە فیزیای پێش **ئەنشتاین** نییە و بە راگرتنی شتەکان لە شوێنێکدا یەکگیرییەکی رەواڵەتی پێ بەخشیون. وەک جۆرێک ئاوێنە کە بەشێوەیەکی ناچالاک وردەکارییەکانی بینای ئەو شتانەی کە هێشتا کامڵ نەبوون دەنەخشێنێتەوە. خودئاگاییە سنووردارەکەی تەنها لە شێوازی پاژە و وردەشتی بێ پەیوەندی لەگەڵ یەکتردا دەردەخات. مەعریفەی ئیلاهی دەبێ لە شێوازی چالاکیەکی زیندووی داهێنەرانەدا وێنا بکەین کە شتە هەبووە سەربەخۆکان بە شێوەی ئیرادی پەیوەست بەون. هەڵبەت بەم شێوە باسکردنە لە خودا کە وەک ئاوێنەیەکی دەرخەر وایە، ئەم بابەتەش گومانی لێدەکرێت کە خودا بە نیسبەت ڕووداوەکانی داهاتوو ئاگاییەکی لەوە پێشی هەیە. ئاشکرایە کە بەم شێوەیە ئازادیمان لەویش سەندۆتەوە. داهاتوو لە گشتیەتی داهێنەرانەی خودادا بە ڕاستی بوونی هەبووە. ئەمە بە واتای دیسیپلینی رێکی ڕووداوەکان نییە کە قەبارەیەکی دیاریکراویشیان هەبێت بەڵکو لە شێوازی ئیمکانێکی کراوەدان. رەنگە نموونەیەک لەوبارەوە بتوانێت تێگەیشتن لەو بابەتەی کە مەبەستمانە ئاسانتر بکات. هەروەک چۆن برێجار لە مێژووی ئەندێشەکانی مرۆڤدا روو دەدات. وابیهێننە بەرچاو کە ئەندێشەیەکی

بەسوود کە لەباری ڕۆحییەوە خاوەنی ئیمکانیاتی تایبەتە دێتە ناو شێوازە خودئاگاییەکانتانەوە. ئێوە بێ ڕاوەستان ئەو ئەندێشەیە وەک گشتییەتێکی کۆمەڵ درک پێدەکەن. تێگەیشتنی عەقڵانی لە چەمکە بێ ئەژمارەکان بابەتێکە کە پێویستیی بە کات هەیە. لە باری دەروونبینی و موکاشەفە گشت ئیمکانیاتی ئەو ئەندێشەیە لە زەینی ئێوەدا ئامادەیە. ئەگەر ئیمکانێکی تایبەت لە چرکەساتێکی تایبەتدا لە باری عەقڵییەوە بۆتان ناسراو نەبووبێت لەبەرئەوە نییە کە مەعریفەی ئێوە نوقسانی هەیە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە هێشتا ئیمکانێک بۆ ئەوەی بناسرێت بوونی نییە. ئەندێشە بە پێشکەوتنی ئەزموون ئیمکانی بەکارهێنانی ئاشکرا دەکرێت. بڕێجار پێویستمان بە زیاتر لە جیلێک لە فەیلەسووفان دەبێت تاکو ئەم ئیمکانیاتە بە تەواوەتی بخرێتە بەرباس و لێکدانەوە و لێی تێبگەین. ئەگەر مەعریفەی ئیلاهی بە جۆرێک لە زانستی ڕەهای ناچالاک بزانین بە هیچ شێوەیەک ناتوانین لەم ئەندێشە تێبگەین کە جیهان خاوەنی داهێنەر و خوڵقێنەرە. ئەگەر مێژوو تەنها بەشێوەی وێنەگەلێکی لەوە پێش داڕێژراو لە بەرچاو بگیردرێت کە بەرەبەرە دەردەکەوێت، ئیتر تازە بوون و نوێخوازیی لەوێدا هیچ واتایەکی نامێنێت. لەئاکامدا ناتوانین هیچ مانایەک ببەخشین بە وشەی ئافراندن، لەبەرئەوەی کە ئەم وشەیە لەبەر کردەوەی تازە و بێ وێنەیەک کە کردوومانە دەبێتە خاوەنی واتا. لە ڕاستییدا گشت موجادەلە کەلامییەکان لە پەیوەندی لەگەڵ چارەنووسدا لەوێوە دێت کە بنەڕەتەکەی لەسەر لێکۆڵینەوەی زەینی ڕەهایە، بێ ئەوەی کە سەرنج بدرێتە هێزێکی خۆڕسکی ژیان کە بابەتێکی پراکتیکییە. بێگومان دەرکەوتنی منەکان کە مۆتۆربە کراون بە هێزێکی بزوێنەر و هەربۆیە کردەوەکانیان پێشبینی ناکرێت، لە واتایەکدا چەمکی سنووردارbوونی ئازادی، منی گشتگیر دەهێنێتەوە زەین. ئەم

سنووردداربوونه له دەرەوه نەسەپاوەته ناوەوه بەڵکو له ئازادی داهێنەریەوه سەرچاوەی گرتووه و ئەو بەم شێوه منه سنووردارەکانی هەڵبژاردووه تاکو له ناو ژیان، دەسەڵات و ئازادیەکەیدا بەشدار بن.

گریمانەی ئەوه هەیه که ئەم پرسیاره بێته ئاراوه که چۆن دەکرێ له نێوان سنووردداربوون و دەسەڵاتی ڕەهادا سازشتێک لەئارادا بێت. پێویست ناکات له وشەی سنووردداربوون بترسین. قورئان مەیلی بەرەولای گشتیەتی دەرهەست نییە، هەمیشه سەیری بابەته لەمسکراو و راستەقینەکان دەکات که تیۆری ڕێژەیی بوون لەم دواییانەدا فێری فەلسەفەی نوێی کردووه. هەر چالاکییەک چ ئافراندن بێت یان نەبێت جۆرێک سنووردداربوونه که بێ ئەوه وێناکردنی خودا وەک خودێکی خوڵقێنەر و بەرهەست، ئەستەمە. ئیماژی دەسەڵاتی رەها وەک دەرهەستێک، واته هێزێکی کوێر و لەرزۆک و پڕ له هەوەس که هیچ سنوورێک ناناسێت. قورئان له سرووشتەوه وەک عالەمێک که خاوەنی هێزی پەیوەست به یەکترەوەیه، چەمکێکی رووناک و ئاشکرا دەخاته بەر دەست. کەواته هێزی ڕەهای ئیلاهی له پەیوەندیەکی دۆستانەدا دەبینێت لەگەڵ حیکمەتی ئیلاهییداو ئەوه له نوێبوونەوه و دیسیپلین و رێکییدا دەبینێتەوه نەک له لەرزۆکبوون و هەوەسدا. قورئان لەهەمانکاتدا خودا وەک کەسێک که هەموو چاکیەکانی له ناو دەست دایه، دەهێنێته بەرچاو. ئەگەر ئیرادەی خودایی که ڕەگ و ڕیشەی له ناو عەقڵدایه بریتی بێت له ئیحسانکردن و چاکه، باسێکی زۆر جددی دێته پێش، واته بابەتی کامڵبوون که زانستی نوێ ئەوه به گەرەنتی رەنج و زەحمەت و هەڵەی گشتی دەزانێت. گومانی تێدا نییه که مرۆڤ خاوەن هەڵەیه و هەڵه تایبەته بەو، بەڵام رەنج و ژان حەقیقەتێکی دیاره که بەلانی کەمەوه بابەتێکی گشتییه. هەرچەند ئەمەش راسته که مرۆڤ

ئازاربەخشترین ئێشەکان تەنها لەبەرئەوەی کە بە چاکە و باشی دیویەتی، خستۆتە سەر شانی خۆی. گەندەڵی مەعنەوی و مادی لە ڕوخساری دوو واقیعی دیاردا لە ناو ژیانی سرووشتدا خۆیان دەنوێنن. ڕێژەییبوونی گەندەڵی و هەبوونی ئەو هێزانەی کە مەیلیان بەرەو گۆڕانکاریی هەیە ناتوانێت سووکنایی بێت بۆ ئەندێشەی ئێمە. لەبەرئەوەی بە هەبوونی گشت ئەم حاڵەتە ڕێژەییانە و گۆڕانی شێواز، شتێکی تێدایە کە بێ کەموکوڕی و بنبڕە. لەم حاڵەتەدا چۆن دەتوانین لە نێوان چاکە و دەسەڵاتی ڕەهای خودا لەگەڵ بارستاییەکی گەورەی گەندەڵی کە لە ناو مەخلووقەکانیدا هەیە سازشتێک دروست بکرێت؟ ئەمە بابەتێکی دژوارە و نهێنییەکی سەیرە لە خوداناسییدا. لە نێوان نووسەرەکانی ئەم دواییانەدا کەس بابەتەکەی لە **نومان** باشتر شیی نەکردۆتەوە. ئەو لە کتێبەکەیدا لە ژێر ناوی"کورتەیەک سەبارەت بە ئایین"دەڵێت:"ناسین و مەعریفەی ئێمە لە جیهان بەجۆرێکە کە فێرمانی دەکات خودایەکی توانا و زانا هەیە و ژیان و مەرگ پێکەوە وەک نوور و تاریکایی هاوکات دەهێنێتە خوارەوە. شتێکیش هەیە بە ناوی ئیلهام کە ئیمان بەوە کەسەکان دەگەیەنێتە ڕسکان. مەعریفە سەبارەت بەم بابەتە خودا تەعبیر دەکاتەوە بە"باوک". پەیڕەویکردن لە خودای جیهان ڕۆحیەتی شەڕکردن بۆ ژیان پەروەردە دەکات. پەرەستشی باوک، عیسا مەسیح بابەتی ئەخلاقی بەزەیی هاتن دروست دەکات، بەڵام ناکرێ هەرکامیان بە خودایەک بزانین، خودا یان جیهان و باوک واتە عیسا مەسیح هەردووکیان هەمان خودای تاقانەن. بە شێوەیەک ئەم دووانە پێکەوە ئاوێتە دەبن و ئەمە بابەتێکە کە هیچ بوونەوەرێکی فانی ناتوانێت ئەوە شیی بکاتەوە کە چۆن و لە کوێدا روو دەدات".

لـه روانگـەی **برۆنینـگ** ەوە کـە فـەیلەسـووفێکی گـەشـبینە هـەمـوو شـتەکـانی جیهـان باشـە، بـەڵام لـە روانگـەی شـۆپەنهـاوێرەوە[١] کـە فەیلەسووفێکی ڕەشبینە، جیهان زستانێکی ئەبەدییە کە ئیرادەیەکی کوێر خۆی لەوێدا وەک شتگەلی زیندوو و جۆراوجۆر ئاشکرا دەکات کە بۆ چرکەساتێکی کورت لـە دروستبوونیان غـەمگینن و پاشـان بۆ هـەمیشە بزر دەبن. لەم قۆناغە لە ناسینمان بەرامبەر بە جیهان هـەرگیز نـاتوانین سـەبـارەت بـە جیـاوازییەک کـە لـە نێـوان گـەشـبینی و ڕەشـبینی دەردەکەوێت، بڕیار بدەین. بینای عەقڵی ئێمە وەهایە کە تـەنها دەتوانین تێگەیشتنێکی کورتمـان سـەبارەت بە حـەقیقـەتی شـتەکان هـەبێت. ئێمـە ناتوانین هاوکات لە هێزگەلی مەزن و گەورەی ئاسمانی کە هەم شتەکان وێران دەکـەن و هـەم دەبنـە هـۆی پتـەوکردنی ژیـان تێبگـەین. وانـەکانی قورئان کە باوەڕی بە توانایی مرۆڤ هەیە بۆ چاککردنی رەفتارەکەی و هەروەها توانایی ئـەو بۆ چاودێرییکردنی هێزە سرووشتیەکان هـەیە و ئـەمـەش نـە لـەسـەر بنـەمای گـەشبینی دامـەزراوە و نـە لـەسـەر بنـەمای رەشبینی، بەڵکو بنەڕەتەکەی لەسەر ئیعتیدال و چاکەخوازی دامـەزراوە. عالەم بە کۆمەڵێکی گەشاوە دەزانێت کە بـە هیـوای سـەرکـەوتنی نیهـایی مرۆڤ بە سەر خراپەدا ژیانی سازکراوە.

کلیلـی تێگـەیـشتن لـەم گرفتـە لـە داسـتانێکدا باسـکراوە کـە نـاوی کەوتنەخوارەوەی ئادەمە. قورئان لە باسکردنی ئەم ئەفسانەدا بەشێک لە سـومبۆلـەکـانی کـەون ئـارا و پێـشوو دەپارێزێـت، بـەڵام مایـەی ئـەو

[1]– ئـارتور شـۆپینهاوێر، یەکێکە لە فەیلسووفە گەورەکانی ئەڵمـان و جیهـان کە لە فەلسەفەی ئەخلاق، ئەدەبیات و دەروونناسییدا خاوەنی پلە و پایەیە. ئەو نە حەزی لە مـادە دەکـرد و نە لە رۆح، بەڵکـو خوازیـاری دیتنـی جیهـانی هەبـوو بـوو. کتێبـی ئەم فەیلسووفە بەم ڕستەوە دست پێدەکات: جیهان وێناکردنی منە.

ئەفسانەیە دەخاتە ناو قاڵبێکی تازەوە تاکو چەمکێکی بە تەواوەتی نوێی پێ بدات. شێوازی قورئان لە گۆڕان یان ورچەرخاندنی بەشێک لەو ئەفسانانە لەوەدایە کە دەیەوێ بەو ئەندێشە تازانەوە گیانێکیان تێ بکاتەوە و بەم شێوەیە ئەوانە لەگەڵ زەمەندا سازگار بکات. ئەمە خاڵێکی گرنگە کە بە لانی کەمەوە هەمیشە هەم توێژەرە ئیسلامیەکان و هەم توێژەرە نائیسلامیەکان کە سەبارەت بە ئیسلام لێکۆڵینەوەیان کردووە ئەوەیان لەبەرچاو نەگرتووە. بە دەگمەن رێ دەکەوێت کە قورئان لە باسکردن لەم ئەفسانانە مەبەستی مێژوویی هەبێت، بەڵکو هەمیشە چاوی بڕیوەتە کاریگەریەتی کاملی ئەخلاقی یان فەلسەفی ئەوان. بەم شێوەیە کاردەکات کە ناوی کەسەکان و شوێنەکان بە رەنگی ڕووداوێکی مێژوویی تایبەتەوە رەنگ دەبەخشیت و سنوورداری دەکات. هەروەها لە ڕێگەی سڕینەوەی وردەکاریی جیاواز و بە هەستی جیاوازەوە ئەم مەبەستە بە ئەنجام دەگەیەنێت. وەها شێوازێک لە پەیوەندی لەگەڵ ئەفسانەدا بابەتێکی نائاشنا نییە. لە ئەدەبیاتی غەیرە ئایینیشدا باوە و یەک نموونەی ئەوەش داستانی فاوستە[1]. بلیمەت بوونی گۆتە چەمکێکی زۆر نوێی پێ بەخشیوە.

بگەڕێینەوە سەر باسەکەمان سەبارەت بە ئەفسانەی کەوتنە خوارەوەی ئادەم کە بە شێوەی جۆراوجۆر لە ئەدەبیاتی کەونی جیهاندا دەدۆزینەوە. دیاریکردنی سنوور و رادەی گەشەکردنی ئەم چیرۆکە و

---

١٢- فاوست ناوی کەسایەتییەکی بە ناوبانگ و سەمبۆلیکە کە لە لایەن گۆتەوە نووسراوە. فاوست لاوێکی خوێندەوار و ناهومێدە بەلامەلە کات و ساتێکدا بۆ بەدەستهێنانی پلە و پایە و تێپەڕین لە دۆخی ئاسایی خۆی، رۆحی دەفرۆشێت بە شەیتان، لە دوای ٢٤ ساڵ کە رۆعی تایبەت بووە بە شەیتان ئەو هێضە سیحراوییەی لێ دەسەندرێتەوە.

گێڕانـەوەیـەکـی روونـاک لـە خـوازە جۆراوجـۆرەکـانی مـرۆڤ کـە کاریگەریەتی هەیە لە گۆڕانی بەرەبەرەی ئەوەدا، بەڕاستی ئەستەمە. ئەگەر سەرنج بدەینە گێڕانەوەی جیاواز لەم ئۆستوورەیە دەبینین کە رەگ و ریشەی ئەم داستانە دەگەڕێتەوە بۆ ئاوات و ئارەزووی دووری مرۆڤی سەرەتاییەوە کە ویستوویەتی لەم ڕێگەیەوە قورسایی بێ دەرەتان بوون و رۆژگاری خراپی خۆی پیشان بدات. لە بارودۆخێکی ناسازگار و لێرویێژ لە نەخۆشی و مەرگدا کە هەموو هەوڵەکانی ئەوی بۆ پاراستن و پارێزگاریی خۆی بێسوود کردبوو. لەبەرئەوەی کە مرۆڤ دەسەلاتی بەسەر هێزەکانی سرووشتدا نەبووە هەربۆیە رەشبینی ئەو بەرامبەر بە ژیان زۆر ئاسایی دێتە بەرچاو. لەناو لەوحێکی کەونی بابیلییدا شەیتان دەبینین لە شێوازی ماردا کە سەمبۆلی پیاوەتییە و درەخت و ژن دەبینین کە سێوێک (سەمبۆلی) پێشکەش بە پیاو دەکات. واتای ئەم ئۆستورەیە دیارە، دەرکردن لە خۆشی و بەختەوەریی کە درابوو بە مرۆڤ بە هۆی کردەوەی جنسی کە لێی مەنعکرابوون لەحاڵێکدا کە ئەو کردەوەیە بۆ ئەو دوو کۆپلەیەی مرۆڤ ئاسایی بووە. ئەم داستانە کە لەناو قورئان و تەوراتدا هاتووە، کە پێکەوە قیاسیان دەکەین، دەبینین کە ڕێگەی قورئان بۆ باسکردنی ئەو بابەتە دیار و ئاشکراترە. هەڵسەنگاندنی خاڵە دیارەکانی نێوان گێڕانەوەکانی قورئان و تەورات، بێگومان سەرنجی ئێمە بەرەو گێڕانەوەی قورئان رادەکێشێت.

١ـ قورئان چیرۆکی شەیتانی مارنما و پەراسووی پیاو پێکەوە لادەبات. ئەم سڕینەوە بە ئاشکرا بە واتای رزگارکردنی داستان لە گرفتی سەمبۆلی خولقاندنە و هەروەها رزگاربوون لە رەشبینی بەرامبەر بە ژیان کە بواری سەرەکی چیرۆکە. سڕینەوەیەکیتر کە

رووده‌دات ئه‌م باوه‌ڕه ده‌سه‌لمێنێت كه مه‌به‌ستی قورئان گێڕانه‌وه‌ی مێژوو نییه، پێچه‌وانه‌ی ته‌ورات كه له‌م چیرۆكه‌دا، سه‌رچاوه‌ی په‌یدابوونی یه‌كه‌مین كۆپله‌ی مرۆڤ باس ده‌كات و ئه‌وه‌ش وه‌ك پێشه‌كیه‌ك له ناو داستانی ژیانی حهزره‌تی یه‌عقووب باس ده‌كات. له‌و ئایه‌تانه‌دا كه قورئان به ناوی بوونه‌وه‌ری زیندوو ده‌یخاته به‌ر باس و له‌وێدا وشه‌گه‌لی به‌شه‌ر یان مرۆڤ به‌كار ده‌بات. له‌وێدا كه باس له‌سه‌ر شیاویی خه‌لیفه‌ی ئیلاهییه له‌سه‌ر زه‌ویدا. وشه‌ی"ئاده‌م"به‌كارده‌بات. قورئان به لادانی ناوه تایبه‌ته‌كانی ئاده‌م و حه‌وا كه له ناو گێڕانه‌وه‌ی ته‌وراتدا هاتووه، مه‌به‌ستی خۆی له‌م سڕینه‌وه باشتر ئاشكرا ده‌كات. وشه‌ی ئاده‌م كه له قورئاندا وه‌ك ناوێك بۆ كه‌سێكی تایبه‌ت به‌كار نابات به‌ڵكو زیاتر وه‌ك چه‌مكێك به‌كار ده‌بات. هۆی به متمانه بۆ به‌كارهێنانی ئه‌م وشه‌یه له شێوازی باسكراودا ئه‌م خاڵه‌یه:

خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ((**وَلَقَدْ خَلَقْنَاكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَاكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلآئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ**)). واته: "**ئێوه‌مان خوڵقاندووه، پاشان نه‌خشمان پێداون. پاشان به فریشته‌كانمان وت: سوجده به‌رن بۆ ئاده‌م...**". (سوره‌تی الاعراف، به‌شێك له ئایه‌تی ١١).

٢ـ قورئان ئه‌م داستانه دابه‌ش ده‌كاته سه‌ر دوو حه‌كایه‌تی كورت و جیاواز له یه‌ك – یه‌كێكیان هه‌مان چیرۆكه كه ته‌نها به ناوی "دره‌خت" وه‌سف ده‌كرێت، ئه‌ویدی به ناوی "دره‌ختی خلوود"و سه‌ڵته‌نه‌تێك كه كۆن نابێت. یه‌كه‌مین داستان له حه‌وته‌مین سوره‌ت و دووهه‌مین له سوره‌تی بیسته‌مدا باس كراوه. به‌پێی وته‌ی قورئان سه‌رگه‌ردان و لاڕێبوونی ئاده‌م و ژنه‌كه‌ی له وه‌سوه‌سه‌ی شه‌یتانه‌وه‌یه كه كارێكی نییه بێجگه له دروستكردنی شك و گومان له زه‌ینی مرۆڤدا. ئه‌و بوو له

هەردوو درەختەکە پێی چێژاندن لە حاڵێکدا کە بەپێی وتەی تەورات ئادەم خێرا لە دوای یەکەمین سەرپێچی لە بەهەشتی عەدەن دەرکرا و خودا لە بەشی رۆژهەڵاتی بەهەشتدا مەلایکەتێکی داناوە و شمشێرێکی ئاگرین کە بۆ هەموو شوێنێک دەگەڕێ بۆ ئەوەی کە لە داری ژیان نزیک نەکەوێتەوە.

٣ـ تەورات زەوی لەعنەت دەکات بە هۆی سەرپێچی ئادەمەوە. قورئان زەوی بە "جێگەی حەسانەوە" و "سەرچاوەی مەعیشەت"ی مرۆڤ دەزانێت کە ئینسان دەبێ بە هۆی خاوەندارییەتیەکەی، سپاسی خودا بکات.

خوای گەورە دەفەرموێت: ((وَلَقَدْ مَكَّنَّاكُمْ فِي الأَرْضِ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَايِشَ قَلِيلاً مَّا تَشْكُرُونَ)). واتە: "**ئێوەمان لە زەوییدا جێگیر کرد و لەوێدا بۆ ئێوە ئیمکانیاتی ژیانمان ساز کردووە، بەڵام ئەو سپاسەی کە دەیکەن کەمە**". (سورەتی الاعراف، ئایەتی ١٠).

هیچ هۆیەکی نییە کە وابزانین وشەی"بەهەشت"کە لێرەدا بەکار براوە، بەهەشتێکە کە ئەوپەڕی ئیدراکی مرۆڤێکە کە لەسەر ئەم زەویەدا دەژی. بەپێی وتەی قورئان مرۆڤ لەم سەر گۆی زەوییەدا نامۆ نییە. قورئان دەڵێت لە زەوییمان خوڵقاندن. وشەی بەهەشت کە لەم چیرۆکەدا ئاماژەی پێکراوە بەو واتایە نییە کە جێگەی هەمیشەیی چاک کرداران بێت. لە قورئاندا بەهەشت بە شوێنێک وەسف کراوە کە (يَتَنَازَعُونَ فِيهَا كَأْساً لَّا لَغْوٌ فِيهَا وَلَا تَأْثِيمٌ) واتە: "**پەیکێک دەدەن و وەردەگرن بەڵام قسەی خراپی بەدواوە نییە**". (سورەتی الطور ئایەتی ٢٣). لە وەسفێکیتردا ئەوە بە جێگەیەک دەزانێت کە ((لَا يَمَسُّهُمْ فِيهَا نَصَبٌ وَمَا هُمْ مِنْهَا بِمُخْرَجِينَ)). واتە: "**لەوێدا هیچ ماندوویەتیەک تووشی کەسانی**

**چاکخواز نابێت و لەوێ ناڕۆنە دەر**"(سورەتی الحجر: ٤٨). بەڵام ئەو بەهەشتەی کە لەم داستانەدا ئاماژەی پێکراوە هەمان شوێنێکە کە یەکەمین ڕووداو لەوێدا خوڵقا و ئەویش گوناهی مرۆڤ بوو بە هۆی فەرمان شکاندن کە دەرکردنی بەدواوە بوو. لە ڕاستییدا قورئان خۆی واتای ئەم وشەیە بە جۆرێک کە بەکاری بردووە روون دەکاتەوە. لە بەشی دووهەمی ئەم داستانەدا بەهەشت وەک شوێنێک وەسف دەکات کە لەوێدا ((إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَى (*) وَأَنَّكَ لَا تَظْمَأُ فِيهَا وَلَا تَضْحَى)) واتە: "... **نە برسی دەبیت و نە رووت. نە تینووت دەبێت و نە هەتاو ئازارت دەدا**". (سورەتی طه، ئایەتی ١١٨-١١٩).

لەسەر ئەو باوەڕەم کە"بەهەشت"لە گێڕانەوەی قورئانییدا وێنەی بارودۆخی سەرەتایی مرۆڤە کە هیچ پەیوەندیەکی لەگەڵ دەوروپشتی خۆیدا نییە و هەربۆیە هەست بە عەزاب و ئازارەکانی ویست و پێویستییەکانی مرۆڤ ناکات. ئەو بابەتانەی کە سازبوونیان باس لە دەستپێکی فەرهەنگی مرۆییە.

بەمشێوەیە دەبینین کە قورئان لە چیرۆکێکدا کە باس لە داکەوتنی ئادەم دەکات، کاری بەسەر ئەوە نییە کە یەکەمجار مرۆڤ چۆن هاتە سەر ئەم زەوییە، مەبەستی زیاتر گێڕانەوەی بەرزبوونی مرۆڤە لە قۆناغە سەرەتاییەکان و غەریزەوە بۆ حاڵەتی ئاگایانەی خودی ئازاد کە دەتوانێت شک بکات و سەرپێچی بکات، ئەم دابەزینەی مرۆڤ بە هیچ شێوەیەک بە واتای گەندەڵی ئەخلاقی نییە، بەڵکو تێپەڕینی ئەوە لە قۆناغی ئاگایی سەرەتایی بۆ یەکەمین تیشکی خودئاگایی ئەو، هەروەها ئاگاداربوونەوەیە لە خەونی سرووشت کە بە هۆشیاربوونەوەی رۆحی و تاکیی لە ناخی کەسێکدا دروست دەبێت. قورئان زەوی بە شوێنی ئەشکەنجەدانی مرۆڤ نازانێت کە بە هۆی یەکەمین گوناهیەوە لەوێدا

دیل کرابێت. یەکەمین سەرپێچی مرۆڤ یەکەمین هەڵبژاردنی ئازادی ئەویش بووە. وەهایە کە بەپێی گێڕانەوەکانی قورئان یەکەمین سەرپێچی ئادەم بەخشرا. ئیتر ئیجبارێک نییە بۆ چاکبوون بەڵکو تەسلیمبوونی ئیختیاریی خودە بەو ئامانجە ئەخلاقیانەی کە بەرهەمی هاتووی هاوکاریی کردنی دڵخوازانەی منە ئازادەکانە پێکەوە. بوونێک کە کارەکانی وەک ماشینێک بە تەواوەتی لەوە پێش دارێژرابێت ناتوانێت پێکهێنەری چاکە و خراپە بێت. هەربۆیە مەرجی باشبوون لە ئازادیدایە. ئیزندان بە منی سنووردار بۆ ئەوەی کە بتوانێت پاش هەڵسەنگاندنی بایەخە رێژەییەکان رێگە جیاوازەکان هەڵبژێرێت کە لە بەرامبەریدایە و ئەمە بە ڕاستی کارێکی پر مەترسییە. ئازادی لە هەڵبژاردنی ئەو شتەی کە باشە لەخۆگری ئازادی لە هەڵبژاردنی ئەو شتەشدایە کە خراپە. ئەو خودایەی کە ئەم مەترسییەی قبووڵ کردووە نیشانی داوە کە متمانەیەکی لەرادە بەدەری هەیە بە مرۆڤ و ئێستا کاتی ئەوەیە کە مرۆڤیش وەڵامی ئەم متمانەیە بداتەوە. رەنگە تەنها ئەم متمانەکردنە بێت کە ئیمکانی تاقیکاریی و پەرەدان بە تواناییەکانی ئەم مرۆڤەی مسۆگەر کردبێت. کاتێک کە لە"باشترین بوونەوەر"ەکان دروست کرابێت و پاشان ببێتە"نزمترینی نزمەکان"هەربەوشێوەیە کە قورئان دەڵێت:

((وَنَبْلُوكُم بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً)) واتە: **"... ئێوەمان بۆ تاقیکردنەوە تووشی خێر و شەڕ کردووە..."**. (سورەتی الانبیاء ئایەتی ٣٥).

کەواتە خێر و شەڕ هەرچەند دژ بەیەکترن، بەڵام دەبێ لە گشتیەتێکدا پێکەوە روون بکرێنەوە. شتێک بە ناوی واقیعی ڕەهابوونی نییە لەبەرئەوەی کە ڕاستییەکان گشتیەتی خاوەن دیسیپلینن کە تێگەیشتن لە توخمەکانیان لە پێوەندی نێوانیانەوە مسۆگەر دەبێت. حوکمدانی لۆژیک، توخمەکانی واقیعێک لە یەکتر جودا دەکاتەوە بۆ

ئـەوەی نیـشان بـدات کـە ئـەوانـە وابـەسـتەی یـەکتـرن. بـەدەر لـەوە سرووشـتی خـود وەهایـە کـە خـۆی بـە شـێوازی"خـود"ێک دەپارێزێت. هەربۆیە دەست دەکات بە گەڕان بە شوێن مەعریفە، بردنـە سـەرەوەی متمانە بە خودو دەسەڵات یان بە پێی لێکدانەوەی قورئان،"سـەڵتەنـەتێک کـە هـەرگیـز کـۆن نابێـت". بـەشـی یـەکـەمـی داسـتانەکـە لـە قورئانـدا دەگەڕێتەوە بۆ حەز و تەمەنای مرۆڤ بۆ دەستگەیشتن بە مـەعریفە و بــەشــی دووهــەم دەگــەڕێتــەوە بــۆ پێویــستییەکــانی ســەبــارەت بــە بردنەسەرەوەی خود و دەسەڵات. سەبارەت بە بەشی یەکەم پێویست دەکات باس لە دوو خاڵ بکەین، یەکەم ئەوەی کە داستان بێ مـەودا و لـە دوای ئـەو ئایـەتانـە هـاتووە کـە ئـادەم بـەسـەرتـر دەزانێت بـەسـەر فریشتەکاندا بە هۆی بیرهاتنەوە و گێڕانـەوەی نـاوی شـتەکان. هـەروەک چۆن پێشتر باسم کردبوو مەبەست لەم ئایەتانـە ناسـاندنی تایبـەتمـەندی ئیدراکی مـەعریفـەی مرۆڤە. **مـەدەم بالواتسکی** کـە زانیاریەکی شیاو و بەرچاوی هەیە سەبارەت بە سەمبۆلیزمی کـەون ئـار، لـە کتێبـەکـەیدا بـە نـاوی ئـایینی شـاراوە دەڵێـت کـە درەخـت لـە روانگـەی خـەڵکـی ئـەو سـەردەمـەوە سـەمبۆلێک بـووە بـۆ زانینـی غـەیب و ناسـینی نهێنییـەکان. ئادەم بە ئاشکرا مەنعکرابوو کە لـە میوەی ئـەو دارە بخـوات. بـە گشتی خـودی سنووورداری ئـەو و هـەروەهـا هێـزەکانی هـەست و عـەقڵـی ئـەو لەگەڵ چەشنێکیتری مەعریفەدا رێک بووە. واتە ئەو جۆرە مەعریفەی کە بەدەستهێنانی زانیـاریی بـەرامبـەر بـە رەنـج و ئـازاری روانینـی بـە سـەبـر دەزانێت و تەنها ئەوە بـە جایز دەزانێت کـە بـەرەبـەرە کـۆ بکرێتـەوە. بـە گشت ئەو باسانەوە شەیتان ئەوی وەسوەسە کرد تاکو لـە میوەی داری قــەدەغــەکــراوی ناســینی نهێنییــەکــان بخــوات و ئــادەم تــەســلیمی ئــەم وەسوەسەیە بوو. ئـەم تـەسـلیمە نـە بـە هـۆی شـەرارەتـی نـاو زاتـی ئـەو

بەڵکو بەهۆی ئەوە بوو کە لە سرووشتدا مەخلووقێکی بەپەلە بوو. بەو شێوەیە چوو بە دوای ڕێگەیەکی قەدبڕ بۆ ناسین و مەعریفەدا. تەنها ڕێگەیەک کە بۆ چاکسازیی ئەم مەیل و ڕاکێشەرییە هەیە دانانی ئەوە لە ناو شوێنێکدا کە هەرچەند پڕە لە ئازار و ژان، بەڵام بۆ گەشەکردنی بەهرەکانی عەقڵی ئەو موناسەبەی زیاتری هەیە. هەربۆیە دەکرێ ئەوە باس بکەین کە خستنە ناو وەها بارودۆخێکی مادی و پڕ زەحمەت بۆ ئەوە نەبوو کە تەمێ بکرێت، بەڵکو زیاتر بۆ ئەوە بوو کە مەبەستی شەیتان جێبەجێ نەبێت. شەیتانێک کە وەک دوژمنی مرۆڤ بە ڕیاوە هەوڵی داوە تاکو ئەو لە چێژی گەشەکردن و پەرەی بەردەوامیی مەعریفە بێ ئاگا رابگرێت. ژیانی "من"ی سنووردار لەناو بارودۆخێکدا کە بەرهەمهێنەری لەمپەرە، پەیوەندی بەم پێشکەوتن و پەرەپێدانەوە هەیە کە ئەوەش دەبێ بەپێی ئەزموونێکی بالفعل بێت. ئەزموونی منی سنووردار کە ئیمکانیاتێکی پڕئەژماری لەبەردەمدایە بە شێوازی تاقیکاریی و هەڵە گەشە دەکات. هەڵە کە ڕەنگە بکرێ بە جۆرێک گەندەڵی عەقڵی بزانین وەک هەوڵدان و تاقیکاریی هۆکارێکی بەرچاوە بۆ سازکردنی ئەزموون. کەواتە هەڵە کە ڕەنگە بکرێت بە گەندەڵیەکی عەقڵی بزانین وەک هەوڵدان و تاقیکاریی، هۆکارێکی بنەڕەتییە لە سازدانی ئەزموونندا.

**دووهەمین بەش لە داستانی قورئان بەم شێوەیەیە:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ((**فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ الشَّيْطَانُ قَالَ يَا آدَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَى (*) فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى (*) ثُمَّ اجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَى (*)**)). واتە: "**شەیتان وەسوەسەی کرد و وتی: ئەی**

**ئادەم! تۆ ڕێنموونی دەکەم بەو دارەی خلوود و ئەو سەڵتەنەتـەی کـە کەون نابێت. لەو دارەیان خوارد و عەورەتەکانیان دەرکەوت و دەستیان کرد بەوەی کە بە گەڵاکانی بەهـەشـت بـەخۆیانـەوە بنووسـێنن. ئـادەم نافەرمانی خودای خۆی کرد و لـە ڕێ بـەدەر بـوو. پـاش ئـەوە خـودا هەڵیبژاردەوە و تۆبەکەی قبووڵ کرد و ڕێنموونی کرد**". (سورەتی طه، ئایەتی ١٢٠- ١٢٢).

لێرەدا تەوەری مانا لەسەر ئەمە دامـەزراوە کـە مـەیلی ژیـان ڕۆڵێکـی وەهای نییە لە بـەرامبـەر سـوڵتەیـەکی سـەقـامگرتوو کـە بـەسـەر ئەو، لـە قـاڵبی تـاکێکی راسـتەقینـە و عـەینـی لـە نـاو دەورەیـەکـی بـێ سـنووردا سەپاوە و ناتوانێت بـەرگریی لە خـۆی بکـات. ئادەم وەک بوونـەوەرێکـی فانی لـە مـەرگ کـە خـاڵی کۆتـایی ژیانـە دەترسـێت. تـەنها ڕێگـەیـەک کـە لەبەردەمییدایە گەیشتن بە جۆرێک هەرمانییە کە نە لەناو تاکدا بـەڵکو نە لـەنـاو کۆدایـە و بـە پـەروەردەکردنـی خـود مـسۆگـەر دەبێـت. خـواردنی میوەی قەدەغەکراو لە داری هەرمانیی بە واتای ئەوەیە کە ژیانی مرۆڤ لە ڕێگەی جیاوازی جۆری ژن و پیاو بوارێکی وەها فەراهەم دەکات کـە پێشاوپێش بـەر بگرێت بـە لـەنـاوچوونی کـامڵی خـۆی. وەک ئـەوەی کـە ژیـان بـە مـەرگ بڵـێ ئـەگـەر جیلێـک لـە زینـدووەکـان دروێنـە بکـەیـت، جیلێکیتـر دروسـت دەکـەم. قورئـان سـەمبۆلخـوازیی جنسـی فـەرهـەنگـی کـەون ئـارا نـەفـی دەکـات. هاوکـات ئیشـارەتێکیش دەکـات بـە یـەکـەمـین کردەوەی جنسی فەرهەنگی کـەون ئـارا و دروسـتبوونی هـەسـتی شـەرم کە دەبێتە هۆی ئێستریس و دڵەراوکێی ئادەم کە جەستەی ڕووتی خـۆی داپۆشێت. ئێستا ئیتـر ژیـانکردن واتـە سنوورێکی دیاریکراوت هـەبێت و تاکایەتیەکی عەینی و ڕاستـەقینـە. هـەر ئـەم تاکایـەتییە عـەینییـەیـە کە لـە شـکڵە زینـدووە جۆراوجـۆرەکانـدا ئاشـکرا دەبێـت، کـە منـی نیهـایی

ئیمکانیات و سامانی بیَ کۆتایی خۆی لەویدا دەردەخات. دەرکەوتن و زیادبوونی ئەو تاکانەی کە هەرکامیان دەیانەویت ئیمکانیاتی خۆیان دەربخەن و بە دوای بەدەستهینانی دەسەلاتەوەن، بە ناچار دەبنە هۆی سازکردنی دوژمنایەتی و شەڕی ترسناکی سەردەمە جیاوازەکان. قورئان دەلیت: ((جَمِيعاً بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ)). واتە: "**هەمووتان، هەندیکتان دوژمنی هەندیکیترن**". (سورەتی طه، بەشی یەکەمی ئایەتی ١٢٣).

ئەم ململانییەی تاکە دژوازەکان هەمان رەنجی جیهانیکە کە هەندیجار دەورەی ناسەقامگیری ژیان روونـاک یان رەش دەکات. سەبارەت بە مرۆڤ کە تاکایەتی لە قولایی کەسایەتی ئەودا رۆدەچیت، هاوکات ریگەی بەهەلە رۆیشتنیشی بۆ دەکاتەوە و چیرۆکی خەمینی ژیان واتایەکی خراپتر پەیدا دەکات. قبوولکردنی"خود"وەک شکلیک لە ژیان بە مانای گەرەنتی قبوولکردنی گشت هەلەکانی ئەو خودەیە کە سنووررداره. قورئان مرۆڤ بە شیوازیک پیناسە دەکات کە هەرچەند زیانی خۆی تیدایە، بەلام قبوولی ئەوەی کرد کە باری ئەو ئەمانەتە بخاتە سەرشانی خۆی کە ئاسمانەکان و زەوی و کیوەکان شانیان بەرنەدا.

خوای گەوە دەفەرمویت: ((إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُوماً جَهُولاً)). واتە: "**ئاگادار بن کە ئیمە ئەم ئەمانەتەمان دایە دەست ئاسمانەکان و زەوی و کیوەکان و ئەوان قبوولیان نەکرد و لیی ترسان، بەلام مرۆڤ ئەوەی قبوول کرد. لەبەرئەوەی کە پیشەی زولمکردنە و نەزانە**". (سورەتی الاحزاب، ئایەتی ٧٢).

بەم باسەوە ئایا دەبیَ بەرامبەر بە ئەمانەتی "بوون" بە گشت ئەو کیشە و گرفتانەیەوە کە هاوتایەتی بلیین بەلیَ یان نەخیر؟ بە وتەی

قورئان ئادەمیەت بە واتای راستەقینە بریتییە لە "سەبرکردن لە دژواری و ناو بەرزەخدا. . ."، بەڵام لەم قۆناغە لە کامڵبووندا کە ئێستا خود هەیەتی ناتوانین لەو ئیلتزامە تێبگەین کە گرنگایەتییەکی تەواوی هەیە و هێزی بزوێنەر پێک دەهێنێت. رەنگە ئەم هێزە "خود" دژ بە زەوالێک پتەو بکات کە هەر سات و کاتێک لەوانە بقەومێت. بابەتی وەها ئێمە دەکێشێنێتە ئەوپەڕی سنوورەکانی ئەندێشەوە. ئەمە هەمان نوقتەیەکە کە ئیمان بە سەرکەوتنی نیهایی خێر لە شێوازی تیۆریەکی ئاییندا ئاشکرا دەبێت. قورئان دەڵێت:

((وَاللّهُ غَالِبٌ عَلَى أَمْرِهِ وَلَـكِنَّ أَكْثَرَ النَّـاسِ لاَ يَعْلَمُـونَ)). واتە: "... **خودا زاڵە بەسەر کاری خۆیدا، بەڵام زۆربەی خەڵک ئەوە نازانن**". [یوسف : ٢١].

ئێستا بۆتان روون بووەوە کە چۆن دەکرێ لە رێی فەلسەفەوە چەمکی ئیسلامیی خودا بسەلمێنین. هاوکات هەروەک چۆن پێشتر باسمانکرد ئایین دەگاتە پلە سەرترەکانی فەلسەفە. رەزامەندی ئایین بە وێناکردنی رەها دەست ناکەوێت، ئایین بە دوای ناسین و مەعریفەیەکی کامڵترە و بە شوێن پەیوەندیەکی نزیکتر لەگەڵ حەقیقەتێکدا دەگەڕێت کە بە دوایدا دەگەڕێت.

ئەو بابەتەی کە دەبێتە هۆی ئەم پەیوەندییە، کردەوەی ستایش یان نوێژکردنە، کە دەگاتە ئیشراقی رۆحانی. کردەوەی راز و نیاز لەگەڵ خودا کاریگەریەتی لەسەر جۆرە جیاوازەکانی خودئاگایی دادەنێت. سەبارەت بە خودئاگایی پێغەمبەرانە دەبێ بوترێت کە ئەم جۆرە خودئاگاییە لە بنەڕەتەوە دەچێتە ناو دەڤەری داهێنەریەتییەوە. واتە جیهانێکی ئەخلاقیی نوێ سازدەکات کە دەڵێی لەوێدا پێغەمبەر وەحی و موکاشەفەکانی خۆی دەکاتە کردەوە. ئەم بابەتە لە لێدوانێکدا بە ناوی "چەمکی فەرهەنگی ئیسلامی" دەکەمەوە. بنەمای خودئاگایی عیرفانی

لەسەر تێگەیشتن و خودناسینەوە دامەزراوە و من هەوڵ دەدەم واتای نوێژکردن بەپێی ئەم چەمکە روون بکەمەوە. روانین کە ئەگەر سەرنج بدرێتە واتای نیهایی نوێژکردن بە تەواوەتی روون دەکرێتەوە. لێرەدا سەرنجی ئێوە رادەکێشم بۆ وتەیەک لە دەروونناسی گەورەی ئەمریکایی پرۆفیسۆر **ویلیام جیمز** کە دەڵێت:

"ئاوا دێتە بەرچاو کە مرۆڤەکان هەرچەند زانست دژیان بێت، درێژە بە نوێژکردن دەدەن تا کۆتایی دونیا مەگەر ئەوەی کە چییەتی زەینی ئەوان بگەرێتەوە بۆ حاڵەتێک کە ئێستا هیچی لێ نازانین. بواری غەریزی نوێژکەرەکان بەرهەمی پێویستی ئەم بابەتە دیارەیە کە هەرچەند خودە ئەزموونییەکان، خودێکن لە جۆری کۆمەڵایەتی، بەڵام هاورێی شایستە یان هاورازی بەرزی خۆی تەنها لە ناو جیهانی عیرفانی و ئارمانی دەتوانێت بدۆزێتەوە. زۆربەی مرۆڤەکان چ بەشێوەی بەردەوام و چ بەشێوەی جاروبار لەناو دڵی خۆیانەوە دەگەڕێنەوە سەری. لە رێی ئەم ناسینەوەیە کە بچووکترین کەسی ئەم گۆی زەوییە خۆی بە بایەخ و بە متمانە دەزانێت. لە لایەکیتریشەوە بۆ زۆربەی خەڵک کاتێک کە خودی کۆمەڵایەتی دەرەکی بێ هیوا و داماو دەبێت و کاتێک جیهان خاوەنی وەها حەشارگە و شوێنێکی متمانەکراو نەبێت، دەبێتە جەهەنەمێکی ترسناک. ئەگەر دەڵێم"بۆ زۆربەی خەڵک"بە سەرنجدان بەم شیمانهیە کە ئەوان لە باری هەستەوە کە بە شێوەی چاودێریکی مەعنەوی لە ناو خۆیاندا دەگەڕێت و تارادەیەکی زۆر پێکەوە جیاوازن. ئەوەش زۆرترین بەشی بنەڕەتی خودئاگایی ئەوان ساز دەکات. ئەوانەی کە ئەم هەستەیان زیاترە وێدەچێت کە بە ئیمانترین کەسەکانن. دڵنیام لەوەی کە تەنانەت ئەوانەی کە دەڵێن

زەڕەیەک لەو هەستە لە ناخیاندا نییە، خۆیان فریو دەدەن و لەڕاستییدا شتێک لەو هەست و حاڵەوە لە ناخیاندا هەڵگرتووە".

ئێستا سەرنج دەدەن کە نوێژکردن لە روانگەی دەروونناسیەوە لە بنەڕەتەوە بابەتێکی غەریزییە، هەرچەند کە لە باری ناسین و وەرگرتنی مەعریفە لە بیرکردنەوە دەچێت، بەڵام لە بەرزترین پلەیدا ئەندێشەیەکی تاقانەیە. ئەمەش وەک بیرکردنەوە پرۆسەی هاوئاهەنگی پێواوە بەم جیاوازییەوە کە لە نوێژکردندا پرۆسەی هاوئاهەنگ کردن لە ناو خۆیدا کۆدەبێتەوە و بەم شێوەیە هێزیکی نەناسراو بەدەست دەهێنێت کە عەقڵی رەها ناگاتە ناخی ئەو.

زەین لە رێگەی بیرکردنەوە کردەوەی حەقیقەت دەبینێت و بەدواییدا دەچێت، بەڵام لە کاتی راز و نیازدا ڕەوشتەکەی خۆی بەجێ دەهێڵێت کە پەیڕەوە و لە گشتیەتیکدا بە ئارامی دەبزوێت. لە ئەندێشەی سەرتر تێپەڕ دەبێت تاکو خۆی بگاتە حەقیقەتی ڕەها. مەبەستی لەو کارە ئەمەیە کە لە ناو ژیانییدا ببێتە شەریکی هوشیاری. لەم بارەوە ئیستیعارە و رەمزێک بوونی نییە. نوێژکردن ئامێرێکە بۆ ئیشراقی رۆحانی و کردەوەیەکی سرووشتیە کە بەم هۆیەوە دوورگەی بچووکی کەسایەتی ئێمە بارودۆخی دەگۆڕێت و دەچێتە ناو گشتیەتێکی گەورەترەوە. وامەزانن کە باسی تەڵقینکردن بە خود دەکەم. ئەم تەڵقینکردنەوە بە خود لە پێوەندی لەگەڵ بەربڵاویی سەرچاوەکانی ژیان لە لە ناخی منی مرۆڤدا هەیە ناتوانێت رۆڵ بگێڕێت. بە پێچەوانەی ئیشراقی رۆحانی کە لە رێگەی شکڵ دان بە کەسایەتی مرۆڤ هێزێکی تازەی پێ دەبەخشێت، هیچ کاریگەریەتیەکی ژیان بەخش و سەقامگرتوو لە خۆی بەجێ ناهێڵێت. هەروەها باسی هیچ میتۆدێکی تایبەت و پڕ لە نهێنی ناکەم سەبارەت بە بەدەستهێنانی مەعریفە. گشت

ئـەو شـتـەی کـە ئامـانجی منـە ئـەوەیـە کـە سـەرنجـی ئێـوە بـەرەولای ئەزموونی واقیعی مرۆڤ راکێشم کە مێژوویەکی لـە رابردوودا هـەیە و داهاتوویەکی لە پێشە. بێ هیچ گومانێک موتالایـەکی تایبـەت کـە عیرفان لـەم ئـەزموونـەدا ئـەنجامی داوە گـەلێک بـواری تـازەی"خـود"ی ئاشکرا کردووە.

ئـەدەبیاتی عیرفانی درەوشـاوەیـە، بـەڵام کۆمـەڵـەی زاراوەگـەلـی ئـەو باسـە کـە لـە ڕوخـسارە فیکرییـەکـانی مـا بعـد الطبیعـەی پـەرتووکـاو سـەرچاوەی گرتـووە، کاریگـەریـەتیـەکی ترسناکی لـە ئـەندێشـەی نوێدا هەیە. فیکری نوێی ئەفلاتوونیەکان کـە فیکرە عیرفانیـەکانیان هاتۆتـە نـاو مەسیحیەت و ئیسلامەوە، خودای تەعالا بـە عـەدەمێکی بێ نـاو دەزانێت کـە لـە وتـن نایـەت. بـەدواداچـوونی وەهـا فیکرێک ناتوانێت ڕەزامـەندی فیکـری نـوێ مـسۆگەر بکـات کـە داهـاتووە بـە ڕوانگـە عـەینییـەکـان و خوازیـاری ئـەزمـوونی زینـدوو و هـەسـت پێکراوە سـەبـارەت بـە خـودا. میـژووی نـەتـەوە و نـەژادە جیـاوازەکـان ئـەوەمـان پیـشان دەدات کـە شێوەی دەرکەوتوو لە ناو کردەوەی عیبادەتکردندا، مـەرجێکی پێویستە بـۆ وەهـا ئـەزموونێـک. نـوێژکردن لـە حـەقیقـەتدا کامڵکـاری پێویـستیی چـالاکی عـەقڵییـە کـە لـەوێدا سرووشـت موتـالا دەکرێت. بـە روانگـەی زانستییەوە سـەیری سرووشتکردن، پێوەندیـەکی نزیک لـە نێوان ئێمـە و ڕەفتاری راستەقینـەدا دروست دەکـات و بـەم شێوەیـە ئیدراکی نـاوەکی ئێمـە زیـاتر دەکـات بـۆ ئـەوەی کـە بـە شـێوازێکی قـووڵتر سـەیر بکرێت. ئێستا کـە قـسە گـەیشتە ئـەم شـوێنە، نـاتوانین چاوپۆشـی بکـەیـن لـە گێڕانەوەی پارچە شێعرێکی جوانی شاعیری عـارف مـەولانا کـە وەسفی گـەڕانی ئـەهلی تەسـەووف دەکات بۆ ناسینی حەقیقەتی رەها:

**دفتر صوفی سواد و حرف نیست**
**جز دل اسپید همچون برف نیست**
**زاد دانشمند آثار قلم**
**زاد صوفی چیست آثار قدم**
**همچو صیادی سوی اشکار شد**
**گام آهو دید و بر آثار چیست**
**چند گامش گام آهو در خور است**
**بعد از آن خود ناف آهو رهبر است**
**راه رفتن یک نفس بر بوی ناف**
**خوشتر از صد منزل گام و طواف**

ڕاستییەکەی هەر جۆرە توێژینەوە و گەڕانێک بۆ بەدەستهێنانی مەعریفە، لە بنەڕەتەوە شکڵێکە لە عیبادەتکردن. ئەو کەسەی کە وەک زانایەک دەڕوانێتە سرووشت هەروەک عارفێک لە کاری راز و نیازی خودایە. هەرچەند ئەو لە ئێستادا تەنها جێ پێی ئاسکەکە دەبینێت و شوێنی دەگرێت و بەم شێوەیە فۆرمی گەڕانەکەی دەگەیێنێتە کەمترین رادە، بەڵام لە ئاکامدا حەز و تینوویەتی بۆ سەرکەوتن، ئەو دەخاتە شوێنێکەوە کە لەوێدا یەک نەفەس لە بۆنی نافەی ئاسک، باشتر لە جێ پێکانی ئەو ئاسکە دەیگەیێنێتە مەبەستی خۆی. هەر ئەم خاڵە بە تەنها هێزی سەرکەوتن بەسەر سرووشتدا زیاتر دەکات و وەها ڕوانگەیەکی پێ دەبەخشێت کە فەلسەفە بە روانینی بەرتەسکی خۆی نایدۆزێتەوە. روانگەیەک کە هێزی عەقڵ و شهوود پشتیوانی نەبێت، رووخێنەر و نامرۆیی دەبێت. بۆئەوەی کە رۆحی مرۆڤ بەرز بێت هەردووی ئەمانە دەبێ پێکەوە پێوەند بدرێنەوە.

مەبەستی راستەقینە لە نوێژکردن کاتێک باشتر دەگاتە جێ کە ئەو کردەوەیە گروپی و یەکگرتوو بێت لەگەڵ دیتراندا. هەر راز و نیازێکی راستەقینە چییەتیەکی کۆمەڵایەتی هەیە. تەنانەت زاهیدی گۆشەنشینیش بە هیوای ئەوەی کە ڕەنگە دۆستایەتی و نزیکایەتی خودا بەدەست بهێنێت لە گۆشەکەی خۆیدا لە هەمووان نامۆ دەبێت. کۆبوونەوە یان یەکگرتن، یەکپارچەییەکە لە مرۆڤەکان کە مەبەستیکی هاوبەش ئەوان دەخاتە ناو ئەم کارەوە. خۆیان لە ناو مەبەستێکی تاکدا کۆ دەکەنەوە و"خود"ە ناوەکییەکانیان ئاشکرا دەکەن بەو مەبەستەی کە خوازەیەکی تاقانە لەوانەدا کاریگەر بێت. ئەمە ڕاستییەکە کە بنەماکەی لەسەر دەروونناسی دامەزراوە و باس لەوە دەکات کە یەکیەتی، هێزی درکی ئاسایی مرۆڤ زیاتر دەکات. قووڵایی دەبەخشێت بە هەستەکەی و تا ئەو رادەیە ئیرادە و تواناکەی بەهێز دەکات کە لە تەنیایی و تاکبوونییدا بۆی دەرنەکەوتبوو. ئەگەر وەک دیاردەیەکی دەروونناسیی سەیری نوێژکردن یان راز و نیاز لەگەڵ خودادا بکەین، دەبینین کە تا ئێستا وەک بابەتێکی پڕ لە نهێنی و نەکراوە ماوەتەوە. هێشتا زانستی دەروونناسی یاساکانی تایبەت بە سەرکەوتنی حەساسیەتی مرۆڤی بۆ ئاشکرا نەبووە. لەوکاتەدا کە دەکەوێتە بارودۆخی ئیجماع و یەکگرتن.

لە روانگەی ئیسلامەوە، ئیشراقی رۆحی کۆبوونەوە لەناو نوێژی جەماعەتدا خاڵێکی جێی سەرنجە. لە نوێژی جەماعەتی رۆژانەوە بگرە هەتا مەناسیکی حەج کە لە مەککەدا بەڕێوەدەچێت، دەتوانن تێبگەن کە شێوەی عیبادەتکردنی ئیسلامی چۆن بەرە بەرە دایرەی یەکگرتوویی مرۆیی بەربلاو کردووە. کەواتە نوێژکردن چ تاکی و چ بە جەماعەت، هیوای ناخ و دڵی مرۆڤ دەگێڕێتەوە بۆ وەرگرتنی وەڵامێک لەناو بێدەنگی ترسێنەری ئەم جیهانەدا. نوێژ پرۆسەی تاقانەی سڕینەوەی

حیجابەکانە کە"من"ی دۆزێنەر لە ڕێگەی ئەوەوە، لە هەمان چرکەساتدا کە خودی بوونی فەرامۆش و نەفی دەکات، لەهەمانکاتدا خۆی بەوە دەسەلمێنێت. بەم شێوەیە بایەخی خۆی وەک هۆکارێکی گەشەکردووە لە ژیانی عالەمدا دەدۆزێتەوە و پاساوی بۆ دەهێنێتەوە. لە بارودۆخی رۆحی مرۆڤ لەناو نویژدا کە بە بنەماکانی دەروونناسیی یەک دەگرێتەوە، دەردەکەوێت کە شکڵی عیبادەت لەناو ئیسلامدا خاوەنی دوو سومبۆلی سەلماندن و نەفیکردنە. بەپێی واقیعی دەرکەوتوو لە ئەزموونی نەتەوە جیاوازەکان، ئاشکرا دەبێت کە عیبادەت وەک کردەوەیەکی دەروونی، بە شێوازگەلی جۆراوجۆر دەرکەوتووە. قورئان دەڵێت: ((لِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكاً هُمْ نَاسِكُوهُ فَلَا يُنَازِعُنَّكَ فِي الْأَمْرِ وَادْعُ إِلَى رَبِّكَ إِنَّكَ لَعَلَى هُدًى مُّسْتَقِيمٍ (*) وَإِن جَادَلُوكَ فَقُلِ اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ (*) اللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ)).

**واتە: "بۆ هەر نەتەوەیەک ڕێگەیەکی قوربانیکردن (عیبادەت)مان داناوە کە پەیڕەوی بن. لەم کارەدا لەگەڵ تۆدا جەدەل نەکەن. ئەوان بەرەو خوداکەت بانگهێشت بکە کە تۆ پەیڕەوی ڕێنموونیەکی بێ لادانی. ئەگەر جەدەلیان لەگەڵ کردی بڵێ: خودا لەو کارانەی کە دەیکەن ئاگادار و زاناترە. لە ڕۆژی قیامەتدا سەبارەت بەو باسانەی کە لەوەدا دژوازییتان هەبوو، لەنێوانتاندا حوکم دەکات".** (سورەتی الحج ئایەتی ٦٧-٦٩).

چۆنیەتی عیبادەتکردن نابێ ببێتە هۆی شەڕسازبوون. ئەوەی کە دەبێ ڕوخسارتان بەرەو کام لایە بسوڕێنن، بەڕاستی بۆ ڕۆح و جەوهەری عیبادەت بابەتێکی بنەڕەتی نییە. قورئان باسێکی زۆر ڕوونی لەمبارەوە هەیە: ((وَلِلّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ اللّهِ)). واتە:

"**ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا تایبەتە بە خودا، ڕوو لە هەر کوێ بکەن لای خودا هەر ئەو شوێنەیە...**". (سورەتی البقرة، ئایەتی١١٥).

هەروەها دەفەرموێت: ((لَّيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَـكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْمَلآئِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّآئِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُواْ وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاء والضَّرَّاء وَحِينَ الْبَأْسِ أُولَـئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَـئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ)). واتە: "**چاکە ئەوە نییە کە ڕوخساری خۆتان بەرەو ڕۆژهەڵات یان ڕۆژئاوا بکەن، چاکە هی ئەو کەسەیە کە ئیمانی بە خودا و ڕۆژی جەزا و فریشتەکان و کتێبە ئاسمانییەکان و پێغەمبەرەکان هەیە، لەماڵی خۆی بە خزمان و هەتیوەکان و هەژاران و لە ڕێگە ماوەکان و داواکاران و ئازادی کوێلەکان دەدات و و نوێژ دەکات و زەکات دەدات، ئەوانەی کە کاتێک پەیمان دەبەستن، بەئەمەگن بۆ پەیمانەکەیان و ئەهلی سەبرن لە دژوارییدا و نەخۆشین و کاتی شەڕ، هەر ئەم کەسانەن کە ڕاستی دەکەنە رەفتار و خۆدەپارێزن**". (سورەتی البقرة، ئایەتی ١٧٧).

نابێ ئەم خاڵە گرنگەش فەرامۆش بکەین کە بارودۆخ و حاڵەتی جەستە هۆکاری ڕاستەقینەیە لە دەرخستنی شێوازی فیکر. ئەوەی کە ئیسلام بۆ نوێژکردن لایەنێکی تایبەتی لەبەرچاوگرتووە بۆ ئەوەیە کە لە جەماعەتدا هەستی یەکێتی دروست ببێت. چۆنیەتی نوێژکردن بە گشتی وەهایە کە چەمکی یەکسانی کۆمەڵایەتی دەخولقێنێت و گەشەی پێدەدا و بە هەمان ڕادە هەستکردن بە سەرتربوونی نەژاد و پلە و پایە لەناو عیبادەتکاراندا دەسڕێتەوە. بۆ وێنە ئەگەر بەرەهمەنە ئەشرافیەکان و بەدەماری باشووری هیندستان هەموو ڕۆژێک شان بەشانی ئەو

کەسانە بوەستن کە تەنانەت ئامادە نین لەمسیان بکەن، ئێوە بیر بکەنەوە کە چ شۆڕشیکی گەورە ڕوودەدات، وەها بزوتنەوەیەک کە هەرگیز لە هیچ کاتێکدا ڕووی نەداوە. لە یەکگرتنی منی گشتگیر کە هەموو منەکان دەخولقێنێت و دەیانپارێزێت، یەکێتی بنەڕەتی مرۆڤ دەست دەکەوێت. بەپێی وتەی قورئان دابەشکاریی مرۆڤەکان بەسەر نەژاد، نەتەوە و عەشیرەکان تەنها بە مەبەستی ناسینی ئەوانەیە. شکڵی ئیسلامی نوێژی جەماعەت بەدەر لەوەی کە بایەخی ئاگایی بەخشی هەیە و ناسین بەدوای خۆیدا دەهێنێت، زیاتر حەزێک دەنوێنێت کە دەیەوێت یەکێتی بنەڕەتی مرۆڤ بە شێوەی واقیعێک لەناو ژیاندا پیشان بدات و ئەمە بە لەناوبردنی هەموو ئەو لەمپەرانە مسۆگەر دەکات کە لە نێوان مرۆڤ و مرۆڤێکی تردایە.

## منی مرۆیی- ئازادی و هەرمانیی ئەو

قورئان تاکایەتی و بێ وێنەیی مرۆڤ بە وتەی ساکار و کاریگەری خۆی دەخاتە بەر سەرنج و بە باوەڕی من سەبارەت بە چارەنووسی ئەو وەک تاکێک، بەرامبەر بە ژیان ڕوانگەیەکی شەفاف و بنبڕی هەیە. بەرهەمی ئەم روانگەی قورئان سەبارەت بە مرۆڤ وەک تاکایەتیەکە کە وێنەی نییە بەو واتایە کە تەنها ئەوە کە بەرپرسی کردەوەکانی خۆیەتی و بۆ کەسێک ئەستەمە کە باری ئەوی دیکەش بخاتە سەرشانی خۆی. هەربۆیە قورئان ئەوە نەفی دەکاتەوە کە کەسێک خێری چاکە کرین و باوەڕی رزگاربوون، واتە ئەوەی کە کەسێک گوناهی ئەویتر یان چەند کەسێکیتر بخاتە ئەستۆی خۆی. سێ بابەتی زۆر رۆشن و دیار سەبارەت بە مرۆڤ لە قورئان تێدەگەین:

- ئەمەی کە مرۆڤ هەڵبژاردەی خودایە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((ثُمَّ اجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَى)). **واتە: "لە پاش ئەوە خودا ئەوی هەڵبژارد و تۆبەکەی قبووڵ کرد و ڕێنموونی کرد".** (سورەتی طه، ئایەتی ١٢٢).

- ئەوەی کە مرۆڤ بە گشت هەڵەکانیەوە جێگری خودایە لەناو زەوییدا: خوای گەورە دەفەرموێت: ((وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُواْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاء وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ)). واتە: **"کاتێک کە خودا بە**

**فریشتەکانی وت: من لە زەوییدا جێگرێک دەخولٌقێنم. وتیان: لەوێدا کەسێک دەخولٌقێنیت کە خراپە دەکات و خوێن دەڕێژێت، ئێمە بە پاکی تۆ پەرستش دەکەین و تەقدیسی تۆ دەکەین. وتی: من شتێک دەزانم کە ئێوە نازانن**". (سورەتی البقرة ئایەتی ٣٠).

هەروەها دەفەرموێت : ((وَهُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَائِفَ الْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ الْعِقَابِ وَإِنَّهُ لَغَفُورٌ رَحِيمٌ)). واتە: "**ئەوە کە ئێوەی کردووە بە جێگرەکانی ئەم زەوییە و هەندێک لە ئێوەی سەرتر داناوە لەوانی دیکە بۆ ئەو مەبەستەیە کە بەرامبەر بەو شتانەی کە بە ئێوەی داوە تاقییتان بکاتەوە**". (سورەتی الأنعام، ئایەتی ١٦٥)

ـ ئەوەی کە مرۆڤ ئەمانەتداری کەسایەتییەکی ئازادە کە بە بەرپرسارێتی خۆیەوە ئەوەی قبووڵ کردووە:

هەروەها دەفەرموێت: ((إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُوماً جَهُولاً)). واتە: "**ئێمە ئەم ئەمانەتەمان دایە ئاسمانەکان و زەوی و کێوەکان و قبووڵیان نەکرد و لێی ترسان و مرۆڤ ئەوەی قبووڵ کرد لەبەرئەوەی کە زاڵم و نەزان بوو**". (سورەتی الاحزاب، ئایەتی ٧٢)

بەڵام جێی سەرسوڕمانە ئەگەر بزانین یەکێتی و تاقانەیی خودئاگابوونی مرۆڤە کە سەنتەری کەسایەتی ئەو پێکدەهێنێت و هەرگیز بە شێوەیەکی واقیعی لەناو مێژووی ئیسلامدا نەکەوتۆتە بەر سەرنج. موتەکەلیمەکان رۆحیان بە جۆرێکی ناسکتری مادە یان"عرض محض"زانیوە کە لەگەڵ جەستەدا لەناو دەچێت و لە رۆژی جەزادا دیسان دەخولٌقێتەوە. فەیلەسووفە ئیسلامییەکان لە دەزگای فیکریی یۆنانییەکانەوە ئیلهامیان دەگرت. سەبارەت بە دیکەی قوتابخانەکان

پێویست دەکات ئەوە باس بکەین کە پەرەسەندنی ئیسلام بووە هۆی ئەوە کە کۆمەڵگەی دیکە وەک نەستووریەکان، جوولەکەکان و زەردەشتییەکان کە خاوەنی بیر و ڕای جیاواز بوون بێنە ناو کۆمەڵگەی ئیسلامییەوە. ڕوانگەی فیکری ئەوان لەگەڵ فەرهەنگێکدا بیچمی گرتبوو کە چەمکەکانی دەسەڵاتێکی درێژخایەنی هەبوو بەسەر هەموو ئاسیای ناوەڕاست و رۆژئاوا. ئەم فەرهەنگە کە بە گشتی لە ریشەوە هەتا گەڵا و میوەکەی مەجلیسی بوو، وێنەیەک کە لە رۆح هەیەتی لەسەر بنەمای دووالیتەیە و کەم تا کورتێک ئەوە لە ناو ئەندێشەی کەلامی ئیسلامییدا دەبینینەوە. تەنها تەسەووف دامەزراوە لەسەر زوهدە کە هەوڵی داوە لە واتای یەکێتی ئەزموونی دەروونی تێبگات. قورئان ئەوەی بە یەکێک لە سێ سەرچاوەی بەدەستهێنانی مەعریفە زانیوە و دووی دیکەش دەبێتە مێژوو و سرووشت. گەشەکردوویی و کامڵبوونی ئەم ئەزموونە لە ژیانی ئایینی ئیسلامدا خۆی لە"انا الحق"ی بەناوبانگی **مەنصور حەلاج** دەگەینێتە تەشقی خۆی. هاوچەرخەکانی **حەلاج** وەک خەلیفەکانی سەردەم ئەم وتەیان بە بەرهەمی باوەڕهەبوون بە یەکێتی وجوود زانیوە. ئەو پارچانەی کە لە وتەکانی **حەلاج** بەجێماوە و لەلایەن رۆژهەڵاتناسیی فەرەنسی **ماسینیۆن**، کۆکراوەتەوە و بڵاویش بووەوە، هیچ گومانێکی تێدا ناهێڵێتەوە کە مەبەستی ئەو سۆفییە شەهیدە ناکرێ ئینکاری خودای گەورە بێت. کەواتە لێکدانەوەی دروستی ئەزموونی حەلاج ئەمە نییە کە بڵێین ئەو دڵۆپێکە کە چووە ناو دەریاوە، بەڵکو بەو ئەزموون و وتەیەی کە هەمیشە دەمێنێتەوە، واقیع و هەرمانیی منی مرۆڤی لە ناو کەسایەتییەکی قووڵتردا پیشان دا و بە ئازاییەوە سەلماندی. وتەکەی **حەلاج** لە دەنگ دەربڕینێک دەچێت بەرامبەر بە موتەکەلیمەکان. بەهەر شێوە ئەوانەی کە ئەمڕۆکە بەدوای توێژینەوە

لەناو بابەتە ئايينيەكاندان گرفتەكەيان سەبارەت بەم جۆرە ئەزموونە ئەوەيە كە لە سەرەتاوە بە تەواوەتى رێكە و نۆرمى هەيە، بەڵام كاتێك دەگاتە كەماڵ، ئاوڕ لە لايەنەكانى نەناسراوى خودئاگايى دەبێت. ئيبن خەلدوون زۆر زياتر لەمە هەستى بەوە دەكرد كە شێوازێكى زانستى و كاريگەر بۆ ئەو لێكۆڵينەوە و لايەنە نەناسراوانەى خودئاگايى بەكاربهێنرێت. دەروونناسيى نوێ لەم دواييانەدا پێويستبوونى ئەم شێوازەى باسكردووە، بەڵام هێشتا نەيتوانيوە ئەوپەڕى لايەنە پڕ لە نهێنى و خەسڵەتەكانى تايبەتى خودئاگايى بدۆزێتەوە. لەبەرئەوەى كە هێشتا شێوازێكى زانستييمان لەبەردەستدا نييە كە بكرێت جۆرێك لە ئەزموون هەڵسەنگێنين كە بەشێوەى لۆژيك دان بنێت بە ئەزموونەكەى **حەلاج**، هەربۆيە ناتوانين لە هێزەكەى سوود وەرگرين كە ڕەنگە بتوانێت وەك ئەزموون يان ئاگايى و مەعريفەيەك گەشە بكات.

چەمكى شێوازە كەلاميەكان حيجابێكيان پێوەيە كە لە زاراوەى ـ ما بعد الطبيعە ـ كان پێكهاتووە و ماوەى بەسەرچووە و بە هيچ شێوەيەك ناتوانن بۆ ئەو كەسانە قازانجيان هەبێت كە خاوەنى بوارێكى فيكريى جياوازن. كەواتە ئەو ئەركەى كە ئەمڕۆكە لە بەردەم مسوڵمانەكاندايە لەڕادەبەدەر مەترسييدارە. مسوڵمانى ئەمڕۆكە دەبێ گشت دام و دەزگاى ئيسلام سەرلەنوێ هەڵبسەنگێنێتەوە بێ ئەوەى كە بە تەواوەتى لە رابردووەكەى دابببڕێت. رەنگە يەكەمين مسوڵمانێك كە هەستى كرد دەبێ رۆحێكى تازە بێيتە ناو ئيسلامەوە، **شاە وەلى اللە دەهلوى** بێت، بەڵام ئەو كەسەى كە گرنگايەتى و قورسيى ئەم ئەركەى بە تەواوەتى زانى، **جەمالەدين ئەسەدئابادى** بوو، كە قووڵ روانينى لە ناو مێژووى فيكر و ژيانى ئيسلامييدا بەو ئەزموونە بەربڵاوەى خۆى لە مرۆڤەكان و رەفتار و ئاكاريان ئەوى كردووە بە ئەڵقەيەكى پەيوەندى زيندوو لە

نێوان رابردوو و داهاتوودا. ئەگەر هێزی ماندوونەناسیی لە یەک لایەندا دەکەوتە کار و خۆی بە تەواوەتی دەکردە وەقفی ئیسلام وەک سیستمێکی باوەڕکردن و ڕێنموونی کار، ئەمڕۆکە جیهانی ئیسلام لە باری عەقڵەوە ژێرخانێکی پتەوتری هەبوو. تەنها ڕێگەی کراوە لەبەردەماندا ئەمەیە کە هاوکات لەگەڵ پاراستنی سەربەخۆیی فیکری خۆمان لە زانست و ئاگایی نوێیەوە نزیکتر بکەین، ڕێزی لێبگرین و ئامۆژگارییەکانی قورئان لە ژێر تیشکەکەیدا درک بکەین و لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەین. تەنانەت ئەگەر ببێتە هۆی جیاوازی بیروڕا لەگەڵ کەسانێکدا کە بەر لە ئێمە بەم ڕێگەیەدا ڕۆیشتوون. ئەمە شێوەیەکە کە من ئەمەوێ لەناو باسەکەی بەردەستدا لەبەرچاوی بگرم.

لە ناو مێژووی بیری نوێدا تەنها برادلی[١] باشترین دیۆکیۆمێنت و بەڵگەی خستۆتە بەردەستمان بۆ ئەوەی کە بزانین ئەستەمە نکولی لە واقیعی"من"بکەین.

ئەو لە کتێبەکەیدا بە ناوی "لێکۆڵینەوە ئەخلاقییەکان" باس لەوە دەکات کە "خود" واقیعێکی هەیە و لە ناو کتێبی"لۆژیک"دا وەک تیۆر و بابەتێکی باوەڕپێکراوی کاریگەر قبووڵی دەکات. لە کتێبی"دەرکەوتە و واقیع"دا من دەخاتە بەر تاقیکارییەکی قووڵ. دوو بەش لە کتێبە دواییەکەی کە ناوی واتا و واقیعی خودە، لەڕاستییدا دەکرێ بە جۆرێک ئوپانیشادی[٢] نوێ و ئەمڕۆیی بزانین کە سەبارەت بە خەیاڵی بوونی

---

[1]- برادلی فەیلسووفی ئایدیالیستی بەریتانییە کە لە فەلسەفەی مێتافیزیکدا خاوەنی ئەزموونە. ئەو دەڵێ زانست و مێتافیزیک نەک موتالای پچڕ پچڕ و بڵاوی جیهانە کە دەرفەتێکی کاتی بێت بەڵکو بریتییە لە ناسینی جیهان لە گشتییەتی خۆیدا و بۆ هەمیشە.

[2]- ئوپانیشاد بریتییە لە دوایین بەشی وداکان کە کاکڵ و ناوەرۆکی ڕاهێنانەکانی ودایە. مەبەستی ئوپانیشاد دۆزینەوەی نهێنییەکان و لایەنی شاردراوەی سرووشت و هێزە جیهانییەکان نییە بەڵکو مەبەستی ناسین و بە کردەوەکردنی واقیعی هەبوو و باتنە.

جیوئاتمایە[1]. بەپێی وتەکەی ئەو تاقیکاریی واقیع واتە رزگاربوون لە کۆتوبەندی دژوازی. رەخنەگربوونی ئەو ئەوەمان بۆ دەردەخات کە سنووری بەرتەسکی ئەزموونی ئێمە بە پارادۆکسی گەورە وەک گۆڕان و سەقامگرتوویی خەوشی تێکەوتووە. هەربۆیە دەڵێت کە"من"وەهم و خەیاڵی ڕەهایە و باس لەوە دەکات کە هەر جۆرە باوەڕێک کە سەبارەت بە خود هەمانبێت و ئەوە بە هەست یان هاوشێوەیی بە خود یان رۆح و ئیرادە بزانین، گشتیان تەنها بە ریساکانی هزرە کە دەخرێتە بەر پێوەر و هەڵسەنگاندن. ئەندێشە بابەتێکی رێژەییە و هەرچی رێژەیی بێت پارادۆکسیش لەخۆدەگرێت. هەرچەند کە لۆژیکی بێ بەزەیی برادلی منی وەک کۆمەڵێکی ئاڵۆز و نادیار پیشان داوە، بەڵام ناچار ئەوەی قبووڵ کردووە کە خود دەبێ بە یەک مانا واقیعی بێت، ئەویش واقیعێک کە گومانی تێدا نەکرێت.

بە ئاسانی دەکرێ ئەوە قبووڵ بکەین کە"من"لە ناو سنووری بەرتەسکی خۆیدا وەک یەکگرتنێکی بەرچاوی ژیان، ناتەواوە و بۆشایی تێدایە. سرووشتەکەی لە ڕاستییدا بەجۆرێکە کە خوازیاریی یەکگرتنێکی گشتگیرتر، کاریگەرتر، هەڵسەنگاوتر و تایبەتە کە مەیلی زۆری هەیە بۆ ئەم بابەتە. کێیە کە ئاگاداری جۆرەکانی ئەو شوێنە جیاوازانەیە کە "من" پێویستیی پێیەتی؟ ئێستا لە قۆناغیک لە یەکگرتنەکەی خۆیدایە کە بێ ئارامیی و خاویی بەردەوامیی بەرهەمهاتووی خەو، ناتوانێت درێژە بە هەوڵ و تێکۆشانی خۆی بدات. برێجار وێدەچێت کە خوازەیەکی ورد یەکگرتنەکەی تێک بشکێنێت و هێزی چاودێریکاری تێک بشکێنێت.

[1]- جیوئاتما واتە گیان و رۆح. لەگەڵ ئاتمان بە یەکێکی دەزانن و باس لەوە دەکەن کە سنووردارییەتی جەستە لە بەر نەفس و زەینە کە دەبێتە هۆی ئەوەی کە جەستە لە واتای حەقیقی خۆی دوور بکەوێتەوە.

ئـەندێـشە تـا ئەو ڕادەیـە قـووڵە کـە توانـایی لێکۆڵینـەوە و لێکدانـەوە و شـیکاریی هـەبێت، بـەڵام هـەسـتی"خـودی"ئێمـە تـا ئـەو ڕادەیـە قـووڵ و بەهێزە کە بتوانێت ئـەمـە لـە وتـەکانی پرۆفیسۆر **برادلی** سـەبارەت بـە واقیعی من دەربهێنێت کە بە نابەدڵیی قبووڵی کردووە.

بەمشێوەیە سەنتەری سنووریداری ئەزموون، واقیعە و ڕاستییەکەشی زۆر قووڵترە لـەوەی کـە بخرێتـە بازنـەی عـەقڵـەوە. خـاڵی جیاکاریی مـن لەچییدایە؟ من، مرۆڤێک کە خۆی بـەشـێوەی یـەکێتییـەک ئاشکرا دەکات کە بـەنـاوی حاڵـەتـی زەینی دەناسرێت. ئـەم حاڵـەتانـە بـەشـێوەی جیا و تاکبوونیان نییە، بەڵکو پێویست و مەلزوومی یەکترن. ئـەوانـە بـەشـێوەی گشتییەتیەک بوونیان هـەیە کە نـاوی زەینـە. یـەکێتـی ئالی ئـەم حاڵـەتـە پەیوەستانە بە یەکتر یان باشترە وابڵێین ئەم ڕووداوانەی کە پەیـوەسـتن بـەیـەکتـرەوە، جـۆرێکی تایبـەتـە لـە یـەکێتـی کـە لـە بنـەڕەتـەوە لـەگـەڵ یەکگرتنی بەشەکانی شتێکی مادییدا جیاوازە، لەبەرئەوەی کە پارچـەکانی شـتێک دەکـرێ بـە شـێوەی جیـاواز لـە یـەکتـریش بوونیـان هـەبێت. لـە حاڵێکدا کە یـەکێتی زەینی تـاکێکی ڕەهایـە. بـۆ وێنـە نـاتوانین بـاس لـەوە بکەین کە بڵێین یـەکێک لـە بیر و بـاوەڕەکانم لـە لای ڕاست یـان چـەپی بـاوەرەکـەیترمدایـە. هـەروەهـا نـاکرێ بڵێـین کـە مـەدحکردنـی مـن لـە جوانی"تـاج محـل"بـە دوورکـەوتنـەوە لـە شـاری "آگـرا" دەگۆڕدرێت. ئـەو ئەندێشەی کە لە زەینی مندا سەبارەت بە شـوێن دەگـوزەرێت، پێوەنـدی نێوان شـوێنەکانی تێدا نییـە. لـە ڕاسـتییدا"مـن"دەتوانێت بیر لـە چـەنـدین شوێنی جیاواز بکاتەوە. شوێنی خودئاگایی بەخەبەر و شوێن یان فەزای خەون هیچ پەیوەندیەکی بەرامبـەریـان لـەگـەڵ یـەکتـردا نییـە. ئـەم دووانـە تێکەڵ بە یەک نابن و ناچنە سـەر یەک، لەبەرئەوەی کە بۆ جەسـتە تـەنهـا یـەک شـوێن دەکـرێ بـوونی هـەبێت. "مـن" لـەم بـارەوە وەک جـەسـتـە

سنووردار نییه، هەروەها ڕووداوە زەینی و عەینییەکان هەردووکیان لە زەمەندا دەخولقێن، بەڵام مەودای زەمەنی ڕووداوی "من" لەگەڵ مەودای ڕوودانی بابەتێکی مادی یان عەینییدا جیاوازی هەیە. بەردەوامیی ڕووداوی مادی بە شێوەی واقیعێکی ئێستا لە ناو شوێندا بەربڵاوە. لەکاتێکدا کە بەردەوامیی "من" لەوێدا کۆبووەتەوە و لەگەڵ ئێستا و داهاتووەکەیدا بە شێوەیەکی تاک پەیوەندی هەیە. هەر ڕووداوێکی مادی کە دەخولقێت دیارە کە چەندین نیشانەی لە زەمەنی ئێستادا لەگەڵ خۆی هەڵگرتووە کە پیشانمان دەدات لە نێوان بەردەوامیی زەمەنی رابردووەوە تێپەڕ بووە. ئەم نیشانانە تەنها باس لە بەردەوامیی کاتەکەی دەکات نەک ئەوەی کە خودی ئەوان هەمان بەردەوامیی زەمەن بن. بەردەوامیی زەمەنی راستەقینە تەنها تایبەتە بە "من" یان خودەوە.

تایبەتمەندییەکی دیکەی یەکێتی "من" تاکبوونی من و زاتی ئەوە کە پیشاندەری تاکبوونی گشت منەکانە. پێویستیی گەیشتن بە ئامانجێکی بنبڕ لەناو لۆژیکدا ئەوەیە کە هەردوو ڕستەی پێشەکی قیاس واتە کەم و زۆر پێکەوە لە لایەن فیکری کەسێکەوە قبووڵ بکرێن. ئەگەر زەینی من ڕستەی "هەر مرۆڤێک دەمرێت"وەربگرێت و زەینێکیتر ڕستەی" سوقرات مرۆڤە "قبووڵ بکات لەوەها پێشەکییەک هیچ ئامانجێک دەست نادات. تەنها کاتێک دەتوانین بگەینە ئامانجێک کە هەردوو ڕستەکەمان قبووڵ بێت، هەروەها مەیلی من بۆ بابەتێکی دیاریکراو تەنها بە خۆمەوە پێوەندی هەیە و ئەو شەوقەی کە لە گەیشتن بە ئاواتەکەم دەستم دەکەوێت. ئەگەر گشت مرۆڤەکان بە شوێن شتێکەوە بن کە من نەتوانم ئەو شتە بەدەست بهێنم دیارە ئەو شادی و حەزەی کە ئەوان لە گەیشتن بەو شتانە بەدەستی دەهێنن لەمندا دروست نابێت. ڕەنگە

دوکتۆری ددان بەزەیی بێت بە ئێشی ددانمدا، بەڵام ناتوانێت لەو ژانە تێبگات. چێژەکان و ئاوات و حەزەکانم تەنها تایبەتە بە من و بەشێک لە منی تایبەت دروست دەکەن. هەست، نەفرەت، میهرەبانی، حوکمکردن و بڕیارەکانم تەنها تایبەتن بە من. وای دابنێین کە خودایەکیش هەیە، ئەگەر زیاتر لە ڕێگەیەکی بۆ کردەوەکان خستبێتە بەرپێی من، ناتوانێت لە جیاتی من ڕێگەیەک هەڵبژێرێت، چونکە هەست و حوکمکردنی منی نییە. هەر بەو جۆرە ئەگەر ئێستا کەسێک بناسمەوە دەبێ لەوە پێش ئەوم دیبێت. ئاشنایی من لەگەڵ شوێن یان کەسێکدا بە واتای گەڕانەوەم بۆ ئەزموونی خۆمە نەک گەڕانەوە بۆ ئەزموونی رابردووی کەسێکیتر. ئەمە پەیوەندییەکانی هاوبەش و بێ وێنەی حاڵەتە بەرامبەرەکانە کە ئەوانە بە وشەی "من" پێناسە دەکەین و هەر لێرەدایە کە گرفت و پرسیاری گەورەی دەروونناسیی خۆی دەنوێنێت. چییەتی ئەم منە لە چییدایە؟ قوتابخانەی کەلامی ئیسلام کە غەزالی نوێنەری بەرجەستەیەتی، "من" بە جەوهەرێکی رۆحی ساکار و بێ خەوش دەزانێت کە دابەش ناکرێت و دەگۆڕدرێت و بە گشتی لەگەڵ گروپی حاڵەتە زەینییەکانماندا جیاوازە و تێپەڕبوونی کات کاریگەریەتی لەسەر دانانێت. ئەزموونی خودئاگا خاوەنی یەکێتییەکە، لەبەرئەوەی کە حاڵەتە زەینییەکانی ئێمە بە شێوەی کوالیتەی جیاواز لە پێوەندی لەگەڵ ئەم جەوهەرە ساکارەدان. لەکاتێکدا کە ئەم کوالیتەیە لەوێدا لە گەڕیاندایە، بێ گۆڕانکاریی دەمێننەوە. تەنها کاتێک دەتوانم ئێوە بناسمەوە کە لە مەودای درکی یەکەمین تاکو ئێستا و کردەوەی بیرەوەری مندا، بێ گۆڕانکاریی مابێتمەوە. بنەمای فیکری ئەم قوتابخانەیە لەسەر فەلسەفە بوو و دەروونناسیی رۆڵێکی وەها نەبووە. ئەگەربێتو بوونی رۆح بە پێناسەی واقیعە ئەزموونکراوەکانی خودئاگامان بزانین یان بە بناغەی

هەرمانیی ناوبەرین، من لەوە دەترسم کە ئەم روانگەیانە نە لە باری دەروناسییەوە قازانجێکی بۆمان هەبێت و نە لە باری فەلسەفییەوە. ئەو پارادۆکسەی کە لە عەقڵی ڕەهای کانتدا هەیە لە لایەن خوێندکارانی فەلسەفەی نوێیەوە ناسراوە. بەپێی وتەی **کانت** "من بیر دەکەمەوە" ڕستەیەکە کە هاوڕێی هەر ئەندێشەیەکە و ڕواڵەتی هەر ئەندێشەیەکە. تێپەڕین لە بارودۆخی ڕواڵەتی ئەندێشە بۆ جەوهەری هەستیی ناسیی بە تەواوەتی هەڵەیە. بەدەر لە جۆری روانینی **کانت** بۆ بابەتی ئەزموون دابەش نەکردنی جەوهەر هۆیەک نییە بۆ مانەوەی ئەوە. وێدەچێت کە وەک کوالیتەیەکی گووشراو بەرەبەرە لەناو عەدەمدا نوقم بێت یان لەناکاو لە بوون ڕاوەستێت. ئەمەش واتە بێ جووڵە بوون و نەگۆڕبوونی جەوهەر کە لە روانگەی دەروونناسییەوە هیچ سوودێکی نییە. یەکەم ئەوەی کە وێناکردنی ئەم بابەتە کە توخمەکانی ئەزموونی خودئاگا لە کوالیتەکان دەچن، بۆ جەوهەری رۆح دژوارە، بەو واتایە کە بۆ وێنەکێشی شتێکی ماددی بەشێکە لە چییەتی ئەو شتە. بە ڕوانین دەردەکەوێت کە ئەزموونەکان کردەوەگەلێکی تایبەتن لەسەر بنەمای بەڵگەهێنانەوە، هەربۆیە بوونێکی تایبەتی خۆیان هەیە. هەر بەو شێوەیە کە لێرەدا باسی لێ دەکات ئەزموونەکان فۆرم دەبەخشن بە جیهانێکی نوێ نەک ئەوەی کە تەنها ڕوخساری نوێ بن لە ناو جیهانێکی کەوندا. دووهەم ئەوەی کە ئەگەر ئەزموونەکان وەک کوالیتەکان چاو لێبکەین ناتوانین لەوە بگەین کە ئەوانە چۆن دەبنە زاتی جەوهەری رۆح؟ کەواتە دەبینین کە لەم تیۆریەدا ئەزموونی خودئاگا بە هیچ شێوەیەک ناتوانێت ئێمە ڕێنموونی بکات بۆ چییەتی "من" کە بە جەوهەری رۆح دەزانرێت. لە روانگەی ئەم تیۆرەوە جەوهەری رۆح خۆی لەناو ئەزموونداا ئاشکرا ناکات. هەروەها دەبێ باس لەوە بکەین کە ئیمکانی زاڵبوونی رۆحە

جیاوازەکان لە کاتگەلێکی جیاوازدا لە ناو یەک جەستەدا ئەستەمە، هەربۆیە ئەم تیۆرە ناتوانێت هیچ پێناسەیەکی باوەڕپێکراومان لە دیاردەگەلی وەک گۆڕانی کەسایەتییەکان پێ ببەخشێت. لە رابردوودا ئەو دیاردانە بە زاڵبوونی کاتیی رۆحی خراپ و شەیتانی بەسەر جەستەدا دەزانرا.

دەکرێ باس لەوە بکەین کە ئەگەر یەک رێگە بۆ گەیشتن بە من و تێگەیشتن لەوە هەبێت، ئەویش لە رێگەی لێکدانەوەیەکەوە مسۆگەر دەبێت کە ئەزموونی خودئاگا دەیکات. لێرەدا ئیزنم بدەن روو بکەینە دەروونناسیی نوێ تاکو بزانین چۆن چییەتی"من"روون دەکاتەوە. واتە گەڕیانی ئاگایانەی گۆڕانکارییەکان کە بەردەوامییان هەستی پێکراوە. لەم پەیوەندییەدا جۆرێک یاسای گشتی دۆزینەی گروپ دەست دەخرێت کە لە ئەزموونەکانماندا بەسوودە. وەک ئەوەی چەندین قولابییان هەبێت و بەم شێوەیە یەکتر لەناو لافاوی ژیانی زەینییدا بدزنەوە."من"بریتیە لە هەستگەلی ژیانی تاکی و هەربۆیە بە بەشێک لە دەزگای ئەندێشە. هەرکام لە زەربەتەکانی ئەندێشە چ ئامادە بێت و چ لە حاڵی لەناوچووندا بێت، یەکێتییەکی دابەش نەکراوە کە ناسێنەر و بیرهێنەرەوەیە. "من" بریتییە لە جێگربوونی زەربەتی نوێی ئەندێشە لە جیاتی ئەو زەربەتانەی کە خەریکن لەبەین دەچن. بەمشێوەیە ئەو زەربانەی کە پێکدێت، جێگەی زەربەکانی ئێستا دەگرێتەوە. ئەم وەسفە لە ژیانی زەینی بە ڕاستی وەستایانەیە، بەڵام بە دڵنیاییەوە دەڵێم سەبارەت بەو خودئاگاییەوە کە لە خۆماندا هەمانە یەک ناگرێت. خودئاگایی کۆیەک لە بەشەکان و پاژەکان نییە کە لەگەڵ یەکتردا گۆڕینەوەی زانیارییەکانیان هەبێت، بەڵکو یەکەیەکە کە لەوە پێش لەگەڵ ژیانی زەینییدا ئاوێتە دەبێت. وەها باوەڕێک سەبارەت بە خودئاگایی نە تەنها هیچ یارمەتیەکمان نادات بۆ ناسینی "من" بەڵکو بە تەواوەتی غافڵمان دەکات لەو توخمە تاڕادەیەک سەقامگرتووە کە لەناو ئەزموونداا هەیە.

لەنێوان ئەندێشە کاتییەکاندا هیچ پەیوەستەبوونێک نییە. کاتێک یەکێک لە زەربەکانی ئەندێشە ئامادە دەبێت ئەویدی بە تەواوەتی نادیار دەبێت. کەواتە ئەندێشە ئامادەکان چۆن دەتوانن ئەو ئەندێشە کاتییانە کە بۆ هەمیشە بزربوون پەیدا بکەن و زاڵ ببن بەسەریدا. نامەوێ بڵێم کە "من" باڵاتر و سەرترە لەو بەشانەی کە کاریگەریەتی لەسەر یەکتر دادەنێن و ئێمە ئەوە بە ئەزموون ناو دەبەین. ئەزموونی باطنی واتە"من"لە حاڵی کارکردندایە. ژیانی "من" جۆرێک ململانێی بەرهەمهاتوو لە هێرشبردنی منە بۆ شوێن و هەروەها هێرشبردنی شوێنەکەیە بۆ من. من لە دەرەوەی پانتایی ئەم ململانێیە نییە و وەک هێزێکی رێنموونی کار لەو پانتایەدا ئامادەیە و بە ئەزموونی تایبەتی خۆی شکڵ دەگرێت و پتەو دەبێت. قورئان سەبارەت بە رۆڵی رێنموونیکاری "من" باسێکی ئاشکرای هەیە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((**وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً**)). واتە: "لە تۆ سەبارەت بە رۆح دەپرسن، بڵێ: **رۆح لە ئەمری خودای مندایە و هەندێک زانیارییان بەخشیوە بە ئێوە**". (سورەتی بنی اسرائيل، ئایەتی ٨٧)

بۆ ئەوەی کە لە وشەی ئەمر تێبگەین دەبێ ئەو جیاوازییە لەبەرچاو بگرین کە قورئان لە نێوان ئەمر و خوڵقاندندا دایناوە.

**پرینجێل پێتی سون**، بەداخەوەیە لەوەی کە زمانی ئینگلیزی بۆ گێڕانەوەی پێوەندی نێوان خودا و عالەمی هەستپێکراو واتە موڵک لە لایەکەوە و پەیوەندی نێوان خودا و منی مرۆیی تەنها یەک وشەی"ئافراندن"ی لەدەستدایە. زمانی عەرەبی لەم بارەوە بارودۆخێکی باشتری هەیە، ئەم زمانە بۆ گێڕانەوەی دوو جۆر کردەوەی ئافراندنی خودا کە بۆمان ناسراوە دوو زاراوەی"خوڵقاندن"و"ئەمر"ی هەیە. وشەی خوڵقاندن هاومانای ئافراندنە و ئەمریش بە واتای فەرمانە. هەر

بەوجۆرە کە قورئان دەڵێت:"**خوڵقاندن و ئەمر تایبەتە بەو**". ئەو ئایەتەی کە گێڕدراپەوە بەو واتایەیە کە چییەتی سەرەکی رۆح دەستوور و فەرمانێکە لەبەرئەوەی کە لە هێزی ئەمری خوداوە سەرچاوە دەگرێت. هەرچەند ئەم بابەتە بۆ ئێمە سەربەمۆرە کە چۆن ئەمری خودایی لە شێوازی یەکەی "من"دا ئەرکی خۆیان بەڕێوە دەبەن؟ ئاوەڵناوی تاکی لە ناو وشەی (ربي)، واتە خوداکەم لەو ئایەتەدا، چییەتی و ڕەفتاری من ڕوون دەکاتەوە. دەیەوێت باس لەوە بکات کە رۆح هەرچەند لە باری پلە، هاوسەنگی و کارامە بوونیەوە جۆراوجۆری هەیە دەبێ بە شتێکی تاک و تەنها لەبەرچاو بگیردرێت. قورئان دەڵێت:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((**قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَى شَاكِلَتِهِ فَرَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَنْ هُوَ أَهْدَى سَبِيلاً**)). واتە: "**بڵێ کە هەرکەس بەپێی خسڵەتی خۆی رەفتار دەکات. خودای ئێوە زاناترە کە رێگەی چ کەسێک لە رێنموونییەوە نزیکترە**". (سورەتی بنی اسرائیل، ئایەتی ٨٤).

کەواتە کەسایەتی ڕاستەقینەم شتێک نییە بەڵکو کردەوەیەکە. ئەزموونەکەم تەنها ریزێکە لەو کردەوانەی کە پێکەوە لە پێوەندی بەرامبەردان و یەکێتییەک بە مەبەستی رێنموونیکردن بە یەکترەوە گرێ دەدات. نابێ من وەک شتێک تەنها لە شوێنیکدا یان ریزێک ئەزموون بە دیسیپلینێکی زەمەنییەوە وێنا بکەن بەڵکو دەبێ لە داوەرییەکانم، لە حاڵەتەکانی ئیرادەم، لە مەبەست و ئاواتەکانم تێبگەن و لێکی بدەنەوە و هەڵیسەنگێنن.

پرسیاری دوایی ئەمەیە: "من" چۆن لەناو دیسیپلینێکی شوێن-زەمەنییدا دەردەکەوێت؟ باسی قورئان لەم بارەوە زۆر ئاشکرایە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ (*) ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ (*) ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَاماً فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْماً ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقاً آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ)). واتە: "**بەڕاستی کە مرۆڤمان لە هەوێنی گڵ خوڵقاندووە و پاشان ئەومان وەک نوتفەیەک لە شوێنێکدا نیشتەجێ کرد. دوایی نوتفەمان کردە دەڵەمە خوێنێک و ئەو دەڵەمەمان کردە پارچە گۆشتێک و پاشان پارچە گۆشتەکەمان کردە ئێسقان و گۆشتمان بەبەر ئێسقانەکان کرد. دوای ئەوە خەسڵەتێکمان بەخشیە ئەو. گەورەیە خودای بێ هاوتا کە باشترین خوڵقێنەرە**". (سورەتی المؤمنون، ئایەتی ١٢-١٤).

کەواتە خوڵقاندنێکیتری مرۆڤ بەپێی ئۆرگانیزمی ماددی پەرە دەسەنێت. ئەمە بە واتای کۆبوونەوەی منە پەراوێزیەکانە کە منی قووڵ بەم شێوەیە بەردەوام کاریگەریەتی لەسەرم دادەنێت و ئەو ئیمکانەم بۆ دەخوڵقێنێت کە یەکگرتنێکی بنەڕەتی و پتەوم هەبێت لەسەر بنەمای ئەزموون. ئایا رۆح یان نەفس و جەستەی مرۆڤ بەو مانایە کە مەبەستی **دیکارت**[1] بووە، یان دوو شتی سەربەخۆ لە یەکترن کە بە شێوەیەکی نهێنی خاوەنی یەکگرتنن؟ بە باوەڕی من ئەو تیۆرەی کە مادە بە بوونەوەرێکی سەربەخۆ دەزانێت بە تەواوەتی بێ بنەمایە. ئەم تیۆرە تەنها لەسەر ئەساسی هەستەکانی ئێمە دەکرێ پاساوی بۆ

---

[1]دیکارت لە بەشی چوارەمی ریسالەی " گوتار"دا باس لەوە دەکات: من جەوهەرێکم کە چییەتی یان تەبعی من پەیوەستە بە فکری هەبوونەوە. بوونی منیش پێویستی بە شوێن نییە و نەبەستراوەتەوە بە بابەتێکی ماددییەوە. ئەوەی کە رۆحی منە و نەفسی منە لە جەستەم جیایە و ناسینەکەشی لە ناسینی جەستەم ئاسانترە. ئەگەر جەستە نەبووایە رۆح بە تەواوەتی دەردەکەوت.

بهێنرێتەوە. بەم جۆرە کە مادده لانیکەم بەشێکە لە هۆکاری خولْقاندن یان هەستی کە جیایە لە نەفسی خۆم. ئەم شتەی کە لەگەڵ خۆمدا جیاوازە لەناو فەلسەفەی دیکارتدا ئاوەها لەبەرچاو گیراوە کە خاوەنی کۆمەڵە خەسڵەتێکە و ئەوەش بە ناوی خسڵەتە سەرەکییەکان دەناسرێت کە هاوتەرازی هەستە ڕاستەقینەکانی بوونی منە. من بیروباوەڕەکەم بەو شێوەیە بە دروست دەزانم کە ئەم بنەمایە ڕاستە کە هۆ دەبێ هەندێ هاوشێوەیی هەبێت لەگەڵ هۆکاردا، بەڵام پێویست ناکات کە هۆکار لێکچوونی هەبێت لەگەڵ هۆدا. ئەگەر بێت و سەرکەوتنی من لەناو ژیاندا ببێتە هۆی چارەڕەشی کەسێکتر لەوکاتەدا سەرکەوتنی من و چارەڕەشی ئەو هیچ جۆرە هاوشێوەییەکیان نییە. ئەزموونی رۆژانە و زانستی فیزیا لەسەر ئەم بنەمایە دامەزراوە کە مادە بوونێکی سەربەخۆی هەیە. بەم جۆرە باشتر وایە کە وای دانێین کە جەستە و رۆح دوو بابەتی لەیەکتر جیان، بەڵام بەشێوەیەکی نهێنی و نەناسراو خاوەنی یەکییەتیین. وتەکانی **دیکارت** و باوەڕی نیهایی ئەو سەبارەت بەم بابەتە، تاڕادەیەکی زۆر کاریگەرێتی لەو باوەڕانەی مەسیحییەت وەرگرتووە کە لە سەدەکانی سەرەتادا لە ژێر دزەی"مانویت"دا بووە. بەهەرحاڵ ئەگەر جەستە و رۆح دوو شتی سەربەخۆ بن و لەسەر یەکتر کاریگەریەتی دانەنێن، کەواتە گۆڕانکارییەکانیان رێک لەسەر دوو هێڵی تەریبدا حەرەکە دەکات. بەو جۆرەی کە **لایب نیتس** باسی لێدەکات، خاوەنی جۆرێک هاوئاهەنگی لەوە پێش داڕێژراون. لەم کاتەدا رۆح دەکات بە چاودێرێکی بێ ئیرادە کە هیچ کاریگەریەتییەکی نییە لەسەر ڕووداوەکانی جەستەدا. لەلایەکیترەوە ئەگەر وایدانێین کە ئەم دووانە کاریگەریەتی لەسهر یەکتر دادەنێن، لەوکاتەدا ناکرێ هیچ ڕاستییەکی بینراو بدۆزینەوە کە بە وردی ئەوە پیشان بدات کە

کاریگەرێتی بەرامبەریان چۆنە و لە کوێدا روودەدات و کامیانە کە دەستپێکاری ئەو پێوەندییەیە. ئەم بیرۆکە کە رۆح ئەندامێکە لە جەستە کە بۆ مەبەستی پێوەندیدار بە فیزیۆلۆژییەوە کەڵکی لێوەردەگیرێت یان ئەوەی کە جەستە ئامێرێکە بۆ ئامانجەکانی رۆح، هەردووکیان لە روانگەی تیۆری کاریگەریەتی بەرامبەر لەسەر یەکتر دروستە.

ڕوانینی **لانگ** سەبارەت بە عاتیفە و سۆز ئەوە پیشان دەدات کە لە کردەوەی بەرامبەردا جەستە دەستپێکارە، بەڵام هەندێ ڕاستیی هەن کە لەگەڵ ئەم تیۆرەدا دژکارن. لێرەدا مەجالی ئەوە نییە کە بەوردی باسیان لێبکەین، بەڵام دەبێ باس لەوە بکەین کە تەنانەت ئەگەر جەستە دەستپێکار بێت رۆح وەک هۆکارێکی وەرگر لە ناو قۆناغیکی دیاریکراوی عاتیفەدا دەردەکەوێت. ئەمە سەبارەت بە دیکەی خوازە دەرەکییەکانیش کە بە شێوەی بەردەوام لەسەر رۆح کاریگەریەتی دادەنێن دروستە. ئەگەر سۆزێک زیاتر گەشە بکات یان خوازەیەک درێژە بە کارەکەی بدات، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕادە سەرنجەی کە ئێمە پێی دەدەین. ئەمە رۆحە کە لە ئاکامدا سەبارەت بە چارەنووسی سۆز یان خوازەکانی بڕیار دەدات.

کەواتە هیچکام لە تیۆریەکانی بالانس و کاریگەریەتی بەرامبەر قەناعەتمان پێ ناهێنن، بەڵام جەستە و رۆح لە کردەوەدا دەبن بە یەک. کاتێک کتێبێک لەسەر مێزەکە هەڵدەگرم، کردەوەیەکم بەڕێوەبردووە کە دابەش ناکرێت، ناتوانین لەم کردەوەیەدا هێڵێک بکێشین لە نێوان ئەو بەشەی جەستە و ئەو بەشەی رۆح کە رۆڵیان گێڕاوە، کەواتە هەردووکیان دەبێ وابەستەی یەک دەزگا بن کە بەپێی وتەی قورئان هەم تایبەتە بە یەک دەزگا: خوڵقاندن یان ئافراندن و ئەمر واتە فەرمان کە تایبەتە بەو، بە چ شێوەیەک ئەم شتانە درک دەکرێن و وێنا دەکرێن؟

زانیمان کە جەستە شتێک نییە کە لە بۆشایی ڕەهادا هەبێت، بەڵکو کۆمەڵێکە لەو ڕووداو یان کردەوەکانە. کۆی ئەو کردەوانەی کە بە رۆح یان منی دەزانین ریزێکە لە کردەوەکان و ئەم بابەتە جیایی نێوان رۆح و جەستە ناسڕێتەوە، بەڵکو ئەوان لە یەکتر نزیک دەکاتەوە. تایبەتمەندی من لە خودئافراندنیایەتی، کردەوەگەلی پێکهێنەر و تێکەڵکاری ئەندامەکانی جەستە دووپات دەبنەوە، جەستە کردەوەی گووشراو یان بەرهەمی ڕاهاتنی رۆحە، هەربۆیە جیاکردنەوەی رۆح لە جەستە ئەستەمە. توخمێکی سەقامگرتوو لە خودئاگاییدایە، هەربۆیە لەدەرەوە وەک شتێکی قاییم و توند دێتە بەرچاو. کەواتە مادده چییە؟ کۆمەڵێک لە منە نزمەکان کە ئەگەر پێوەندی و کاریگەریەتییان لەسەر یەکتر بگاتە ئاستێکی دیاریکراویی هاوئاهەنگی و یەکێتی، ئەو کاتە منێکی سەرتریان لێ پەیدا دەبێت. گەیشتنی جیهانە بەو خاڵەی کە دەتوانێت خۆی ڕێنموونی بکات. ئەو شوێنەی کە ڕەنگە حەقیقەتی نیهایی راز و بابەتە شاراوەکانی خۆی ئاشکرا بکات و ئیمکانێک بۆ گەیشتن بە چییەتی کۆتایی خۆی پێک بهێنێت.

گرنگ نییە کە سەرچاوەی شتێک لە کوێوەیە، گرنگایەتی بابەتی گەشەکردوو لە ئەندازە، ڕێنمونی کردنەکەی و توانای کۆتاییەتی، تەنانەت ئەگەر بنەمای ژیانی رۆح بە بابەتێکی ماددی بزانین، دیسان ئەم واتایە نابەخشێت کە هەر شتێکی گەشەکردوو لەناو هۆی دروستبوونی خۆیدا نغرۆ ببێت. هەر بەوجۆرەی کە لایەنگرانی تیۆری کامڵبوونی گەشاوە فێرمانی دەکەن هەر شتێک کە گەشە دەکات لە ئاستی بوونی خۆیدا چاوەڕوان نەکراو و ڕاستییەکی تازەیە کە ناکرێ بە فۆرمێکی میکانیکی پێناسە بکرێت. لە واقیعدا کامڵبوونی ژیان ئەوەمان پیشان دەدات کە هەرچەند رۆح لە سەرەتادا لە ژێر

کاریگەریەتی هۆکارێکی ماددییدایە بەڵام هەرچی کە هێزەکەی زیاتر دەبێت، زیاتر حەز دەکات کە هۆی ماددی بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە تا ئەو شوێنەی کە وێدەچێت بە شێوازیکی سەربەخۆ دەربێت. هەروەها بابەتێک بە ناوی ماددەی ڕەها بوونی نییە بەو واتایە کە خاوەنی مادیەتێک بێت کە بە هیچ شێوە شایستەیی دەرکەوتنی ئەو ئاوێتە داهێنەرانەی نییە کە بە ژیان و رەوانی دەزانین. پێویستی بە خواوەندێکی سەرتر لە هەست هەیە تاکو هەست و رۆح ببەخشێت بە مرۆڤ. ئەو منەی کە بابەتێکی گەشەکردوو ئاشکرا دەکات توخمێکی سرووشتییە کە لەناو قورئاندا بە سیفەتی هەرمانیی و هەمیشەیی و هەروەها ئاشکرا و شاراوە وەسف کراوە.

ئەگەر مادده لەم روانگەیەوە بڕوانین پرسیارێکی گرنگ دێتە ئاراوە، زانیمان کە"من"شتێکی رەق و بێ نەرمایی و شلۆک نییە، خۆی لەگەڵ زەمەندا رێک دەخات و بە ئەزموونی تاکی خۆیەوە شێواز و یاسا قبووڵ دەکات، هەروەها دیارە کە گەڕیانەکانی هۆکار لە سرووشتەوە بۆ ناخی من و لەوێوە بۆ ناخی سرووشت رەوان دەبن، کەواتە بەم شێوەیە"من"چ رۆڵێکی هەیە لە داڕشتنی چالاکیەکانیدا؟ ئەگەر هەیەتی ئەی چۆنە کە خودموختاربوونی من لەگەڵ ریزێک جەبرخوازیی شوێن و زەمەندا پێوەندی هەیە؟ ئایا هۆی تاکی جۆرێک لە هۆکارە یان تەنها فۆرمێکی نەناسراوی میکانیزمی سرووشتە؟ هەندێ کەس لەسەر ئەو باوەڕەن کە ئەو جۆرە لە جەبرخوازیی"مانعة الجمع"نین و شێوازی زانستی شموولی چالاکی مرۆییش دەکات. بیرکردنەوەی قووڵ و ڕامان کە کردەوەیەکی مرۆییە بە پێکدانان و شەڕخوازەکان زانراوە بە شێوەیەک کە پەیوەندیەکی نییە لەگەڵ مەیلەکانی ئێستا یان کردەوە و هێزی ئاگایانە و نائاگایانەی مندا. ئەوانە هێزگەلێکی دەرەکیین کە لەناو

پانتـایی زەینـدا لـەگـەڵ یـەکتـر وەک گلادیـاتۆرەکـان شــەڕ دەکــەن. هەڵبژاردنی نیهایی لەم شەڕەدا وەک ڕاستییەک لـەبـەرچاو دەگیرێت کە لـە لایـەن بـەهێزتـرین هێـزەوە جێبـەجـێ دەبێـت نـەک ئـەوەی کـە وەک هۆکارێکی ماددی ڕەها بەرهەمی خوازە شەڕکارەکان بێت. من بەڕاستی لەسەر ئەو باوەڕەم کە شـەڕ لـە نێوان لایـەنگرانی جـەبر و لایـەنگرانی ئیختیار لەو روانگە هەڵەوە دێت کە سەبارەت بە کردەوەی ئاگایانـە لـە ئارادایە. دەروونـاسیی نـوێ بێئاگا لـەوەی کە زانستێکی سـەربـەخۆیـە و خـاوەنـی ریزێـک ڕاسـتیی شـیاوی هــەڵـسەنگاندنـە، ناچـار بـوو کـە لاساییکردنەوەی کوێلەئاسای زانستە ماددیەکان قبووڵ بکات.

ئەم ئەندێشە کە چالاکی من بەدواهاتنی بەردەوامی بیر و فیکرەکانە کـە لـە کۆتاییـدا بـە سـەر یـەکـەکـانی هـەسـتدا دابـەش دەبێـت، تـەنهـا جـۆرێکیتری مـادەخـوازیی زەڕەیـە کـە بـنەڕەتـی زانـستی نـوێ پێـک دەهێنێت. لەم بیرۆکە شتێک بەرهـەم نایـەت بێجگە لـەوەی کە تیۆریـەک بۆ جەبری بوونی خودئاگایی بەهێز دەکات. دەروونناسیی نوێی ئەڵمانیا، کە بە دەروونناسیی "گێشتاڵت" ناوبانگی هەیە ئەم دڵنیاییەمان دەداتێ کە گەرەنتی سەربەخۆیی دەروونناسیی بدات وەک زانستێک و بیپارێزێت. ڕێک وەک تیۆری کامڵبوونی خێرا، کە لەئاکامدا بووە هۆی سەربـەخۆیی زانستی زیندەوەرناسیی. دەرونناسیی نوێ فێرمـان دەکات کە موتـالای ورد سـەبـارەت بـە رەفتارێـک کـە خـاوەنـی هۆشـیارییە، ئـەوەمـان بـۆ دەردەخات کە "دەروون بینی" سەرترە لـە بـەدواهـاتی هـەستە ڕەهاکان. ئەم دەروونبینییە پێوەندیەکە کە "من" لـەباری زەمـەن، شـوێن و کردەوە بـۆ درککردنـی شـتـەکـان دروسـتی دەکـات. دەرئـەنجـام گـەلێک لـەنـاو کۆمەڵێک هەڵدەبژێرێت بـەو ئامـانجەی کە لـە دواییـدا بۆ مـەبـەسـتەکەی بەکاری بهێنێت و ئەمەش واتە ئیختیار. هەر ئەم هـەستە و هـەوڵدانـە بۆ

ئەزموونکردنی کردەوەی مەبەستدارە کە لە ڕاستییدا من لە دەست گەیشتن بە مەبەستەکانمدا سەرکەوتوو دەکات. دەبێتە هۆی ئەوەی کە باوەڕ بەوە بهێنم کە بە هۆیەکی تاکاییەوە خاوەنی توانایی و کارامەییم. تایبەتمەندی چییەتی کردەوەیەکی مەبەستدار ڕوانگەکەیەتی سەبارەت بە بارودۆخی داهاتوو کە وانایەتە بەرچاو کە بە زاراوەگەل و پێناسە فیزیۆلۆژیەکان واتا بکرێتەوە. "من" دەبێ لە بارودۆخێکی پێچهەڵپێچدا ژیان بەسەر بەرێت و ئەگەر وەک دەزگایەکی لێ نەکات بۆ ئەوەی جۆرێک لە متمانە سەبارەت بە شتەکانی دەروروپشت بدات ناتوانێت ژیانەکەی لەو شوێنەدا بپارێزێت. بارودۆخ بە دەزگایەکی هۆ و هۆکار بزانین بەو واتایە کە وتەی دوایی سەبارەت بە زاتی واقیعە. لێکدانەوەی سرووشت بەم شێوەیە دەبێتە هۆی ئەوە کە"من"بە درکی بارودۆخەکەی بەسەریدا زاڵ ببێت و بەم شێوەیە ئازادی خۆی مسۆگەر بکات و پەرەی پێ بدات. کەواتە توخمی ڕێنموونیکردن لە چالاکی"من"دا بە ئاشکرا ئەوەمان پیشان دەدات کە من تاک و خاوەنی ئیختیارە. لەناو ژیان و ئازادی منی نیهاییدا بەشدار دەبێت کە بە پێکهێنانی ئیمکانی دەرکەوتنی منێکی سنووردار و شیاویی داهێنەریەتی تاکی، ئازادی ئیرادەی خۆی سنووردار کردووە. ئەم ئازادی ڕەفتاری خودئاگایە لە خواستی خودەوە سەرچاوەی گرتووە و لە قورئاندا ئاماژەی پێدراوە. هەندێ ئایەت هەیە کە ئەمە دەسەلمێنێت:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((**وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ**)). واتە: "**بڵێ: ئەم حەقە تایبەتە بە خواوەند، هەرکەس بیەوێت ئیمان بهێنێت و هەرکەس ویستی، ئینکار بکات**". (سورەتی الكهف، ئایەتی ٢٩).

هەروەها دەفەرموێت: ((إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا)). واتە: **"ئەگەر چاکە بکەن بە خۆتان کردووە و ئەگەر خراپە بکەن تایبەتە بە خۆتان..."**. (سورەتی بنی اسرائیل، ئایەتی ٧).

ئیسلام بابەتێکی زۆر گرنگ لەناو دەروونناسیی مرۆییدا دەخاتە بەر سەرنج؛ دەرکەوتن و شاراوەبوونی هێزێک کە بە ئازادی کار دەکات و خوازیاری بەدەستهێنانی دەسەڵاتێکە کە بەناوی هۆیەکی سەقامگرتوو کە لە ژیانی مندا کەم ناکاتەوە، بە ئازادی کار بکات. دانانی چەندین جار بۆ نوێژەکان کە بە وتەی قورئان"خۆپارێزیی"لە رێگەی تەماس لەگەڵ سەرچاوەی سەرەکی ژیان و ئازادی لە مندا بەهێز دەکات، بەو واتایە کە"من"لە کاریگەریەتی میکانیکی خەو و بابەتە رۆژانەکان رزگار بکات. پەرستشی خودا لە ئیسلامدا ئامێرێکە بۆ رزگاریی من لە میکانیزم و بەدەستهێنانی ئازادی.

نابێ لەم ڕاستییە نکولی بکەین کە بیری پەیوەندیدار بە چارەنووس لە سەرانسەری قورئاندا ئامادەیە و ئەم خاڵە زیاتر لەو لایەنە جێگەی ڕامان و سەرنجە کە وا دێتە بەرچاو کە **ئێشپنگێر** لە کتێبەکەیدا بە ناوی داڕووخانی رۆژئاوا وایزانیوە کە ئیسلام بە تەواوەتی نکولی لە منی مرۆڤ دەکات. بەر لەوە من بیر و باوەڕی خۆم سەبارەت بە چارەنووس، بەو شێوەی کە لە قورئان تێگەیشتووم باس کردووە. هەر بەو شێوەیە کە **ئێشپنگێر** ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی جیهان بکەین بە هی خۆمان، دوو رێگەمان لەبەردایە. رێگەیەکی عەقڵییە و ئەوی دیکە لەبەرئەوەی کە زاراوەیەکی باشترمان لەبەردەستدا نییە، رەنگە بتوانین بە رێگەی ژیان ناو بەرین. رێگەی عەقڵی بریتییە لە تێگەیشتن لە جیهان بە شێوەی سیستمێکی پتەو و دامەزراوی هۆ و هۆکار. رێگەی ژیان قبووڵکردنی رەهای پێویستیی ژیانە کە وەک گشتییەتێک بۆی دەڕوانین

کە بۆ دەرخستنی سامانی ناوەکی خۆی زەمەنی تەسەلسوولی دەخولقێنێت. ئەم ڕێگە ژیانبەخشەی داگیرکردنی جیهان هەر ئەوەیە کە قورئان بە ئیمانی ناو دەبات. ئیمان تەنها بیروباوەڕێکی پەسیو و پەرتووکاو نییە سەبارەت بە یەک یان چەند بابەتێک، بەڵکو متمانەیەکی زیندووە کە لە ئەزموونێکی دەگمەنەوە بەدەست دێت. تەنها کەسایەتییە گەورەکان توانا و سەڵاحیەتی ئەوەیان هەیە کە لەم ئەزموون و قەدەرخوازییە سەرتر بچن. لە ناپیلیۆنەوە ئەوەیان گێڕاوەتەوە کە وتوویەتی"من شتێکم نەک تاکێک"، ئەمەش ڕێگەیەکە کە ئەزموونی تاکایەتی خۆی بەوە نیشان دەدات. لە مێژووی ئەزموونی ئایینی ئیسلامدا کە بە پێی باسەکان بریتییە لە: پێکهاتنی سیفەتە ئیلاهیەکان لە مرۆڤدا، **بایەزید** دەڵێ من: خود یا سوبحانم، ئەم ئەزموونە لە عیرفانی ئیسلامی باڵادا بە شێوەیەک نییە کە شوناسی منی موتەناهی لەناو ناموتەناهییدا نغرۆ ببێت و نادیار بێت. ئەمە ناموتەناهییە کە لە ئامێزی پڕ لە خۆشەویستی موتەناهییدا جێ دەگرێت. هەر بەو شێوە کە **مەولانا** دەڵێت:

**علم حق در علم صوفی گم شود**
**این سخن کی باور مردم شود**
**علم صوفی حادث و از حق قدیم**
**این چه آسان در فهم آید ای سلیم**

قەدەرخوازیی شاراوە لەم شێوە بیرکردنەوەدا بەو جۆرە کە باسکراوە نکولیکردن لە من نییە بەڵکو ژیان و هێزێکی بێ سنوورە کە هیچ بەربەستێک ناناسێت و دەتوانێ وابکات کە کەسێک بهێنێتە سەر ئەو باوەڕە کە نوێژەکەی خۆی بە هێمنایەتییەوە بخوێنێت لە بارودۆخێکدا کە تیر وەک باران بەسەریدا دەبارێت.

ما سوی الله را مسلمان بنده نیست
پیش فرعونی سرش افکنده نیســت
خــون او تفسیر این اســـرار کـرد
مــلـــت خـــوابیـــده را بیدار کـــرد
تیغ لا، چـــون از میان برکشـید از
رگ ارباب باطـل خـــون کشــــید
نقـــش الا الله بر صـحرا نوشــــت
ســـطر عنوان نجــات ما نوشــــت
رمــــــز قران از حســـین آموختیم
زآتـش او شـــعلههـــا اندوخـــــتیم
شـــوکت شام و فر بغداد رفت
سطوت غرناطه هم از یاد رفت
ای صبا ای پیک دورافتادگـــان
اشک ما بر خاک پاک او رسان

بـەم شـێوەیـە ئایـا بـاس لـەوە دەكرێـت كـە بێبایـەخـتـرین جـۆری قەدەرخوازیی لە ماوەی چەندین سـەدەدا بـەسـەر جیهانی ئیسلامدا زاڵ بووە؟ ئەمە وتەیـەكی راستە و هـەڵگری مێژوویـەكە كە گوتارێكی جیا داوا دەكـات. سـەبـارەت بـەم باسـە ئـەوەنـدە بـەسـە كـە بڵێـین جـۆری قەدەرخوازیی مەبەستی رەخنەگرانی ئیسلامی ئەوروپا كە ئەوە لـە نـاو وشـەی"قسمەت"دا چڕ دەكـەنـەوە بـەشـێكی دەگـەڕێـتـەوە بـۆ ئـەندێشـەی فەلسـەفی، بەشێكی بەپێی بەرژەوەندی سیاسییە و بەشـێكی دەگـەڕێتـەوە بـۆ كـەمبوونـەوەی بـەرەبـەرەی هێـزی پاڵنـەری ژیـان كـە ئیسلام هـەر لەسـەرەتـاوە ئـەوەی لـە نـاو پـەیڕەوەكانیدا ساز كردووە. فـەلسـەفـە لـە گەڕان بە شوێن واتایەک بۆ هۆكار كە بتوانێت لـەگـەڵ خودا هاوتـا بێت،

زەمەنی بە واسیتەی سەرەکی نێوان هۆ و هۆکار زانیوە، بەڵام نەیتوانی بگاتە چەمکێک بێجگە لەمە کە خودای سەرتر فەرزە بەسەر عالەمدا و لەدەرەوە بەسەریدا زاڵ دەبێت. بەم شێوەیە خودا وەک دوایین ئەڵقە لە ناو سیلسیلەی هۆکارییدا وێنا کراوە و هەربۆیە سەرچاوەی هەر ڕووداوێکە کە لە جیهاندا ڕوو دەدات. ئێستا ئیتر مادەخوازیی پراکتیکی حوکمدەرانی ئۆپۆرتۆنیستی ئەمەوی لە دیمەشقدا پاساوی بۆ دەهێنرێتەوە کە بە دوای بەڵگەیەکەوە بوون کە بتوانن سەری کردەوە ناحەزەکانیان داپۆشن و ئاکامی شۆڕشی **معاویە** دژ بە خەباتی جەماوەریی پەسەند دەکرێت. ئەوەیان گێڕاوەتەوە کە **معبد الجهنی بصری** بە **حەسەنی بصری** وت: بەنی ئومەیە موسوڵمانەکانیان دەکوشت و کردەوەکانی خۆیان بە ئەمر و ئیرادەی ئیلاهی دەزانی. حەسەن لە وەڵامیدا وتی: ئەم دوژمنانەی خودا درۆ دەکەن. بەم شێوەیە بوو کە هەرچەند زانا ئیسلامیەکان شۆڕشی زۆریان کرد، بەڵام جۆرێک لە قەدەرخوازیی بێ بایەخی ئەخلاقی خۆی نیشان دا و تیۆری بەناوبانگی"ئەمری موقەدەر"سازدار بۆ ئەوەی کە بەرژەوەندی گروپێک بپارێزێت و ئەم بابەتە جێگەی سەرسوڕمان نییە. لە سەردەمی خودی ئێمەشدا فەیلەسووفان جۆرێک پاساوهێنانەوەی عەقڵییان بۆ کانتێکستی کۆمەڵگەیەکی سەرمایەدارانە دارشتووە و ئەوەیان بە ئامانجی زێڕین ناوزەد کردووە. باوەڕی **هیگڵ** سەبارەت بە حەقیقەت و هەستی کە ئەوانە بە بەشێک لە عەقڵی ناموتەناهی نازانێت ئەم ئاکامەمان دەداتە دەست کە گشت نمودە راستەکان و هەرچی کە بەدەست هاتووە، لە زاتی خۆیاندا مەعقوولن. **ئاگۆست کۆنت** هەروەها کۆمەڵگە وەک جەستەی مرۆڤ یان ئاژەڵ دەبینێت کە کۆیەکە لە ئەندامەکان و هەرکامیان ئەرکی دیاریکراوی خۆیان هەیە. وادێتە بەرچاو کە هەر ئەم

بابەتە لە ئیسلامیشدا هاتووە. لەبەرئەوەی کە موسوڵمانەکان بەردەوام شێوازە جۆراوجۆرەکانی بیرکردنەوەیان لەناو قورئاندا دەدۆزیەوە، تەنانەت بە بوونی واتای ئاشکرای ئایەتەکان ئەوانەیان بە مەزاجی خۆیان لێک دەدایەوە و هەربۆیە لێکدانەوەی دامەزراو لەسەر بنەمای قەدەرخوازیی کاریگەریەتی زۆری لەسەر موسوڵمانان داناوە. لەم پێوەندیەدا گەلێک بەڵگە دەکرێ بهێنرێتەوە لەو لێکدانەوەیانەی کە بە ئاشکرا دیارە کە هەڵەیە. ئەمەش بابەتێکە کە خۆی گوتارێکی تایبەتی دەوێت. ئێستا کاتی ئەوەیە کە ئاوڕ لە بابەتی هەرمانیی رۆح بدەینەوە.

لە هیچ سەردەمێکدا بە ڕادەی زەمەنی ئێمە سەبارەت بە هەرمانیی رۆح بابەتی جۆراوجۆر نەنووسراوە. بەرهەمگەلی وا بە هۆی سەرکەوتنی ماددەخوازی نوێوە بەردەوام خەریکە زیاد دەبێت. بورهانەکانی ـ ما بعد الطبیعە ـ ی ڕەها ناتوانن باسێکی بنبڕ و بە متمانەوە سەبارەت بە هەرمانیی تاکی ڕای خۆیان دەربەبڕن. لە مێژووی ئەندێشەی ئیسلامییدا **ئیبن روشد**، بابەتی هەرمانیی لە ـ ما بعد الطبیعە ـ نزیک کردەوە و خستییە بەر سەرنج کە بە باوەڕی من هیچ ئەنجامێکی نەبووە. ئەو هەست و عەقڵی لە یەکتر جیا کردۆتەوە و ئەمە ڕەنگە بە هۆی دوو زاراوەی نەفس و رۆح بووە کە لە قورئاندا بەکاربراوە. ئەم جۆرە ئیشاراتانە کە وادیارە باس لە ڕووبەڕووبوونەوەی دوو توخمی دژ بە یەک دەکات لە مرۆڤدا، زۆرێک لە بیرمەندە ئیسلامیەکانی تووشی سەرلێشێواویی کردووە. ئەگەربێتو ئەم دووالیتەی **ئیبن روشد** بەپێی قورئان بووبێت، من بەداخەوەم کە تووشی هەڵە بووە، وا نایەتە بەرچاو کە وشەی نەفس لەناو قورئاندا بە واتای هیچکام لە مانا فەنی و زاراوەگەلێک بەکار برابێت کە بیرمەندە ئیسلامیەکان بیریان لێکردبێتەوە. تایبەتە بە چینێکیتر لە بوون و لایەنێکە

کە بە شێوەی سەربەخۆ بەرز دەبێتەوە. ئەم فیکرە وادیارە کە بەو واتایە کە لەبەرئەوەی یەکەی عەقڵ بە شێوەی سەربەخۆ بەرز دەبێتەوە کەواتە دەرکەوتنی لە ڕوخساری یەکە زۆرەکان لە مرۆڤە پرئەژمارەکاندا، هیچ نییە بێجگە لە بیرێکی ڕەها. هەروەک چۆن **ئێرنێست ڕێنان** بیری دەکردەوە ڕەنگە مەبەست لە یەکگرتنی هەمیشەیی عەقڵ، مانەوەی مرۆڤایەتی و شارستانیەت بێت کە دڵنیام بە واتای هەرمانیی تاکی نییە. لە ڕاستییدا ڕوانگەی **ئیبن ڕوشد** لە بیروباوەڕی **ویلیام جیمز** دەچێت سەبارەت بە میکانیزمی باڵای خودئاگایی کە بۆ ماوەیەک لەسەر واسیتەیەکی ماددی کار دەکات و پاشان بە ئیهمالکارییەکی زۆرەوە لەدەستی دەدات. لە سەردەمی نوێیدا تەوەری بورهان لە سەلماندنی هەرمانیی تاکییدا بە تەواوەتی لەسەر بنەمای ئەخلاق دامەزراوە، بەڵام هۆ ئەخلاقییەکان وەک ئەو شتەی کە **کانت** دایڕشتووە و چاکخوازیی نوێ کە بۆی کراوە یان دەگەڕێتەوە بۆ جۆرێک لە ئیمان بۆ بەڕێوەبردنی ویستەکانی یاسا و عەدالەت یان لەسەر بنەمای کاری تایبەتی مرۆڤ وەک تاکێک کە خوازیاری ئامانجە بەرزەکانە دامەزراوە. بە باوەڕی **کانت** هەرمانیی ڕۆح بەدەرە لە بەرژەوەندی عەقڵی تیۆرێک و بابەتی ئاشکرای خودئاگایی ئەخلاقی مرۆڤە. مرۆڤ خوازیاری خێرێکی بڵندە کە هەم لەخۆگریی خۆپاراستن و گەورەییە و هەم شادی و بەختەوەری لەگەڵدایە. بە باوەڕی **کانت** گەورەیی و بەختەوەری و هەروەها ئەرک و مەیل زارەوەگەلێکی نارێکن. یەکگرتنی ئەم زاراوانە لە کەسێکدا کە خوازیاری خێری بەرزە و بە ژیانی کورت لەم دنیایەدا مسۆگەر نابێت. کەواتە بەرەو ئەم ئامانجە ڕادەکێشرێن کە بابەتێکی بنبڕ بە ناوی ژیان بۆ گەیشتنی مرۆڤ بە کەماڵ پێویستە بۆ ئەوەی کە یەکگرتنی مانعة الجمع بۆ

گەورەیی و بەختەوەری مسۆگەر بێت. ناچارین کە باس لەوە بکەینەوە کە خوایەک هەیە کە ئەم یەکگرتنە پێک دەهێنێت. دیار نییە کە بۆچی **کانت** بە کەماڵگەیشتنی گەورەیی و بەختەوەری بەوە دەزانێت کە پێویستی بە زەمەنی بێسنوور دەزانێت. ئەم بورهانە ما بعد الطبیعییانە کە بێ ئەنجام و بەرهەمن زۆرێک لە بیرمەندانی بۆ ئەو شوێنە راکێشاوە کە خۆیان لەناو بازنەی مادەخوازیی نوێدا ببیننەوە کە پاکی رۆح نەفی دەکاتەوە. خودئاگاییش تەنها بە ئەرکی تایبەتی مێشکی مرۆڤ دەزانێت کە بە ڕاوەستانی کاری مێشک ئیتر گەشە ناکات. **ویلیام جیمز** بیری لەوە دەکردەوە کە ئەم دەنگ دەربڕینە بە پاکی رۆح تەنها کاتێک دەبێ سەرنجی پێبدرێت کە لەسەر کاری قازانجخوازی بەرهەمهێنان دامەزرابێت. سەرنجدان بەو ڕاستییەی کە هەندێ لە گۆڕانکارییە زەینییەکان لەگەڵ گۆڕانکاریی لەگەڵ هەندێ لە گۆڕانکارییە جەستەییەکاندا هاوکاتە، ناتوانین حوکم بدەین کە گۆڕانکارییە زەینییەکان هەمیشە ئاکامی گۆڕانی جەستەیین. ئەم کارە لە بنەڕەتەوە قازانجی بەرهەمهێنانی نییە و دەکرێ وەک تەقەکردن کردەوەیەکی ئیختیاری یان وەک تێشکدانەوەی نوور لە شتێکی شەوقدارەوە تەنها زایەڵەیەک بێت. ژیانی دەروونی ئێمە پەیوەندی بە جۆرێک میکانیزمی بەرزی خودئاگاییەوە هەیە لە ناخماندا کە بە شێوەیەک لە شێوەکان واسیتەیەکی ماددی بۆ ماوەیەکی کورت لە رووی خۆشیەوە هەڵدەبژێرێت و هیچ متمانەیەک لە ناوەرۆکی ئەزموونی راستەقینە بەدەستەوە نادات. لەو ژمارە لێدوانانەی کە لەماوەی رابردوودا هەبووە، شێوازی تایبەتی رووبەڕووبوونەوەم لەگەڵ مادەخوازییدا باسکردووە. زانست بۆ لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندن دەبێ هەندێ لە لایەنەکانی تایبەتی حەقیقەت هەڵبژێرێت و لایەنەکانی دیکەی بەجێ بهێڵێت.

ئەگەر زانست بانگەشەی ئەوە بکات کە تەنها ئەو لایەنانەی حەقیقەت کە هەڵبژاردووە شیاویی لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنە تووشی دوگماتیزمی ڕەها بووە. بێ هیچ گومانێک مرۆڤ خاوەنی لایەنی شوێنە و بەڵام ئەمە تەنها تەوەری ئەو نییە و دیکەی لایەنەکانیشی هەیە وەک: هەڵسەنگاندن، تایبەتمەندی ئەزموونی نیهایی و گەڕان بە شوێن حەقیقەتدا کە زانست دەبێ بە ناچاریی چاوپۆشی لە لیکۆڵینەوە لەوبارەوە بکات. لەبەرئەوەی کە تێگەیشتن لەوانە پێویستی بە مەقوولاتێک هەیە کە لەگەڵ بنەماکانی زانستدا جیاوازە.

بە گشت ئەم باسانەوە لە مێژووی ئەندێشەی هاوچەرخدا یەک ڕوانگەی پۆزەتیڤ سەبارەت بە مانەوەی رۆح هەیە کە تیۆری"بازنەی هەرمانیی"نیچەیە. ئەم تیۆرە نە تەنها لەبەرئەوەی کە **نیچە** بە گەرما و حاڵێکی پێغەمبەرئاساوە وەسفی کردووە شیاویی هەڵسەنگاندنە، بەڵکو لەبەرئەوەی کە هەوڵدان و راکێشەرییەک لە فیکرە نوێکاندا ساز دەکات شیاویی ئەوەیە کە سەرنجی تەواوی پێبدرێت. ئەو تیۆرەی کە باسکرا وەک ئیلهامێکی شاعیرانە لەکاتێکدا گەیشتە زەینی **نیچە** کە سەرچاوەکەی لە ئەندێشەی کەسانێکیتریشدا هەبوو. بۆ وێنە زەینی **هێربێرت ئێسپێنسێر**. لەڕاستییدا لایەنی ئیماژیی ئەم تیۆرە زیاتر لە هۆی لۆژیکی ئەوە بۆ ئەم پێغەمبەرە نوێیە جێی سەرنج بووە. ئەمە خۆی شاهیدێکە بۆ ئەم بابەتەی کە سەلماندن و باوەڕکردن بە شتەکان بەر لەوەی کە کاری ما بعد الطبیعە بێت زیاتر پەیوەندی بە ئیلهامەوە هەیە. بە گشت ئەم باسانەوە **نیچە** شێوازێکی ئیستدلالی بەخشی بە تیۆریەکەی و لەبەرئەوەیە کە ئەم بابەتەمان شیاویی لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندن زانیوە. قسەکەی ئەو لەسەر ئەم تیۆرە دامەزراوە کە ڕادەی هێز و ئێنێرژی لە جیهاندا کەم یان زۆر نابێت، بەڵکو بە یەک

ڕادەیە. بە باوەڕی ئەو شوێن واتە فەزا تەنها ڕوخسارێکی زەینییە و ئەم وتەیە مانایەکی نییە ئەگەر بڵێین جیهان لەناو شوێنێکدا واتە بۆشاییەکی رەها دانراوە. **نیچە** لە بابەتی زەمەندا لەگەڵ **کانت و شۆپێنهاوێر**دا هاوڕایە. باس لەوە دەکات کە زەمەن ڕوخسارێکی زەینی نییە، بەڵکو پرۆسەیەکی بێ کۆتایی و ڕاستەقینەیە کە تەنها لە شێوازی دەورەیی و بەردەوامدا دەکرێ وێنا بکرێت. هەربۆیە دەردەکەوێت کە لەناو فەزا یان شوێنێکی بەتاڵدا شتێک بەناوی خەسارکردنی هێز بوونی نییە. سەنتەرەکانی ئەم هێزە کەم و ژمارەی ئاوێتەبوونیان بە تەواوەتی دەکرێ بژمێردرێن. بۆ ئەم هێزە هەمیشە چالاکە نە سەرەتایەک بوونی هەیە و نە کۆتاییەک، نە باڵانس و رێکی و نە گۆڕانکارییەکی یەکەمین یان کۆتایی. لەبەرئەوەی کە زەمەنێکی بێ ئەژمار و بێ بەراورد تاکو ئێستا تێپەڕیوە، وێدەچێت کە گشت ئەو ئاوێتەبوونانەی کە دەکرا، هەمووی ڕووی دابێت. هیچ ڕووداوێکی نوێ لە جیهاندا ڕوو نادات، هەرچی کە ئەمڕۆ ڕوو دەدات لەوە پێش و لەناو گەلێک زەڕەی بێ ئەژماردا خولقاوە و هەر بەو شێوەیەش لە داهاتوودا دەخولقێتەوە. بە باوەڕی **نیچە** تەرتیبی خولقانی ڕووداوەکان لە جیهاندا لەبەرئەوەی کە کاتێکی زۆری بەسەربردووە دەبێ نەگۆڕ و سەقامگرتوو بێت و ڕەفتاری سەنتەرەکانی هێز بە سەرنجدان بەم زەمەنە سنووردارە دەبێ شێوازی نەگۆر و بنبڕی خۆی پەیدا کردبێت. هەمان وشەی دەور و بازنە هەڵگری نەگۆڕیی و سەقامگرتووییە، هەروەها دەبێ ئەوەمان لەبیر بێت کە ئەو ناوەندانەی وزە کە جارێک دروستکرابن دەبێ گەڕانەوەیەکی هەمیشەییشیان هەبێت. ئەگەر وانەبێت هیچ گەرەنتییەک بۆ گەڕانەوەی **مەزن – مرۆڤ** نییە.

"هـەمـوو شـتێک گەڕاوەتـەوە لـە شـاعیرانی یـەمانییـەوە بگـرە تـا جاڵجالۆکە و هەروەها ئەندێشەکانی تۆ لەم ساتەدا و هەروەها هەر ئەم دوایین بیرکردنەوەی تۆ کە هەموو شتێک دەگەڕێتەوە. ئەی برا. . . پەیمانەی تەمەنی تۆ هەروەک قاپورەکانی کاتژمێری زیخ بەردەوام پڕ دەبێتەوە و هەرگیز بەتاڵ نامێنێت. ئەم بازنەی کە تۆ لەوێدا وەک زەڕەیەکی بچووکی دووبارە دەدرەوشێتەوە".

دەوری هەرمانیی **نیچە** ئاوەهایە. تەنها چەشنێکی ڕەق و بێ گۆڕانی بیرکردنەوەیەکی میکانیکییە کە پێی لەسەر ڕاستییەکی ئاشکرا دانەناوە. هەروەها لەگەڵ بابەتی زەمەندا بە شێوەیەکی جیددی ڕووبەڕوو نەبۆتەوە. زەمەن وەک بابەتێکی بینراو سەیر دەکات کە ریزێک لە ڕووداوە پەیوەستەکانی لەخۆگرتووە و چەندینجار هەر دووپات دەبێتەوە و سەرلەنوێ دەورێکی دی دەست پێ دەکاتەوە. بەم شێوە بەجۆرێکی ڕەها بابەتی هەرمانیی بوون ناسەقامگیر دەکات. نیچە خۆی لەم بابەتە تێگەیشتووە، باوەڕی خۆی بە ناوی هەرمانیی نەک لە شێوازی ڕوخسارێکی تیۆرێک سەبارەت بە ژیان کە پشتوانییەکی هەمیشەیی هەیە و بەردەوامی دەکات، وەسفکردووە. ئەو شتەی کە بە وتەی **نیچە** هەرمانییبوون مسۆگەر دەکات چییە؟ ئەو بابەتە هەمان چاوەڕوانییەکە کە لە بازنەی ناوەندەکانی وزە هەمانە و من دروست دەکات و هۆکارێکی پێویستە بۆ دروستبوونی ئاوێتەیەکی ئارمانی کە **نیچە** ناوی مەزن- مرۆڤی لێدەنێت. مەزن – مرۆڤ لەوە پێشیش چەندینجار لە کاتەکانی پێشتردا بوونی هەبووە، لەدایکبوونەکەی مسۆگەرە. وەها ڕوانگەیەک چۆن دەتوانێت لە مندا هەستێکی خۆش دروست بکات؟ مرۆڤ لە زاتی خۆیدا حەز بە شتگەلێک دەکات کە بە شێوەیەکی ڕەها نوێ و تازە بن. بە ڕای نیچە هیچ شتێکی نوێ و تازە

بەشێوەیەکی ڕەها بوونی نییە کە بیری لێبکرێتەوە. ئەم ئەندێشە بە واتای باوەڕ بە قەدەرە، بەڵام بە واتایەکی خراپتر لە ئەو شتەی لە وشەی"قسمت"دا هەیە. وەها باوەڕێک بە چاوپۆشی لەوەی کە هانی کۆمەڵگەی مرۆیی نادات کە دژ بە شەڕ و دژواریەکانی ژیان شۆڕش بکات، بەڵکو مەیل بە هەوڵدان لەودا وێران دەکات و تێکۆشان و وزەی "من" دەکوژێنێتەوە.

ئێستا با بگەڕێنەوە بۆ ئەو بابەتەی کە قورئان فێرمان دەکات، ڕوانگەی قورئان سەبارەت بە چارەنووسی مرۆڤ تاڕادەیەک لەسەر بناغەی زیندەوەرناسیی دامەزراوە. بۆیە دەڵێین تارادەیەک، لەبەرئەوەی کە قورئان سەبارەت بەم بابەتە بە ڕاشکاویی بیروڕای خۆی دەردەبڕێت، تێگەیشتن لەو بابەتە زیندەوەرناسیانە پێویستی بە قووڵبوونەوەی زۆر هەیە. بۆ وێنە بەرزەخ بەشێوەی چییەتی و حاڵەتەکانەوە وەسف دەکات و ئەمە ڕەنگە بە هۆی جۆرێک مەوداوە بێت کە لە نێوان مەرگ و قیامەتدا هەیە. وادێتە بەرچاو کە لە قیامەت و هەستانەوەی ئەو دونیا کە مەبەستی قورئانە، لێکدانەوەیتر کراوە. هۆی قورئان لە قیامەتدا بە پێچەوانەی مەسیحیەت لەسەر بنەڕەتی هەستانەوەی ئێستا و جەستەیی تاکێکی مێژوویی نییە. وا دێتە بەرچاو کە قورئان هەستانەوە و زیندووبوونەوە وەک دیاردەیەک دەبینێت کە لە گشت جیهاندا ڕوو دەدات. باس لەوە دەکات کە ئەم دیاردەیە شموولی باڵندەکان و ئاژەڵەکانیش دەبێت. (سورەتی الانعام، ئایەتی ٣٨). بەرلەوەی کە بێینە ناو وردەکارییەکانی مەبەستی قورئان سەبارەت بە هەرمانیی بوون، دەبێ سەرنج بدەینە سێ خاڵ کە نصی قورئانە و گریمانەی جیاوازی بیروڕا لەم بارەوە زۆر کەمە.

١-  سەرەتا ئەوەیە کە من دەستپێکی لە ناو زەمەندا هەیە و لە تەرتیبی نێوان شوێن و زەمەندا بەر لە دەرکەوتنەکەی بوونی نەبووە.

٢-  هەروەها بەپێی باوەڕی قورئان ئیمکانی گەڕانەوە بۆ سەر ئەم خاکە بوونی نییە. ئەم ئایەتانەی کە دێت ئەم باوەڕە دەردەخات:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((حَتَّى إِذَا جَاء أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ (*) لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحاً فِيمَا تَرَكْتُ كَلَّا إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ)). واتە: "**کاتێک مەرگی یەکێکیان دەگاتێ دەڵێ خودایا من بگەڕێنەوە، ڕەنگە ئەو شتەی کە تەرکم کردووە بیکەم بە کردەوەیەکی چاک. هەرگیز. ئەمە ئەو وشەیەیە کە خودا دەیڵێت. لە بەردەمیاندا حائیلێک هەیە تا ئەو ڕۆژەی کە هەستنەوە**". (سورەتی المؤمنون، ئایەتی ٩٩-١٠٠).

هەروەها دەفەرموێت: ((وَالْقَمَرِ إِذَا اتَّسَقَ (*) لَتَرْكَبُنَّ طَبَقاً عَن طَبَقٍ)). واتە: "**سوێند بە مانگ، ئەو کاتەی کە کامڵ دەبێت. بێگومان لە حاڵەتێکەوە دەڕۆن بۆ حاڵەتێکیتر**". (سورەتی الانشقاق ئایەتی ١٨-١٩).

هەروەها دەفەرموێت: ((أَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُ أَمْ نَحْنُ الْخَالِقُونَ (٥٩) نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ (٦٠) عَلَى أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَالَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ (٦١)). واتە: "**... ئەو نوتفەی کە دەیڕێژن، ئێوە دەیخوڵقێنن یان ئێمە خوڵقێنەرین؟ ئێمە مەرگمان لە نێوان ئێوەدا موقەدەر کرد و کەس دەسەڵاتی بەسەر ئێمەدا نییە. بوونەوەری دیکە وەک ئێوە دەخوڵقێنین و لەحاڵێکدا کە نازانن سەرلەنوێ ئێوە زیندوو دەکەینەوە**". (سورەتی الواقعة، ئایەتی ٥٨-٦١).

٣- سێهەم ئەوەی کە سنووردارییەتی بە واتای چارەڕەشی نییە:

خـوای گەورە دەفەرمویّـت: ((إِن كُـلُّ مَـن فِـي الـسَّمَاوَاتِ وَالْـأَرْضِ إِلَّـا آتِـي الرَّحْمَنِ عَبْداً (*) لَقَدْ أَحْـصَاهُمْ وَعَـدَّهُمْ عَـدّاً (*) وَكُلُّهُـمْ آتِيـهِ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ فَـرْداً)). واته: "**لەناو ئاسمانەکان و زەوییدا هیچ کەس نییە مەگەر ئەوەی کە بۆ پەرستشی خودای رەحمان بێت. سەرنجی داوەتە ئەوان، هەموویانی بە رێکی ئەژمار کردووە و هەموویان لە قیامەتدا تەنها لە لای ئەو دەبن**". (سورەتی مریم، ئایەتی ٩٣-٩٥).

ئەمە خاڵێکی گرنگە و دەبێ بە وردی سەرنجی بدرێتێ تا روانینێکی دروست لـه تیۆری ئیسلامی سـەبارەت بـه خوداپـەرستی بداتـه دەست. منی موتەناهی بە هۆی تاکایەتی بێ وێنـەی خۆی لـه منی ناموتـەناهی نزیـک دەبێتـەوە بـۆ ئـەوەی سـەرنج بداتـەوە بـەرهـەمی کـردەوەکـانی رابردووی خۆی و ئیمکانیاتی داهاتووی بخاتە بەر داوەری.

خوای گەورە دەفەرموێت: ((وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَآئِرَهُ فِي عُنُقِهِ وَنُخْـرِجُ لَـهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَاباً يَلْقَاهُ مَنشُوراً (*) اقْرَأْ كَتَابَكَ كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَـوْمَ عَلَيْـكَ حَسِيباً)). واتە: "**چارەنووسی هەر مرۆڤێکمان خستۆتە ناو گەردنی و لـە رۆژی قیامەتدا نامەیەکمان بۆ ئامادە کردووە کە بە کراوەیی دەیبینێت. پێی دەڵێن کە نامەکەت بخوێنەوە کە ئەمڕۆکە خۆت حسێبکاری خۆتی و بەس**". (سورەتی بنی اسرائیل، ئایەتی ١٣-١٤).

چارەنووسی نیهایی مرۆڤ هـەرچی بێت دیارە کـە ئـازادی کـامڵی بەرهەم هاتوو لە سنووردارییەتی وەک بـەرزترین شێوەی بـەختـەوەری مـرۆڤ ناڕوانێـت. "پاداشـتی بـەردەوام"ی مـرۆڤ بریتییـە لـە گـەشـەی بەردەوامی ئەو لە: زاڵبوون بەسـەر نـەفسدا، تایبـەت و جیاواز بوون و هەروەها رادەی چاکبوونی وەک خودێک. تەنانەت ڕووداوی "کن فیکون" بـوونی عالـەم کـە بێ مـەجال لـە دوای ئـەوەوە رۆژی داوەری دەگـاتێ

ناتوانێت کاریگەریەتی هەبێت بەسەر ئەو خودەوە کە بە تەواوەتی پەروەردەی کردووە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ((وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَنْ شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ)) واتە: "**لە صوردا بانگ دەکرێت و هەرکەس لە ئاسمانەکان و زەوییدایە بێجگە لەو کەسەی کە خودا دەیەوێت، بێ هۆش دەبێت**". (سورەتی الزمر، ئایەتی ٦٨).

کێ دەتوانێت لەم یاسایە بێبەری بێت؟ بێجگە لەو کەسەی کە وەک خودێک گەیشتۆتە سەرترین ڕادەی چالاکی خۆی. تەشقی ئەم چالاکییە کاتێکە کە منی موتەناهی تەنانەت لە بارودۆخی تەماسی نزیک لەگەڵ منی گشتگیردا بە تەواوەتی توانا بێت بەسەر خۆیدا. بە هەمان شێوە کە قورئان سەبارەت بە دیتنی پێغەمبەر لە منی نیهایی باسی لێدەکات:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((مَا زَاغَ الْبَصَرُ وَمَا طَغَى)). واتە: "**نە چاوەکانی واق ما و نە لە ڕێ بەدەر بوو.**" (سورەتی النجم، ئایەتی ١٧).

ئارمانی مرۆڤی کامڵ لە ئیسلامدا ئاوەهایە، لەم بارەوە هیچ پێناسەیەک جوانتر نییە لەوەی کە بەیتێک شیعری فارسی سەبارەت بە ئەزموونی ئیشراقی ئیلاهی پێغەمبەر باسی لێدەکات لە هیچ کوێدا نادۆزرێتەوە:

موسی ز هوش رفت به یک جلوه صفات     تو عین ذات می نگری، در تبسمی

دیارە کە چونکە تەسەوف دامەزراو لەسەر باوەڕی یەکێتی وجوود ناتوانێت هاوڕاییەکی لەگەڵ ئەم ئایدیایەدا هەبێت، هەندێ گیروگرفتی فەلسەفی پێکدەهێنێت: چ بەربەستێک بۆ منی ناموتەناهی و منە موتەناهییەکان بوونی هەیە؟ ئایا ئیمکانی هەیە کە منی موتەناهی بە

هـەمانـشێوە کـە هـەیـە بتوانێـت سـنوورەکـانی خـۆی لـە لای منـی بێسنوورەوە بپارێزێت؟ ئەم جۆرە باسانە لـەوێوە سـەرچاوەی گرتـووە کە تێگەیشتنێکی دروست سەبارەت بە زاتی ڕاستەقینەی ناموتـەناهی بوونی نییە. چییەتیەکەی لە بەربڵاویەکەیدا نییـە، بەڵکو لـە هێز و ڕادەی هێزەکەیدایە. ئەو کاتەی کە چاوی ئێمە دەبڕدرێتە نیشانەکانی دەسەڵاتی ئـەو بـەرە بـەرە لـەم خاڵـە تێدەگـەین کـە هـەرچـەند منی موتـەناهی لـە ناموتەناهی جیا نەبۆتەوە، بەڵام دەبێ لـەوە جیا بکرێتـەوە. مـن لـە بـاری بـەربڵاوییـەوە لـە ریزبـەنـدی شـوێن و کاتێکدا کـە پـەیـوەسـتم بـەوەوە، نغرۆبووم، بەڵام لەباری هێز و تواناوە هەمان ریزبـەنـدی شـوێن و کـات وەک غـەیرێـک دەبینم لـە بـەرامبـەر خۆمـدا کـە بـە تـەواوەتـی جیـاوازم لـەگـەڵیـدا. لـە ناموتـەنـاهی جـودا، بـەڵام بـە شـێوەی زاتـی لـەگـەڵیـدا لـە پێوەندیدام و رشتەی ژیانم بەوە بەستراوە. بەم سێ خـاڵەوە بـە روونـی دەرکەوت هیچ کێشەیەک پێش نایەت بۆ تێگـەیشتن لـە دیکـەی تیۆرەکـە. بەپێی وتەی قورئان رێگەی پەیوەست بوون بە مانـا و حـەقیقـەتـی عالـەم کراوەیە بەرەورووی هەرکەس کە دەیەوێت هەرمانیی بێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ((أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَى (٣٧) ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى (٣٨) فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى (٣٩) أَلَيْسَ ذَلِكَ بِقَادِرٍ عَلَى أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَى (٤٠)). واتە: "**مەگەر مرۆڤ بیر دەکاتەوە کە لە خۆڕا رەها کراوە؟ مەگەر تۆییەک نەبوو لە نوتفە کە دەڕژا؟ پاشان بووە دەڵیمە خوێنێک و خوداکەی خوڵقاندی و دایڕشت. لەوە دوو جۆری نێر و مێی سازدا. چۆن ئـەم خودایـە ناتوانێت مـردووەکـان زینـدوو بکاتـەوە؟**". (سورەتی القیامة، ئایەتی ٣٦-٤٠).

زۆر دوور دێتە بەرچاو کە بوونێک کە رەوشتی کامڵبوونەکەی چەند ملیۆن ساڵ درێژەی هـەبـووە هـەروەک شـتیکی بێسوود فڕێ بـدرێت.

دەکرێ وەک خودێک کە هەمیشە لە حاڵی گەشەی رۆحییە و خۆی دەگەشێنێتەوە پەیوەند بدرێت بە حەقیقەتی عالەمەوە:

هەروەها دەفەرموێت : ((وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا (٧) فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا (٨) قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا (٩) وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا (١٠)). واتە: "**سوێند بێت بە نەفس و ئەوەی کە سەقامگرتووی کرد. رێگەکانی بەدکاری و خۆپاراستنی پیشان دا. هەرکەس کە خاوێنی کردەوە رزگار بوو، هەرکەس پیسی کرد ئەوە بە لارێدا رۆیشت**". (سورەتی الشمس، ئایەتی ٧- ١٠).

چۆن دەکرێ گیان خاوین بکرێتەوە و لە پیسبوون رزگاریی بکرێت؟ بە کردەوە:

هەروەها دەفەرموێت : ((تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (*) الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ)). واتە: "**مەزنە ئەو کەسەی کە پاشایەتی لە دەستی ئەودایە و بەسەر هەموو شتێکدا توانایە. هەمان کەس کە مەرگ و ژیانی خوڵقاندووە کە تاقیمان بکاتەوە کە کامتان بە کردەوە باشترن و ئەوە کە بەتوانا و بەخشێنەرە**". (سورەتی الملک ئایەتی ١-٢).

ژیان پانتایەکە بۆ چالاکی ئازادی من و مەرگ یەکەمین چالاکی ئاوێتەیی ئەوەیە. شتێک بە ناوی کردەوەی شادی هێنەر یان غەمگین بوونی نییە، کردەوەکانی مرۆڤ یان پارێزەری من هەن یان ئەوە لەناو دەبەن. کردەوەی مرۆڤ دەتوانێت منیش بخاتە ناو خراپەوە و هەم رەوشتی داهاتووکەی فێر بکات. مەرجی سەرەکی کردەوەی پاراستنی من، چ تایبەت بە خۆم بێت چ دیتران، بەرێز راگرتنیەتی. کەواتە هەرمانیی مافی کەس نییە مەگەر ئەوەی کە بە هەوڵی تاکە کەسیەوە مسۆگەر بێت. لە نێوان هەموو بوونەوەرەکاندا تەنها مرۆڤە کە

شایستەی هەرمانیی بوونە. خەمبارترین هەڵەی ماتێریالیزم ئەوەیە کە وادەزانێت خودئاگایی سنووردار ئەو توانایەی هەیە کە لە گشت حەقیقەتەکانی بابەتێک ئاگادار بێت. فەلسەفە و زانست تەنها یەکێکن لە رێگەکانی گەیشتن بە حەقیقەتی بابەتێکە. رێگەگەلێکیتریش هەیە بۆ تێگەیشتن لە ڕاستییەکان ئەویش لەناوچوونی جەستەیە. بە شێوەیەک کە کردەوەکانی من بتوانێت من دژ بە ترس و لەرزەیەک کە بەرهەمهاتووی مردنی جەستەیە، تەیار بکات لەو حاڵەتەدا مەرگ تەنها پردێکە بۆ رۆیشتن لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکیتر کە قورئان بە ناوی بەرزەخ وەسفی دەکات. کاتێک بەرهەمی خاوەنانی عیرفان هەڵدەسەنگێنین، دەبینین کە بە شێوەی ئاگایانە لە روانینی من بۆ زەمەن و شوێن گۆڕانکاریی دروست دەکات. شتێک کە ئەستەم بێت لەوێدا رێگەی نییە. **هێلمهۆلتز** یەکەمین کەس بوو کە بەوەی زانی کە: کاتێکی پێویستە تاکوو هەیەجانی عەسەبی بگۆڕێت بە خودئاگایی. ئەگەر وەهابێت ئەو باوەڕەی کە سەبارەت بە زەمەن هەمانە لەسەر بنەمای فیزیۆلۆژیکی ئێستای ئێمە دامەزراوە و ئەگەر من لە دوای رووخانی ئەم بناغەیە زیندوو بمێنێتەوە زۆر ئاسایی دێتە بەرچاو کە سەبارەت بە ڕوانینمان بۆ زەمەن و شوێن گۆڕانکاریی دروست بێت. ئەم گۆڕانکارییە بۆ ئێمە نامۆ نییە. بەم شێوەیە وادێتە بەرچاو کە بەرزەخ تەنها بارودۆخیکی ئینفیعالی بێت بۆ چاوەڕوانی کردن، بەڵکو حاڵەتێکە کە لەوێدا من سەیرێکی دووبارەی لایەنە نوێکانی حەقیقەت دەکات و خۆی ئامادە دەکات کە لەگەڵ ئەواندا سازگار بێت. بەتایبەت بۆ ئەو منانەی کە گەشەی مەعنەوی کاملی کردووە و لەگەڵ چییەتی کردەوەی سەقامگرتووی زۆریدا لەناو شوێن و زەمەندا بەرەو گەشەکردن رۆیشتووە. ئەمە دەبێ قۆناغێکی دیکە لە بەرزبوونەوەی مەزنی رۆح

بێت و وێدەچێت بۆ ئەو منانەی کە بەو پلە لە بەختەوەری نەگەیشتوون واتای رووخان و مەرگ بدات. بەم گشتە باسەوە دەبێ من درێژە بە شۆڕشەکەی بدات تا ئەو کاتەی کە بزانێت سەرکەوتنەکەی لە قیامەتدا مسۆگەرە. کەواتە هەستانەوە و قیامەت ڕووداوێکی دەرەکی و رووکەشی نییە. خاڵی باڵا و ئامانجی نیهایی پرۆسەی ژیانێک لە ناخی مندایە. قیامەت و هەستانەوە چ تاکی بێت و چ گشتی شتێک نییە بەدەر لە جۆرێک ریزبەندی کردەوەکانی رابردووی من و ئیمکانیاتی داهاتووی من. بورهانی قورئان سەبارەت بە دیاردەی سازدانی دووبارەی من لەسەر قیاسی دەرکەوتنی یەکەمیەتی:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((وَيَقُولُ الْإِنسَانُ أَئِذَا مَا مِتُّ لَسَوْفَ أُخْرَجُ حَيّاً (*) أَوَلا يَذْكُرُ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن قَبْلُ وَلَمْ يَكُ شَيْئًا)). واتە: "**مرۆڤ دەڵێ: کاتێ مردم چۆن دووبارە بە زیندوویی دەرم دەهێننەوە؟ ئایا مرۆڤ لە بیری نەماوە کە سەرەتا هیچ نەبوو و ئێمە ئەومان خوڵقاند**". (سورەتی مریم، ئایەتی ٦٦-٦٧)

هەروەها دەفەرموێت: ((نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ (*) عَلَى أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَالَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ (*) وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ النَّشْأَةَ الْأُولَى فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ)). واتە: "**ئێمە مەرگمان لە نێوان ئێوەدا موقەدەر کرد و کەس نییە کە دەسەڵاتی لە ئێمە زیاتر بێت. بوونەوەری دیکە وەک ئێوە دەخوڵقێنین لە حاڵێکدا کە نازانن ئێوە سەرلەنوێ زیندوو دەکەینەوە. بۆچی ئامۆژگاریی وەرناگرن؟**". (سورەتی الواقعة، ئایەتی ٦٠-٦٢).

مرۆڤ یەکەمجار چۆن خوڵقا؟ هۆیەکی قورس و قائیم کە لەم دوو ئایەتەدا هەیە لە ڕاستییدا ڕوانگەیەکی نوێ دەکاتەوە بەرامبەر بە فەلسەفەی ئیسلامیی. **جاحظ** (٢٥٥ کۆچی) یەکەمین کەس بوو کە

ئاماژەی بە بابەتی گۆڕانکاریی کرد لە ناو ژیانی ئاژەڵەکاندا کە بە هۆی کۆچکردن و لە ژێر کاریگەریەتی دەورو پشتیاندا دروست دەبێت. ئەنجومەنی ناسراو بە "اخوان الصفا"[1] ئەم تیۆرەی جاحظی بە وردەکاریی زۆرترەوە لە ناو رەسائیل و باسەکانی خۆیاندا هێناوە. **ئیبن مەسکوویە** یەکەمین بیرمەندی ئیسلامی بوو کە تیۆریەکی رۆشن و لە زۆر لایەنەوە تازەی سەبارەت بە سەرچاوەی دروستبوونی مرۆڤ هێنایە ئاراوە. ئەمەی کە **مەولەوی** بابەتی هەرمانیی بوون بە شێوەی گەشەی بەرە بەرە و دامەزراو لەسەر زیندەوەرناسیی دەبینێت سەلماوە و دیارە. ئەو وەک دیکەی فەیلەسووفە ئیسلامیەکان بە بابەتێکی نازانێت کە چارەسەرکردنەکەی پەیوەست بێت بە هۆی فەلسەفی و میتافیزیکییەوە و وای دەبینێت کە ئەمە لەگەڵ رۆحی قورئاندا سازگارە. تیۆری گەشەکردن لە جیهانی ئەمڕۆدا لە جیاتی ئەوەی کە هیوا و مەیل بۆ ژیان زیادتر بکات بۆتە هۆی دروستبوونی نائومێدی و دڵمەشغوڵی. سەرچاوەی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ تیۆرییەکی نادروستی نوێ کە دەڵێت گەشەکردنی زیندەوەرناسانە دوایین قسەیە لە چوارچێوەی ئێستای مرۆڤدا چ لە باری رۆحیەوە و چ لەباری جەستەییەوە. جیهانی ئەمڕۆ پێویستی بە بیرمەندیک وەک مەولەوی هەیە بۆ ئەوەی هیوا بخوڵقێنێت و ئاگری حەز و شەیدایی بۆ ژیان لە گیانی کەسەکاندا بگیرسێنێتەوە. ئەم بەیتە بێ وێنانە لەو دەگێڕمەوە:

[1] گروپێک لە زانا ئیسلامییەکان لە سەدەی چوارەمی کۆچییدا تەنها رێگەی پالافتنی شەریعەیان لەخەوشەکان بە وە دەزانی کە لەگەڵ فەلسەفەی یۆنانییدا پێوەندی بدەنەوە. چالاکییەکانیان شاراوە و ریسالەکانیان بێ ناو بوو. لە بەغداد ە بەسرە پێگە و شوێنی چالاکییان هەبوو.

**آمــده اول به اقلـيم جمــاد**
**و ز جمادی در نباتی اوفتاد**
**سالها اندر نباتی عمــر کرد**
**و ز جمادی یاد ناورد از نبرد**
**هم چو میل کودکان با مادران**
**سر میل خود نداند در لبان**
**باز از حیوان سوی انسانیش**
**می کشد آن خالقی که دانیش**
**همچنین اقلیم تا اقلیـم رفت**
**تا شد اکنون عاقل و دانا و زفت**
**عقل های اولینش یاد نیســـت**
**هم از این عقلش تحول کردنی ست**

بە گشت ئەم باسانەوە خاڵێک لە ئارادایە کە بۆتە هۆی جیاوازی بیروباوەڕ لە نێوان فەیلەسووفەکان و موتەکەلیمە ئیسلامیەکاندا و ئەویش ئەمەیە کە ئایا دروستبوونەوەی دووبارەی مرۆڤ پێویستی بەوە هەیە کە وەک جاران لە قاڵبی جەستە و بە شێوەی ماددی بێت؟ زۆربەی ئەوان بۆ وێنە **شاە وەلی اللە**، دوایین موتەکەلیمی گەورەی ئیسلام مەیلییان بەم فیکرەوە هەیە کە خولْقاندنەوەی دووبارەی مرۆڤ بە لانی کەمەوە پێویستی بە جۆرێک واسیتەی ماددی هەیە کە لەگەڵ بارودۆخی ماددی منی تازەدا هاوئاهەنگ بێت. پێموابێت ئەم باوەڕە زیاتر پەیوەندی بەم ڕاستییەوە هەیە کە من وەک تاکێک، بێ لەبەرچاوگرتنی جۆرێک گەڕانەوەی شوێن یان بواری ئەزموونکراو ئەستەم دەنوێنێت. ئایەتەکانی خوارەوە ئەم خاڵە زیاتر دەردەخەن:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((بَلْ عَجِبُوا أَن جَاءهُمْ مُنذِرٌ مِّنْهُمْ فَقَالَ الْكَافِرُونَ هَذَا شَيْءٌ عَجِيبٌ (*) أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَاباً ذَلِكَ رَجْعٌ بَعِيدٌ (*) قَدْ عَلِمْنَا مَا تَنقُصُ الْأَرْضُ مِنْهُمْ وَعِندَنَا كِتَابٌ حَفِيظٌ)). واتە: "... **کافرەکان دەڵێن: ئەمە شتێکی سەیرە. چۆن کاتێک کە دەمرین و بوویە خۆڵ، زیندوو دەبینەوە. ئەمە گەڕانەوەیەکی دوور و ئەستەمە. ئێمە دەزانین کە زەوی چی لەوان کەم دەکاتەوە و لای ئێمەیە نامەیەکی ڕاگیراوی حسێبەکان**". (سورەتی ق، ئایەتی ٢-٤).

بە باوەڕی من ئەم ئایەتانە زۆر بە ئاشکرا ئەوە دەردەخات کە لە تەبعی ئەم جیهانەدا ئەم ئیمکانە شاراوە کە جۆرێک بوونی دەرەکی دیکە رابگرێت. ئەو بوونەی کە بۆ حسێبکردنی نیهایی وردەکارییەکانی کردەوەکانی مرۆڤ زۆر پێویستە تەنانەت لە دوای هەوڵ و لێکبوونەوەی جەستەی مرۆڤ لە بارودۆخی ئێستایدا دەردەخات دەپارێزێت. ئەمەی کە ئەم راگرتن و پاراستنە لە ڕێگەیەکیترەوە چۆناوچۆنە، ئەوە نازانین. هەروەها پێوەندندانەوەی ئەم بابەتە بە جۆرێک جەستەوە هەرچەند زۆر وردە، بەڵام روانینیکی تازە لە حەقیقەت و ناخی خولقاندنەوەی دووهەم دەستمان ناخات. مەبەستی تەمسیلەکانی قورئان سەبارەت بە خولقاندنەوەی دووهەم گێڕانەوەی چییەتی و تایبەتمەندیەکانی نییە. ئەوە تەنها وەک ڕاستییەک نیشان دەدات. ئەگەر ئەم باسە لە لایەنێکی فەلسەفییەوە هەڵسەنگێنین هیچ لەمە ئەستەمتر نییە کە بەپێی مێژووی مرۆڤ ئەرکی سەرشانی مرۆڤ بە مردنی جەستەکەی بە تەواو بوو بزانین.

بەپێی وتەکەی قورئان، دروستبوونەوەی دووبارەی من هاوڕایە لەگەڵ ڕوانینێکی وردبین کە بەوە ئەو چارەنووسە دەبینێتەوە کە بە دەستی خۆی سازی کردووە و بە دەوری ملییەوە بەستراوەتەوە.

بەهەشت و دۆزەخ چییەتی و حاڵەتن نەک ئەوەی کە شوێن بن. وەسفکردنەکانی بەهەشت و دۆزەخ لە قورئاندا نمایشتی بینراوەی ڕاستییەکی دەروونییە واتە تایبەتمەندی و چییەتیەکەیەتی. بە لێکدانەوەی قورئان دۆزەخ ئاگری هەڵگیرساوی خودایە کە بەسەر دڵەکاندا زاڵ بووە. ئەمەش وەسفێکی غەمگینی کۆتایی کردن و شکەستی مرۆڤێکە. بەهەشت شادی بەرهەمهاتووی سەرکەوتن بەسەر هێزگەلی رووخێنەرن. لە ئیسلامدا شتێک بە ناوی عەزاب و لەعنەتکردنی هەمیشەیی بوونی نییە. خودی قورئان وشەی "هەمیشە" کە لە هەندێ لە ئایەتەکاندا سەبارەت بە دۆزەخ بەکاربراوە بە واتای مەودایەک لە زەمەنە. وەها نییە کە زەمەن لە کامڵبوونی کەسایەتیدا شتێکی بێ کاریگەریەتییە. خەسڵەت و سرووشتی مرۆڤ مەیلی بەوە هەیە کە سەقامگرتوو و هەمیشەیی بێت و کەواتە سازکردنەوەی دووبارەی ئەو دەبێ بە تێپەڕبوونی زەمەنەوە روو بدات. وێنەیەک کە قورئان لە دۆزەخی هەیە لە چاڵێک ناچێت کە خودای تۆڵەسێنەر مرۆڤ لەوێدا تووشی ئەشکەنجەدانێکی هەمیشەیی بکات، بەڵکو ئەزموونێکی ئامۆژگاریکار و چاکخوازە کە ئیمکانی ئەوەی هەیە دڵڕەقترین مرۆڤ ئامادە بکات کە بۆ قبووڵکردنی نەسیمی گیانبەخشی لوتفی ئیلاهی ئامێز بکاتەوە. بەهەشتیش جێگەی حەسانەوە و بێ ئیشی نییە. ژیان یەکە و پەیوەستە. مرۆڤ بۆ وەرگرتنی حاڵەتە ئیشراقییە هەمیشە تازەکان لەو حەقیقەتە ناموتەناهییە پێش دەکەوێت کە هەر رۆژەو خەریکی کارێکن. ئەو کەسەی دەستی دەگاتە ئیشراقی ئیلاهی تەنها پەسیو و کاریگەریەتی وەرگرێک نییە. هەر کردەوەیەک لە لە تاک یان خودێکی ئازاد بارودۆخێکی تازە دروست دەکات و کەواتە دەرفەت گەلی زۆرتر بۆ دەرکەوتنی منی داهێنەر دەرەخسێنێت.

# رۆحی فەرهەنگی ئیسلامی

عـارفی گـەورەی جیهـانی ئیـسلام **عەبدولقـدووس گەنگهـی** دەڵێـت: "محەمەدی عەرەب عروجی کرد بۆ ئاسمان و گەڕایەوە. بە خودا سوێند دەخۆم کە ئەگەر من بگەیشتمایە ئەو شوێنە هەرگیز نەدەگەڕامەوە". ڕەنگە نەکرێ لە گشت ئەدەبی سۆفییەدا وتەیەکی وەها ئەویش لە یەک ڕستەدا بدۆزینـەوە کـە ئـاوەهـا ورد و ناسـک جیاوازییـەک دەربخـات. جیاوازی لە نێوان چەمکێکی دوروونناسیی واتە دوو جۆرە خودئاگایی پێغـەمبـەرانـە و عارفانـەدا. عـارف لـە دوای گـەیـشتن بـە هێمنایـەتـی بەرهەمهاتوو لە ئەزموونی یەکیەتی خودا مەیلی نییە کە بگەڕێتەوە و تەنانەت کاتێک کە بە ئیجبار دەگەڕێتەوە گەڕانەوەکەی بۆ مرۆڤایەتی واتایەکـی نییـە بێجگـە لـە بـەرژەوەنـدی تاکخوازانـە. بـەڵام گـەڕانـەوەی پێغەمبەر داهێنەرانە و گەشەکردووە. بەو هۆیەیە کە خۆی بخاتە ناو گـەڕیـانی زەمـەنـەوە بـەو هیوایـە کـە هێـزە مێژووییـەکـان بخاتـە ژێـر چاودێری و لـە ئیختیاری خۆیدا ڕایبگرێت تاکو بەم شێوەیە جیهانێک سـازبکات بـە گـەلێـک ئامـانجی تـازەوە. بۆ عـارف ئـارامیی پێکهاتـە لـە ئەزموونی ئیلاهی، ئیتر ئامانج و قیبلەی مەبەستە، بەڵام بۆ پێغەمبەر هەستانەوە و ئاگایی لە هێزە دەروونییەکانیەتی کە جیهان دەلەرزێنێت، ئـەم هێزە وەهایـە کە دەتوانێت جیهانی مرۆیی بگۆڕێت، ئـەم حـەزە لـە رادەی بـەرزی خۆیـدا لـە نـاو پێغـەمبـەردا بـوونی هـەیـە کـە گـۆڕانی

ئەزموونی ئایینی خۆی بە هێزێکی جیهانی و زیندوو ببینێت، کەواتە گەڕانەوەی پێغەمبەر جۆرێک ئەزموونی پراکتیکی ئەوە، ئیرادەی پێغەمبەر لە کردەوەی داهێنەریدا هەم ئاوڕ دەداتە سەر داوەریکردنی خۆی و هەم حەکەمبوونی جیهانی راستەقینە و هەوڵی ئەوە دەدات کە خۆی لەوێدا ببینێتەوە. پێغەمبەر بە کاریگەریەتی و نفووزکردنە ناو هەر شتێکی قاییم و دزە تێنەکراوی دژوار کە لە بەردەستیدا بێت، دەست دەداتە موکاشەفەی خۆی بۆ خۆی و لە بەرامبەر چاوی مێژوودا پیشانی دەداتەوە. رێگەیەکیتر کە هەیە بۆ داوەریکردن سەبارەت بە بایەخی ئەزموونی ئایینی پێغەمبەرێکەوە، ئەزموونی نموونەگەلێکە لە کۆمەڵگەی مرۆڤ کە ئەو خوڵقاندوویەتی و هەروەها حەکەمیەت و هەڵسەنگاندنی جیهان لەگەڵ فەرهەنگێکدا کە لە رۆحی پێغەمبەرەوە هاتووە. مەبەستم ئەوەیە کە لەم لێدوانانەدا تەنها ئاوڕ بدەمە سەر بەشی دووهەمی ئەم بابەتە، مەبەست ئەوە نییە کە دەمەوێ هەندێ زانیاریتان پێ بدەم سەبارەت بە دەستکەوتەکانی ئیسلام لە سنوورەکانی زانست و مەعریفەدا، بەڵکو بە شوێن ئەوەم کە سەرنجتان رابکێشم بۆ هەندێ لە لایەنەکانی ئەو چەمکە باڵایانەی کە بەسەر فەرهەنگی ئیسلامییدا حوکم دەکات. بۆ ئەوەی کە ڕوانینێکتان دەست بکەوێت سەبارەت بە ئەندێشە و ئیماژێک کە بناغەی ئەو چەمکانەیە. هەروەها ڕوانینیکتان هەبێت بۆ رۆحی ئەو بابەتانە کە چەمکەکان لەوێوە سەرچاوە دەگرن. بەرلەوەی دەست بدەمە ئەم کارە پێویستە لە بایەخی فەرهەنگی ئەندێشەیەکی مەزن و گران سەنگ لە ئیسلامدا تێبگەین. مەبەستم لەم وتەیە باوەڕ بە کۆتایی هاتنی دەزگای پێغەمبەرانەیە.

دەکرێ پێغەمبەر لە شێوازی جۆرێک خودئاگایی عیرفانییدا وەسف بکەین کە ئەزموونی ئیلاهی لەودا مەیلی هەیە بۆ فەیزبردن لە شتەکان و بەدوای دەرفەتگەلێکەوەیە کە دووبارە ڕێگە پیشانی ژیانی کۆیی بدات و چاکی بکاتەوە. سەنتەری ژیانی بەرتەسک تەنها بەو هۆیە لە ناخی کەسایەتی بێ سنووری ئەودا نوقم دەبێت کە دیسان بە هێزێکی تازەوە سەرهەڵبداتەوە، ئەوەی کە کۆنە لە ناوی بەرێت و ڕێگە تازەکانی ژیان ئاشکرا بکات. ئەم تەماسە لەگەڵ بنەڕەت و سەرچاوگەی بوون، تەنها تایبەت نییە بە مرۆڤ. چۆنیەتی بەکارهێنانی وشەی وەحی لەناو قورئاندا ئەوەمان پیشان دەدات کە ئەم کتێبە ئاسمانییە ئەو بابەتە وەک تایبەتمەندی و خاڵەکانی گشتی ژیان دەبینێت هەرچەند کە چییەتی و تایبەتمەندیەکانی ئەو لە قۆناغە جیاوازەکانی گەشەکردنی ژیاندا جیاوازن. ئەم ڕووەکەی کە ئازادانە لە خاکێکدا دەڕوێت، ئەو ئاژەڵەی کە ئەندامێکی تازەی جەستە لەودا دروست دەبێت بۆ خۆڕێکخستن لەگەڵ شوێنی نوێدا، مرۆڤێک کە لە ناخی ژیانەوە دەرکەوتنی حەق دەبینێت، ئەمانە گشتییان خاڵگەلێکن لە حاڵەت و تایبەتمەندییە جیاوازەکانی وەحی. ئەم وەحییە بەپێی پێویستی وەرگرەکانی وەحی یان بەپێی نیازی جۆر و لقەکانی وەرگری وەحی، لە یەکتر جیا دەبنەوە.

هێزی دەروونی مرۆڤ لە سەردەمی منداڵیدا گەشە دەکات، ئەم هێزە هەمانە کە بە خودئاگایی پێغەمبەرانە پێناسەی دەکەین. ڕەوشتێک کە بە باسکردن لە ئەحکام، ڕێگەچارەکان و فۆرمی لە وە پێش ئامادەکراو دەبێتە ئەوەی کە کات بۆ بیرکردنەوە و هەڵبژاردنی ڕێگە بەفیڕۆ نەچێت. لەو کاتەوە کە مرۆڤ دەبێتە خاوەنی عەقڵ و هێزی ڕەخنە، هێزی ژیان بەر دەگرێت بە گەشەکردنی حاڵەتە ناعەقڵانییەکانی خودئاگایی کە بەهۆی هێزی دەروونی ئەو لە قۆناغەکانی بەر لە

کامڵبوونی. مرۆڤ هەر لە بنەڕەتەوە لە ژێر کاریگەریەتی شەهوەت و خوی سرووشتی خۆیەتی. عەقڵی ئیستقرایی و کونجکۆڵ کە هەر خۆی بە تەنها هۆی سەرکەوتنی مرۆڤە بەسەر دەوروپشتییدا، بابەتێکی زۆر جێگەی سەرنجە. کاتێک کە لەدایک دەبێت دەبێ بە بەرگرتن لە گەشەی دیکەی حاڵەتەکانی مەعریفە، ئەوە پتەو و بەهێز بکەین. گومانی تێدا نییە کە جیهانی کەون ئارا سیستم و دەزگاگەلی فەلسەفی گەورەی دروست کرد و ئەمەش لەکاتێکدا روویدا کە مرۆڤ لە قیاس لەگەڵ ئەمڕۆدا سەرەتایی بوو، تاڕادەیەک لە ژێر کاریگەریەتی تەڵقین و گریمانەدا بووە. نابێ ئەوە فەرامۆش بکەین کە دروستکردنی ئەم دەزگایانە لە جیهانی کۆندا کاری ئەندێشەیەکی تاک رەهەند بووە کە ناتوانێت لە دیسیپلین بەخشین بە باوەڕە ئایینیەکان کە ئاڵۆزن و هەورەها لە سوننەتەکانەوە ئەولاتر بڕوات. بارودۆخی هەستپێکراوی ژیان هیچ کاریگەریەتییەکی لەوەدا نییە.

کەواتە ئەگەربێتو لەم روانگەوە سەیری ئەو بابەتە بکەین دەزانین کە پێغەمبەری ئیسلام لە نێوان دنیای قەدیم و نوێدا باڵای دیارە. تا ئەو شوێنەی کە لەگەڵ رۆحی وەحییدا پەیوەندی هەیە دەگەڕێتەوە بۆ دنیای نوێ. ژیان سەرچاوەگەلی دیکە لە مەعریفە لە ناخی ئەودا دەدۆزێتەوە کە لەگەڵ ریگەی تازەییدا یەک بگرێت. لەدایکبوونی ئایینی ئیسلام لەدایکبوونی عەقڵی ئیستقڕاییە کە هیوادارم بتوانم ئەم بابەتە هەرچی زووتر و بەو جۆرەی کە بە مەیلی ئێوە بێت بسەلمێنم. پێغەمبەریی لە ئیسلامدا ئاوەها دەسەلمێت کە پێویستیی بە مەنسووخبوونی دەردەکەوێت. ئەو بابەتە هەڵگری درک و تێگەیشتن لەم خاڵەیە کە ژیان ناتوانێت بۆ هەمیشە وەک منداڵێک لە ژێر کاریگەریەتییدا رابگیردرێت. بۆ ئەوەی کە بگاتە خودئاگایی کامڵ پێویستە کە مرۆڤ لە ئاکامدا

بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەی سەرەکی بوونی خۆیەوە. لەناوچوونی سەڵتەنەتی پشتاوپشت لە ئیسلامدا، حەزی زۆری قورئان پیشان دەدات بە عەقڵ و ئەزموون و هەروەها جەختکردنەوە لەسەر سرووشت و مێژوو وەک چاوگەی مەعریفەی مرۆیی کە لە ئارادایە، گشتییان ڕوخسارە جیاوازەکانی ئەندێشەیەکن کە ئەویش کۆتایی هاتنی پلەی پێغەمبەری و نوبووەتە. ئەم ئەندێشە بەو مانایە نییە کە ئەزموونی عیرفانی کە لە باری چییەتییەوە جیاوازیەکی لەگەڵ ئەزموونی رۆحانییەوە نییە ئیتر لەو حەقیقەتەی خۆی وەک ژیان دابڕاوە. لە ڕاستییدا قورئان نەفسی خۆی و جیهان وەک سەرچاوە و بناغەکانی ئاگایی و مەعریفە ئەژمار دەکات. خودا هەروەک چۆن نیشانەکانی خۆی لە ئەزموونی دەرەکییدا دەردەخات، لەناو ئەزموونی ناوەکیشدا نیشانی دەدات. ئەمە ئیتر ئەرکی سەرشانی مرۆڤە کە شیاویی و لەخۆگریی مەعریفە لە گشت لایەنەکانی ئەزموونندا بخاتە بەر داوەریکردن. نابێ وابیر بکەینەوە کە ئەندێشەی کۆتایی هاتنی پێغەمبەرایەتی چارەنووسی نیهایی ژیانە و عەقڵ بە تەواوەتی جێگەی هەست و عاتیفەی گرتۆتەوە. وەها شتێک نە مسۆگەرە و نە خۆشە. بایەخی عەقڵی ئەم ئەندێشەیە ئەوەیە کە مەیلی بەوە هەیە تاکو ڕوانینێکی سەربەخۆ و رەخنەگرانە لە بەرامبەر ئەزموونی عیرفانییدا ساز بدات و ئەم باوەڕە عیرفانییە کامڵ بکات کە دەسەڵات و توانایی گشت ئەو کەسانەی کە بانگەشەی بنەڕەتیی"ما بعد الطبيعة"یان هەیە لە مێژووی مرۆییدا کۆتایی پێ هاتووە. ئەم جۆرە باوەڕە هێزێکی راوەستاو لەسەر دەروونناسییە کە وەها توانا و دەسەڵاتێک لە گەشە دەخات. بەکارهێنانی ئەم ئەندێشەیە دەبێتە کردنەوەی ڕوانگەیەکی تازە لە مەعریفە لە هەرێمی ئەزموونی دەروونی مرۆڤدا. رێک بەو جۆرە کە نیوەی دەنگە ئیسلامییەکان هاتن و

ڕۆحی ڕوانینی ڕەخنەگرانە بۆ ئەزموونە دەرەکییەکانی مرۆڤیان بەهێزتر کرد و تینییان پێ بەخشی. ئەویش لە ڕێگەی بیرکردنەوەی قووڵ لە هێزە سرووشتییەکان بوو کە ئەو لایەنە مێتافیزیکیەی کە فەرهەنگی پێشوو بەسەریانیدا سەپاندبوو، لادا و ڕاستییەکەیان دەرخست و واقیعەکەیان ئاشکار کرد و بۆ ئەزموونی دەرەکی مرۆڤ ڕۆحی ڕوانینی ڕەخنەگرانەی سازدا و گەشەی پێکرد. ئێستا ئیتر هەر موسڵمانێک دەبێ ئەزموونی عیرفانی و ناوەکی هەرچەند کە نائاسایی بێت و نامۆ، وەک ئەزموونێکی زۆر سرووشتی قبووڵ بکات کە وەک دیکەی لایەنەکانی ئەزموونی مرۆیی لە بەر ڕەخنەگرتنێکی زۆر بە بڕشتدایە. ئەم بابەتە لە شێوازی ڕووبەڕووبووونەوەی خودی پێغەمبەر بە نیسبەت ئەزموونە دەروونیەکانی ابن صیاد دەردەکەوێت. ئەرکی تەسەووف لە ئیسلامدا ڕێکخستنی ئەزموونی عیرفانی بووە. دەبێ باس لەوە بکەین کە **ئیبن خەلدوون** تەنها زانیارێکی ئیسلامییە کە ئەم ئەزموونەی لەگەڵ ڕۆحی زانستییدا گرێ داوەتەوە.

ئەزموونی دەروونی تەنها یەکێکە لە سەرچاوەکانی بەدەستهێنانی مەعریفە بۆ مرۆڤ. بە پێی وتەی قورئان سرووشت و مێژوو دوو سەرچاوەی دیکەی مەعریفە و ناسینن. بە قووڵبوونەوە لەم سەرچاوەگەلەی مەعریفەیە کە ڕۆحی ئیسلام لە باشترین شێوازییدا درک دەکرێت. قورئان نیشانەکان و ئاسەوارەکانی حەقیقەتی کۆتایی لە "خۆر" و "مانگ" و "ڕاکشانی سێبەرەکان" لە بەدواداهاتنی "شەو و ڕۆژ" لە "جیاوازی نێوان ڕەنگ و زمانەکان" و لە "بەدواداهاتنی شادی و خەم لە نێوان خەڵکدا"دەبینێت. لەڕاستییدا گشت ئەو شتانەی کە لە سرووشتدا بۆ درکی هەستەکانی مرۆڤ دیارە. ئەرکی کەسی موسڵمان تێڕامان لەم نیشانانەیە نەک ئەوەی کە بەلایاندا وەک"کوێر و

کەڕێک"تێپەڕ بێت. لەبەرئەوەی کە ئەو کەسەی کە ئەم نیشانانە لەم دنیایەدا نابینێت لە بەرامبەر ڕاستییەکانی ئەو دنیایەی دیکەش کە دوایی دێت چاوی نابینێت.

لە ئاکامدا تێکەڵێک لە بابەتە لەمسکراوەکان بە تێگەیشتنی بەرە بەرە لە وانەکانی قورئان کە عالەم لە زاتی خۆیدا بە گەشەکردوو و زیادکراو دەبینێت، بیرمەندانی ئیسلامی برد بەرەولای دژایەتیکردن لەگەڵ ئەندێشەی یۆنانی کە لەسەرەتای پێشکەوتنی سەردەمی کاری خۆیدا بە حەزێکی زۆرەوە لەم بوارەدا دەستیان دابووە موتالا و لێکۆڵینەوە. ئەوان لەبەرئەوەی کە نەیاندەزانی رۆحی قورئان لە بنەڕەتەوە دژ بە ئەندێشەی یۆنانییە، هەربۆیە متمانەیەکی تەواویان بە بیرمەندانی یۆنانی هەبوو. یەکەمین خوازەیان ئەوە بوو کە قورئان لە ژێر رووناکی چرای فەلسەفەی یۆنانییدا موتالا بکەن و لێی تێبگەن. ئەم هەوڵە لەبەرئەوەی کە رۆحی قورئان سەرنجی دەدایە لەمسکراوەکان و هەروەها لەلایەکی دیکەوە چییەتی تیۆرێکی فەلسەفەی یۆنان هەر لە بنەڕەتەوە بە تەواوەتی واقیعی نەدەبینی، هەر لەسەرەتاوە شکستی خوارد. بەرهەمی ئەم شکستە بووە هۆی ئەوەی کە رۆحی راستەقینەی فەرهەنگی ئیسلامی ئاشکار بکات و تان و پۆی فەرهەنگی نوێ لە هەندێ لە گرنگترین لایەنەکانییدا دابمەزرێنێت.

ئەم شۆڕشە فیکرییە دژ بە فەلسەفەی یۆنانی خۆی لە گشت دەڤەرەکانی بیرکردنەوەدا ئاشکرا دەکات. دەترسم سەبارەت بەم بابەتە شتیک بڵێم لەبەرئەوەی کە بابەتێکە بە بیرکارییی، فەلەکناسیی و پزیشکییەوە پەیوەستە و من لەم بارەوە شارەزایی تەواوم نییە. ئەم ئەندێشەیە لە فیکری مێتافیزیکی ئەشعەرییەکاندا بە ئاشکرا دەبیندرێت و لە رەخنەگرتنی موسڵمانان لە لۆژیکی یۆنانی بە باشترین پێناسە

دەردەکەوێت. ئاساییە کە دەبێ وا بێت. ناڕەزایەتی لە فەلسەفەی یەکسەرە تیۆرێک بە واتای گەڕانە بۆ دۆزینەوەی ڕێگەیەکی بە متمانە بۆ گەیشتن بە مەعریفەیە. وادەزانم **نظام** یەکەمین کەس بوو کە توخمی"شککردن"ی وەک دەستپێکی هەر جۆرە ناسین و مەعریفەیەک کردە ڕێسا و ڕێکی خست. **غەزالی** لە کتێبی"احیاء علوم الدین"دا بە تێروتەسەلی باسی لێکردووە و ڕێگەی کردۆتەوە بۆ مێتۆدی دیکارتی. بە گشتی **غەزالی** لە لۆژیکدا پەیڕەوی میتۆدی ئەرستۆیی مایەوە. ئەو لە کتێبی"قسطاس"دا هەندێ لە باسە قورئانییەکان لە شێوازی لێکدانەوەی ئەرستۆییدا دەخاتە بەرچاو، بەڵام سەرنجی ئەوە نادات کە قورئان لە سورەتی"الشعراء"دا بابەتی سزادانی کەسانێک کە نکولییان لە پێغەمبەر کردووە لەسەر بنەمای شێوازی سادەی باسکردن لە وێنە مێژووییەکان داڕشتوە. **شێخ ئیشراق** و **ئیبنی تەیمیە** لەو کەسانە بوون کە لۆژیکی شیکاریی یۆنانییان بە تەواوەتی رەتکردەوە. رەنگە **ئەبوبەکری رازی** یەکەمین کەس بێت کە شیکاریی یەکەمی ئەرستۆی خستۆتە بەر رەخنە. دژایەتیکردنی ئەو لەگەڵ فیکری ئەرستۆدا کە بە تەواوەتی خاوەنی رۆحی ئیستقڕاییە. لەسەردەمی ئێمەدا لە لایەن **جان ئیستوارت میل،** بە شکڵ و دیسیپلینێکی نوێوە باسی لێکرا. **ئیبن حەزەم** لە کتێبەکەیدا بە ناوی "التقریب لحد المنطق"دا، متمانە بە درکی هەستکردن وەک سەرچاوەی مەعریفە دەکات. **ئیبن تەیمیە** لە کتێبی "الرد علی المنطقین"دا ئەوەمان پیشان دەدات کە ئیستدلالی ئیستقراریی تەنها شێوازی هۆکارییە کە متمانەی پێ بکرێت. بەم شێوەیە دەردەکەوێت کە شێوازی تاقیکاریی و ڕوانین لێرەوە دێت و ئەمەش بابەتێکی تەنها تیۆرێک نەبووە. کەشفکردنەوەکانی **ئەبوورەیحان بیرونی** واتە ئەو شتەی کە لە دەروونا سییدا بە کاتی پەرچەکردار ناوی لێدەبرێت و هەروەها

دۆزینـەوەی ئەوەی کـە پـەیـوەنـدی نێـوان هـەسـت و خـوازە بـە بـاڵانس دەزانێت، هەموو وینەگەلێکن کە لەگەڵ زانستی دەروونـاسیی ئـەمڕۆکـەدا یـەک دەگـرن. هـەڵـەیـە ئـەگـەر وابـزانین کـە"شـێوازی تاقیکـاریی"لـەلایـەن ئەوروپاییـەکانـەوە سـازکراوە. **دورینـگ** بـاس لـەوە دەکـات کـە چـەمکـە زانـستییەکـانی **راجێـر بـیکەن** وردتـر و روونـاکترە لـە هاونـاوە بـەناوبانگـەکـەی. **راجێـر بـیکەن** لـە کـوێ پـەروەردە بـووە؟ لـە زانکـۆ ئیسلامییەکانی ئـەنـدۆلۆس. دەکـرێ بڵێین کـە بـەشـی پێنجـەمـی "کتـاب اکبر"ی ئـەو کـە تایبـەت کـراوە بـۆ زانستی "منـاظر و مرایا" لـە ڕاسـتییدا نووسینەوەیەک لە کتێبی المناظری **ئیبن هەیسەم**. هەروەها گەلێک بەڵگە لەناو کتێبەکەدا دەدۆزرێتەوە کـە پیشاندەری کاریگـەریـەتی **ئیبن حەزم** لەسەر ئامادەکاری کتێبە. ئەوروپا لە ناسینی بنەڕەتی ئیسلامی شێوازی زانستی خۆیدا تاڕادەیەک ئیهمال بوو. لە ئاکامدا کاتی ئـەوە هـات کـە بـۆ ئەوەی کە ڕاستییەکان بە تەواوەتی دەربخات. ئیزنم بدەن لێرەدا هـەنـدێ باس لە کتێبی"دروستکردنی مرۆڤایەتی"ئامادەکردنی بریفاولت بگێڕمەوە:

"**راجێـر بـیکەن** زمـانی عـەرەبـی و زانـستە ئیـسلامییەکـان لـە ژێـر چاودێری کـەسـانێکدا فێر بـوو کـە جێگری ئـەوان بـوون لـە قوتابخانـەی ئۆکسفۆرد. **راجێر بیکەن** بـە هێنانـە ئارای شێوازی تاقیکاریی متمانـە و مـافێکی بۆ خـۆی دەستـەبـەر نـەکرد. **راجێر بیکەن** لـە بانگـەشـەکـارێکی زانـستی زیـاتر نـەبـوو کـە زانـستی ئیـسلامی و شـێوازەکـەی بـرد بـۆ ئەوروپای مەسیحی. ئەو بەردەوام باس لەوە دەکات کە فێربوونی زمـان و زانستی ئیسلامی تەنهـا ڕێگـەی گـەیشتن بـە زانستی راستـەقینـەیـە بـۆ هاوچەرخەکانی ئـەو. هێنانـە ئارای ئـەم جـۆرە باسـانە کە بناغـەداڕێژی شـێوازی تاقیکـاریی کـێ بـووە، بـەشـێکە لـەو ریـزە هـەڵـەکاریانـەی کـە شارسـتانیەتـی ئەوروپـایی دەیکـات. شـێوەی تاقیکـاریی ئیـسلام لـە

سەردەمی **راجێر بیکەن** دا لە سەرانسەری ئەوروپادا پەرەی سەند و ئەوروپاییەکان بە حەزێکی زۆرەوە گەشهیان پێدرا." لاپەرەی ٢٠٢.

"درەختی زانست گرنگترین دیاری و خەلاتی شارستانیەتی ئیسلامە بۆ جیهانی نوێ. کاتیکی زۆری برد هەتا بەری ئەم دارە پێ بگات. ماوەیەکی کەم لەدوای ئەوەی کە فەرهەنگی ئەندۆلۆسی کەوتە ناو تاریکاییەوە، ئەو هەژدیهایەی کە لە ناو داوینی خۆیدا پەروەردەی کردبوو هاوشانی دەسەلاتی ئەو سەری هەڵێنا. تەنها زانستی ئیسلامی نەبوو کە ئەوروپای بۆ ژیان گەڕاندەوە. زۆر کاریگەریەتی دیکەش لە فەرهەنگی ئیسلامی هەبوو کە یەکەمین تیشکی رۆشنایی گەڕاندە ناو ژیانی ئەوروپاییەکانەوە". لاپەرەی ٢٠١.

"تەنانەت یەک خاڵ شک نابرێت لەناو گەشەی فەرهەنگی ئەوروپادا کە نیشانەیەک لە کاریگەریەتی حاشاهەڵنەگری فەرهەنگی ئیسلامی تێدا نەبێت. ئەم کاریگەریەتییە لە هیچ بوارێکدا ئەوەندە دەرنەکەوتووە کە لە دروستبوونی ئەو هێزەی کە بۆتە هۆی دروستبوونی دەسەلاتی مەعنەوی گەورە و چەقبەستووی دنیای نوێ و بۆتە سەرچاوەیەکی گرنگ لە سەرکەوتنییدا و ئەمەش هەمان زانستی سرووشتی و رۆحی زانستییە". لاپەرەی ١٠٩.

"بیرمەندانی ئێمە قەرزارباری زانستە ئیسلامییەکانن و ئەمەش تەنها ناگەڕێتەوە بۆ داهێنەری و دۆزینەوە سەرسووڕهینەرەکان لە ناو تیۆرییە شۆڕشییەکاندا. زانستگەلێک لەوە زیاتر قەرزی فەرهەنگی ئیسلامی لەسەرشانە و بوونی خۆی دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەو فەرهەنگە. هەروەک دەزانین جیهانی کەون دنیایەکی بەر لە زانست بوو. فەلەکناسیی و بیرکاری لەو زانستە یۆنانییانە بوو کە لەگەڵ فەرهەنگی ئەواندا بە تەواوەتی رێ نەکەوت. یۆنانیەکان لە بواری فیکری و

لێکۆڵینەوەییدا بەڵام لیکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی بە سەبر، داڕشتنی زانستی پراکتیکی، شێوازەکانی وردی زانستی، روانین و لیکۆڵینەوە بە تاقیکاریی قووڵ و بەردەوامەوە بە گشتی لەگەڵ خو و خەسڵەتی یۆنانییەکاندا یەکی نەدەگرت. لە جیهانی کەون ئارادا کە فەرهەنگی یۆنانی بەسەریدا زاڵ بوو تەنیا لە شاری ئەسکەندەریە حەزێک دەبینرا بۆ کاری زانستی. ئەو بابەتەی کە لە ئەورووپا بە ناوی کاری زانستییەوە بە دەرکەوتنی زانستی ناو دەبەین وەک رۆحێکی تازە لە لیکۆڵینەوەدا، شێوازی تازە بۆ هەڵسەنگاندن، روانین و قیاسکردن، گەشەی بیرکاری و بابەتی دیکە، گشتی ئەمانەی ئیسلام بە ئەورووپا ناساند". لاپەرەی ١٩٠.

یەکەمین خاڵی گرنگ کە سەبارەت بە فەرهەنگی ئیسلامی دەبێ سەرنجی پێ بدرێت ئەمەیە کە ئیسلام نیگای خۆی لە ئامانجە زانستییەکاندا بڕیوەتە شتە بینراوەکان و ئەوەی کە سنووردارە، هەروەها دیارە کە دامەزراندنی شێوازەکانی روانین و تاقیکاریی لە ئیسلامدا بە هۆی خۆسازدان لەگەڵ فیکری یۆنانییەکاندا نەبووە، بەڵکو بە هۆی ئەو جەنگە درێژخایەنەوە بووە کە لە هەرێمی ئەندێشەدا لەگەڵییدا هەیبووە، هەر بەو جۆرەی کە بریفاولت دەڵێ، یۆنانیەکان کە مەیلیان زیاتر بە تیۆری دڕاشتن بووە و زۆر سەرنجیان نەدەدایە بابەتە راستەقینەکان، لەڕاستییدا کاریگەریەتییەکیان لەسەر مسوڵمانەکان دانا کە بووە هۆی ئەوەی کە روانینیان بەرامبەر بە قورئان لێڵ بێت، لانیکەم دوو سەدەی پێچوو هەتا خوڵق و خووی مسوڵمانەکان لە کردەوەدا دەربکەوێت و بەو شتەی کە هەیانە فەخر بکەن، بەمشێوەیە دەمەوێت ئەم بیرۆکە هەڵەیەی کە فیکری یۆنانی خەسڵەتی فەرهەنگی ئیسلامی شکڵ بەخشیوە بەتەواوەتی لە رەگ و ریشەوە هەڵکەنم، لەم بارەوە نیوەی هۆکانی خۆمم باسکردووە و ئێستا دێمە سەر نیوەکەیتری.

زانست دەبێ بە بابەتە عەینییەکانەوە دەست پێبکات، خاوەندارێتی زاڵبوون و دەسەڵاتی عەقڵی بەسەر ئەو شتەی کە بینراوە، ئەم ئیمکانە بۆ عەقڵی مرۆڤ پێکدەهێنێت تاکو بڕواتە ئەوسەری بابەتە مەلموسسەکانەوە، هەر بەو شێوەیە کە قورئان دەڵێت:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا مِنْ أَقْطَارِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ فَانفُذُوا لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَانٍ)). واتە: **"ئەی گروپی پەریەکان و مرۆڤەکان، ئەگەر دەتوانن لە سنوورەکانی ئاسمانەکان و زەوی بچنەدەر، بڕۆن، ناتوانن بڕۆن مەگەر بە هێزی عەقڵ نەبێت".** (سورەتی الرحمن، ئایەتی ٣٣)

عالەم بە شێوەی کۆیەک لە شتە سنووردارەکان خۆی بە شێوەی دورگەیەک کە لە بۆشایی رەهادا دانراوە پیشان دەدات، کات بە نیسبەت ئەوەوە هەروەک ریزێک لە ساتە جیاکان و دژبەیەک وێناکراوە کە نە حسێب دەکرێت و نە کارێک ئەنجام دەدات. وەها روانینێک سەبارەت بە عالەم، عەقڵی بیرمەند ناگەیەنێتە هیچ شوێنێک، لەبەرچاوگرتنی سنوورێکی نیهایی سەبارەت بە شوێن و زەمەنی ئیدراکی، بناغەکانی عەقڵ لەرزۆک دەکات، ناچار سنووری نیهایی لەمبارەوە گومانێکی هەڵەیە کە بەر بە گەشە و حەرەکەی عەقڵ دەگرێت، بۆ ئەوەی کە عەقڵ بیەوێت لە سنوورەکانی ئەو تێپەڕ بێت دەبێ بەسەر زەمەنی تەسەلسوولی و بۆشایی رەها و شوێنی درککراو زاڵ ببێت. قورئان دەڵێت: ((إِلَى رَبِّكَ مُنتَهَاهَا)). واتە: **"سەرچاوە و کۆتایی ئەو شتانە خودای تۆیە".** (سورەتی النازعات، ئایەتی ٤٤).

ئەم ئایەتە یەکێک لە قووڵترین ئەندێشە قورئانیەکانی تێدایە، لەبەرئەوەی بە ئاشکرا باس لەوە دەکات کە سنووری کۆتایی نابێ لە

ڕێگەی ئەستێرەکاندا بە شوێنیدا بگەڕێین بەڵکو دەبێ لەناو ژیانێکی بێ کۆتایی ئاسمانی و ڕۆحی بیدۆزینەوە. سەفەری عەقڵ بۆ ئەم سنوورە کۆتاییە سەفەرێکی دوور و درێژ و پڕ لە مەترسییە. لەم هەوڵەشدا ئەندێشە ئیسلامییەکان دەردەکەون کە لە ڕێگەیەکی تەواو جیاواز لەگەڵ ئەندیشەی یۆنانییدا لە حەرەکەدایە. بە وتەی **ئێشپێنگر**، ئامانجی یۆنانییەکان لەناو هاوتەریبییدا کۆدەکرایەوە و لە بێسنووری و بێ ڕێژەییدا نەبوو، واتە تەنها ئامادەیی فیزیکی و مادی هەر شتێکی سنووردار بە گشت سنوورە دیاریکراوەکانیەوە سەرنجی ئەوانی بەرەو لای خۆی ڕاکێشا. بە سەرنجدان لە مێژووی فەرهەنگی ئیسلامی لەوە تێدەگەین کە ئەندێشەی ئارمانی دۆزراوە، هەم لە هەرێمی عەقڵی ڕەهادا و هەم لە دەروونناسیی ئایینیدا، لە خۆگرتنی زاتی بێسنوور و بەهرەگرتنەوەوەیە. فەرهەنگێک کە وەها ڕوانینێکی هەیە بابەتی زەمەن و شوێن لەودا دەبێتە بابەتی ژیان و نەمان. بەرلەمە لە یەکێک لە لێدوانەکانمدا سەبارەت بە هەندێک لە ڕوانگەکانی تایبەت بە بابەتی زەمەن و شوێن لە گۆشەنیگای بیرمەندە ئیسلامیەکانەوە بەتایبەت ئەشعەریەکان، هەندێ خاڵم باس کردووە.

یەکێک لەو هۆیانەی کە بووە هۆی ئەوەی کە ئەتۆمخوازیی دموکریتوس لە جیهانی ئیسلامدا خوازیاری نەبێت، قبووڵکردنی ئەو ڕوانگەیە لەخۆگریی لەبەرچاوگرتنی شوێنێکی ڕەهایە، ئەشعەریەکان هاتن و ئەندێشەیەکیتریان لە بواری ئەتۆمخوازییدا پەروەردە کرد و هەوڵیاندا تاکو زاڵ بن بەسەر گرفتەکانی بابەتی شوێنی درککراو. بەجۆرێک کە هاوشێوەی ئەتۆمخوازیی نوێ بووبێ، دەبێ ئەوەمان وەبیربێتەوە کە لە ڕۆژگاری **بەتلەمیووس** هەتا کاتی **خواجە نەسیر توسیی،** بابەتی هێڵە تەریبەکانی **ئۆقلیدۆس** لەسەر بنەمای شوێنی

درککراودا شیی کراوەتەوە و کەس وەها روانگەیەکی شیاوی لە دەڤەری بیرکارییدا نەهێنابووە ئاراوە. **خواجە نەسیر** یەکەمین کەسە کە هێمنی هەزار ساڵەی زاڵ بەسەر جیهانی بیرکاریی شێواندو لە کاتی هەوڵ و تیکۆشان بۆ چاکسازیی و شیکاریی زیاتری بنەماکانی بابەتی **ئۆقلیدۆس** بوو کە لەوە تێگەیشت پێویستە شوێنی درککراو لابەرین. بەمشێوەیە ئەو بناغەیەکی تارادەیەک پتەو بۆ راپەرینی فیکری هایپێر شوێن Hyperspace لەم زەمەنەدا دادەرێژێت. **ئەبو رەیحان بیرونی** لە پرۆسەی لیکۆڵینەوەکانیدا لە خاڵێک تێگەیشت کە لە بیرکاریی نوێدا بەوە دەڵێن گۆڕانکاریی دووهەم یان تابع، ئەو بە نیگایەکی زۆر زانستییەوە بە هەڵەبوونی ئەو روانگەیەی زانی کە جیهانی بە راوەستاو دەزانی، ئەمەش شێوازێکی روونی دیکەیە لە گەڕانەوە و لادان لە بیرۆکەی یۆنانی. تیۆری تابع لە بیرکارییدا باس لە توخمی زەمەن دەکات لە وێنایەک کە لە جیهانمان هەیە و راوەستاو دەکات بە بابەتێکی بگۆڕ. جیهان بە شتێکی چەقبەستووی هەبوو نازانێت، بەڵکو بە بابەتێکی بگۆڕ و بزۆک دەزانێت. ئێشپێنگلێر وادەزانێت کە چەمکی بیرکاریی تابع لە ریزی تیۆریەکانی زانستی جیهانی رۆژئاوایە و"فەرهەنگی هیچ خاڵێک لەم جیهانە ڤ تەنانەت ئاماژەیەکیشی پێنەداوە"لەحاڵێکدا کە تیۆری تەعمیمی **ئەبو رەیحان بیرونی** لە لایەک و فۆرمۆڵی رێژەیی **نیۆتۆن** لە تابعی هەندیسی بە هەر تابعێکیتر لەڕاستییدا بێ بنەمابوونی ئەو روانگەیەی **ئێشپێنگلر** پیشان دەدات. **ئەبو رەیحان** هەنگاوێکی دیاری هەڵێنا بەرەو ئەو شوێنەی کە **ئێشپێنگلر** بە ژمارە تەسەلسولیەکان ناویان دەبات کە پیشاندەری تێپەڕینی زەین لە قۆناغی بوونە بەرەو گۆڕین. پێشکەوتنی بیرکاریی نوێ لە ئەوروپا لەڕاستییدا زیاتر مەیلی بەوە هەیە کە بابەتی زەمەن بە گشت تایبەتمەندییە مێژووییە

زیندووکانیەوە لە بیرکاریی جیا بکاتەوە و ئەوە بکات بە وێنەیەکی رەها کە پێکهاتووی شوێنە. ئاوایە کە باوەڕی **وایتهد** سەبارەت بە تیۆری رێژەیی زیاتر لە تیۆری **ئەنشتاین** لای مسوڵمانەکان سەرنجی پێدراوە. لەبەرئەوەی لە تیۆری رێژەیی **ئەنشتایندا** زەمەن بێ بەرییە لە تایبەتمەندی تێپەڕین و گوزەر کردن و بەشێوەیەکی پڕ لە نهێنی دەگۆڕدرێت و دەبێت بە شوێن یان فەزا.

لە حاڵێکدا کە زانستی بیرکاریی لە ئیسلامدا پێش دەکەوێت دەبینین کە ئەندێشەی کامڵبوونیش بەرەبەرە لای ئەوەوە شێوازی خۆی پەیدا دەکات. **جاحز** یەکەمین کەس بوو کە بە کاریگەریەتی کۆچکردن و گۆڕانکاریی و بەدواهاتەکانی لە ناو ژیانی باڵندەکانی زانی. پاشان **ئەبو عەلی مەسکویە،** کەسی هاوچەرخی **ئەبو رەیحان** ئەو بابەتەی خستە ناو تیۆرییەکی دیاریکراو و لەناو بەرهەمی کەلامی خۆیدا واتە فوز الاصغر، کەڵکی لێوەرگرت. لێرەدا دەمەوێ کاکڵەی باسەکەی ئەو سەبارەت بە کامڵبوون بخەمە بەرچاو. نەک تەنها لەبەرئەوەی کە بایەخی زانستی هەیە، بەڵکو بەهۆی تیشکێک کە خستیە ناو رێگەی حەرەکەی فیکری مسوڵمانانەوە. بەپێی وتەکەی **ئەبو عەلی مەسکویە،** ژیانی ڕووەک واتە حیات نباتی، لە خوارترین پلەی قۆناغی کامڵبووندا بۆ گەشە و گەورەبوون پێویستی بە دەنک و تۆو نییە. لەم قۆناغەدا مانەوە و ژیانی جۆرەکانی ڕووەک بە هۆی دەنکەوە ناپارێزرێت. ئەم جۆرە ژیانە ڕووەکییە تەنها بە هێزێکی کەم کە لە حەرەکەدا هەیەتی لەگەڵ جەماداتدا جیاوازی هەیە. هەر ئەم حەرەکەیە کە لە شێوازەکانی سەرتری ژیانی ڕووەکییدا دەردەکەوێت و لە کۆتاییدا لە شێوازی ڕووەکێک بە پەل و پۆی بەربڵاوەوە خۆی نیشان دەدات. بنچینەی جۆر و لقەکانی بە تۆ و دەنک دەپارێزیت. هێزی حەرەکە بەرەبەرە زیاتر

گەشە دەکات تارادەیەک کە ئەوە بە شێوەی دار و درەختی بە لق و پۆ و بەر و میوەوە دەبینین. لە پلەی بەرزتری کامڵبووندا شێوازگەلی ژیانی ڕووەکی هەیە کە بۆ گەشەکردن پێویستی بە خاک و ئاو و هەوای بەپیت هەیە. دوایین پلەی ئەم کامڵبوونەوە لە ناو مێو و دارخورمادا دەبینین کە دەڵێی لە ژیانی ڕووەک تێپەڕیون و لەسەر دەروازەی ژیانی ئاژەڵییدا راوەستاون. لە دارخورمادا جیاوازی رەگەزی بە ئاشکرا دیارە. ئەم گیایە بەدەر لە ریشە و لقەکانی کە بڵاوی دەکاتەوە شتێکی هەیە وەک مێشکی ئاژەڵ کە لەوێدا ئەرکی خۆی بەڕێوە دەبات کە هەموو ژیانی بەستراوە بەوەوە. ئەمە سەرترین قۆناغە لە کامڵبوون و گەشەی ژیانی ڕووەکیی و سەرەتا و دەرگایەکە بۆ هاتنە ناو ژیانی ئاژەڵیی. بزۆک بوون یەکەمین هەنگاوە بەرەو ژیانی حەیوانی و تۆو و هەوێنی حەرەکەی ئاگایانەیە. ئەمە یەکەمین قۆناغی ئەم جۆرە ژیانەیە کە سەرەتا هەستی لەمسکردن و لە کۆتاییدا هەستی دیتن دەردەکەوێت. بە گەشەکردنی هەستەکان لە ئاژەڵەکاندا ئەم ئیمکانە دێتە ئاراوە کە ببزوێن. ئەم باسەی ئاماژەی پێدرا لە ناو کرمەکان، خزۆکەکان، مێرولە و زەرەگەتەکاندا دیارە. ژیانی ئاژەڵی لەناو چوارپێکاندا لە ئەسپ و لەناو باڵندەکاندا لە هەڵۆدا دەگاتە تەشقی خۆی. لەئاکامدا لەناو مەیموونندا دێتە سەر سنووری ژیانی مرۆیی کە لەناو ریزبەندی پرۆسەی کامڵبووندا یەک پلە لە خوارترە لە مرۆڤ. پێشکەوتنی ئەم پرۆسەیە لە مرۆڤدا بە گۆڕانکاریی ئەندامەکان و بەهێزبوونی هێزی لێکدانەوە و هێزی مەعنەوی هاوکاتە تا ئەو کاتەی کە مرۆڤایەتی قۆناغی وەحش تێپەڕ دەکات و دەگاتە شارستانیەت. ئەم بابەتە لە ڕاستییدا دەروونناسیی ئاینی یان عیرفانی بەرزە. هەروەک چۆن بۆ وێنە **فەخرەدین عەراقی و خواجە محەمەد پارسا**مان هەیە کە

ئێمە زیاتر نزیک دەکاتەوە لە شێوازە نوێکانی روانین بۆ بابەتی شوێن و زەمەن. بەرلەوە روانگەی عەراقییمان باس کرد سەبارەت بە پۆلێنکاریی زەمەن. ئێستاش کورتکراوەی باسەکەی لەسەر شوێن واتە مەکان دەخەینە بەرچاو.

بە پێی وتەی **عەراقی** هەبوونی جۆرێک شوێن لە پەیوەندی لەگەڵ خودا لەم ئایەتانەوە دەردەکەوێت:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((**أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَى ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَا أَدْنَى مِن ذَلِكَ وَلَا أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ**)). واتە: "**مەگەر نازانی کە خودا بە هەرچی کە لە ئاسمانەکان و زەوییدایە دەزانێت. هیچ نهێنی بێژییەکی سێ کەسی لەئارادا نییە مەگەر ئەوەی کە خودا چوارەم کەسی نەبێت و نە پێنج کەسێک کە خودا شەشەم کەس نەبێت و نە کەمتر لەوە و نە زێتر هەیە مەگەر ئەوەی کە لە هەر کوێ بن خودا لە لای ئەوانە**". (سورەتی المجادلة، ئایەتی ٧).

دەفەرموێت: ((**وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُو مِنْهُ مِن قُرْآنٍ وَلاَ تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلاَّ كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُوداً إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاء وَلاَ أَصْغَرَ مِن ذَلِكَ وَلا أَكْبَرَ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ**)). واتە: "**تۆ لەحاڵێکدا نەبیت و قورئان نەخوێنیت و ئێوە هیچ کارێک نەکەن و کاتێ دەیکەن، ئێمە چاودێری ئێوەین. لە خودای تۆ لە ئاسمانەکان و زەوییدا هاوکێشی زەڕەیەک بزر نییە و نە بچووکتر هەیە و نە گەورەتر. مەگەر ئەوەی کە لە نووسراوێکی دیاردا بێت**". (سورەتی یونس، ئایەتی ٦١).

دەفەرموێت: ((وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ)). واتە: **"ئێمە مرۆڤمان خوڵقاند و دەزانین کە لە ناخی ئەودا چ وەسوەسەگەلێک هەیە و ئێمە لە دەمارەکان بەو نزیکترین"**. (سورەتی قاف ئایەتی ١٦).

نابێ ئەوە فەرامۆش بکەین کە وشەگەلی نزیکایەتی، تەماس و لە یەکتر جودا، تایبەتە بە بابەتە ماددیەکان و لەبارەی خوداوە راست نییە، ژیانی ئیلاهی هەروەک چۆن رۆح لەگەڵ جەستەدا لە پەیوەندیدایە لەگەڵ گشت جیهاندا لە پێوەندیدایە. رۆح نە لە ناو جەستەدایە و نە لە دەرەوەیدایە، نە لە نزیکی دایە و نە لەو جودایە. ئەمە ڕاستییەکی دیارە کە لەگەڵ هەر زەڕەیەک لە جەستەدا پەیوەندی هەیە. وێناکردنی ئەم تەماسە ئەستەمە مەگەر ئەوەی کە جۆرێک شوێن لەبەرچاو بگرین کە لەگەڵ نەرم و نیانیی رۆحدا بگونجێت، هەبوونی شوێن لە پەیوەندی لەگەڵ زاتی خودا نکولی لێ ناکرێت. تەنها ئەمە دەمێنێتەوە کە ئەم جۆرە شوێنەی کە دەتوانێت لەخۆگریی رەهابوونی خودا بێت بە وردی وەسف بکەین. ئێستا لەگەڵ سێ جۆرە شوێندا رووبەڕووین واتە شوێنی بابەتێکی ماددی، شوێنی بابەتە ناماددیەکان و شوێنی خودا. شوێنی بابەتە ماددیەکان خۆی دابەش دەبێتە سەر سێ جۆر: یەکەم شوێنی شتە گەورە ئاسمانییەکان کە لەم حاڵەتەدا پانتایی و بەرینی لە خۆگریی دەبێت. لەم شوێنەدا حەرەکە بە ئەسپایی روو دەدات و درێژەی هەیە، شتەکان شوێنە تایبەتەکانی خۆیان پڕ دەکەن و بۆ جێگۆڕکێ خاون. دووهەم شوێنی بابەتە نەرم و نیانەکان وەک هەواو دەنگ. شتەکان لەم شوێنەشدا بە نیسبەت یەکترەوە بەرهەڵستیان هەیە و حەرەکەیان بەپێی زەمەن دەکرێ هەڵبسەنگێنرێت. وادێتە بەرچاو کە

زەمەنی ئەوان لەگەڵ زەمەنی شتە گەورە ئاسمانییەکاندا جیاواز بێت. هەوای ناو لوولەیەک دەبێ بەتاڵ بکرێتەوە بۆ ئەوەی هەوایەکی تازە جێگەی بگرێتەوە. زەمەنی شەپۆلەکانی دەنگ لە قیاس لەگەڵ زەمەنی شتە گەورە ئاسمانییەکاندا هیچە. سێهەم شوێنی نوورە. نووری خۆر بێ راوەستان دەگاتە هەموو شوێنێکی زەوی. کەواتە زەمەن لە خێرایی نوور و دەنگدا دەگاتە سفر. دیارە کە شوێنی نوور لەگەڵ هەوا و دەنگدا جیاوازە، بەڵام هۆیەکی پتەوتر لەمەش هەیە، مۆمێک کە لە ژوورێکدا هەڵگیرساوە، نوور بێ ئەوەی کە لە جیاتی هەوا بێت خۆی بە هەموو لایەک دەپرژێت، ئەمە ئەوەمان پیشان دەدات کە شوێنی نوور نەرم و نیانترە لە شوێنی هەوا، لەبەرئەوەی کە شوێنی هەوا ناتوانێت بچێتە ناو شوێنی نوورەوە، نزیکایەتییەکی زۆر هەیە لە نێوان ئەم شوێنانەدا، لێکدانەوەی یەکێکیان لەویدی تەنها بە شیکاریی عەقڵی رەها و ئەزموونی رۆحانی و مەعنەوی مسۆگەر دەبێت، هۆی دیکە دەگەڕێتەوە بۆ هەبوونی دوو توخمی دژوازی یەکتر واتە ئاگر و ئاو لە ئاوی کوڵاتەدا کە بەپێی سرووشتی خۆیان دەبێ بچن بەگژ یەکتردا و نەتوانن پێکەوە هەڵکەن، بەڵام دەبینین کە لە یەک شوێندا یەکیانگرتووە. ئەم بابەتە ئاوەها دەکرێ لێکبدرێتەوە کە شوێنەکانی ئەم دوو توخمە هەرچەند لە یەکتر زۆر نزیکن، بەڵام لەیەکتر جودان. کاتێ کە توخمی مەودا بە تەواوەتی لە ناو نەچووە ئیمکانی خۆڕاگرتن لە بەرامبەر شوێنی نووردا بوونی نییە. نووری مۆمێک تەنها دەگاتە شوێنێکی دیاریکراو، بەڵام نووری سەد مۆم لە ژوورێکدا بێ ئەوەی کە جێگەی یەکتر بگرنەوە لێک ئاویتە دەبن.

**عەراقی** لە پاش لێکدانەوەی ئەم بابەتە سەبارەت بە شوێنی بابەتە ماددیەکان کە لە باری نەرمایییەوە دەرەجەی جیاوازییان هەیە، دەگاتە

لێکدانەوەیەکی کورت سەبارەت بە جۆرە سەرەکییەکانی شوێن کە بۆ پلەکان و جۆرە جیاوازەکانی بوونە ناماددیەکانە هەروەک فریشتەکان. توخمی مەودا لەم شوێنانەدا بە تەواوەتی نەسڕاوەتەوە. بوونە ناماددیەکان لە هەمانکاتدا کە توانایی ئەوەیان هەیە کە بە ئاسانی لە نێوان دیوارە بەردینەکانەوە تێپەڕبن، بەڵام بە گشتی ناتوانن حەرەکە بکەن. بە وتەی **عەراقی** ئەمە هۆیەکە بۆ ئەوەی کە بزانین لە باری رۆحانییەوە کامڵ نەبوون، رۆحی مرۆڤ لە سەرترین خاڵی قیاسی رزگاربوون لە لایەنی شوێندایە کە بە زاتی تایبەتی خۆیەوە نە لە سکووندایە و نە لە حەرەکەدا، بەتێپەڕبوون لە جۆرە بێ سنوورەکانی شوێن، دەگەینە شوێنی ئیلاهی کە بە شێوەیەکی رەها لە هەر جۆرە لایەنێک ئازادە و خاڵی بەیەکگەیشتنی گشت بابەتە بێ سنوورەکانە.

ئەو شتەی کە بە کورتی ئاماژەمان پێدا و پیشاندەری باوەڕی **عەراقی** سەبارەت بە شوێنەوە، ئەوەمان پیشان دەدات کە چۆن عارفێکی مسوڵمان و خاوەن فەرهەنگ ئەزموونی رۆحانی خۆی لە زەمەن و شوێن بە شێوازێکی عەقڵانی لە سەردەمێکدا هێنایە ئاراوە کە هیچ نیشانەیەک لە تیۆری و چەمکە بیرکاریی و فیزیا نوێکان نەبوو. **عەراقی** لەڕاستییدا هەوڵی ئەوەبوو کە بگاتە چەمکی شوێن وەک نمودێکی گەشەکردوو، وادیارە کە زەینی ئەو بە شێوەیەکی لێڵ لەگەڵ چەمکی شوێن وەک زنجیرەیەکی بێ سنوور لە مشتومڕدابووە. ئەو نەیدەتوانی لە گشت ئەو شتەی کە بە ئەندێشەی خۆی پێی گەیشتبوو، تێبگات. ئەمەش دوو هۆی هەبوو، یەکەم ئەوەی کە ئەو زانای بیرکاریی نەبوو و دووهەم ئەوەی کە بە نیسبەت ئەندێشەیەکی کەونی ئەرستۆیی کە جیهان بە راوەستاو دەزانێت، دەمارگرژیەکی زاتی هەبوو. ئەگەر **عەراقی** وردتر بیڕوانیایە ناخی زەمەن دەگەیشتە ئەم باوەڕە کە زەمەن

بنەڕەتیترە لە شوێن. نەک تەنها بابەتێکی مەجازی و ئیستعاری، هەر بەو جۆرەی کە **پرۆفیسۆر ئەلیکساندەر** دەڵێت زەمەن رۆحی شوێنە. وێنەیەک کە **عەراقی** لە پێوەندی خودا لەگەڵ عالەمدا هەیەتی لە پێوەندی رۆحی مرۆڤ و جەستەی دەچێت، لەهەمانکاتدا لە جیاتی ئەوەی کە لە رێگەی رەخنەگرتنەوە لە لایەنەکانی شوێن و زەمەن بگاتە ئەزموونی فەلسەفی ئەوە، تیۆریەکانی خۆی تەنها بەپێی ئەزموونی مەعنەوی خۆی دادەڕێژێت. ناکرێ شوێن و زەمەن بگۆڕین بە تەنها نوختەیەک و چرکەساتێکی بزرۆک. ئەو رێگە فەلسەفییەی کە دەگاتە خودا واتە رۆحی رەهای جیهان، وەک بناغەی نیهایی شوێن- زەمەن لە بەرامبەر ئەندێشەی زیندوودا رادەوەستێت.

بێ هیچ گومانێک **عەراقی** خەریک بوو لە رێگەیەکی دروستدا دەرۆیشت، بەڵام دەمارگرژیی ئەو بە نیسبەت باوەڕی **ئەرستۆ و** هاوکات نەبوونی لێکدانەوە و شیکاریی لەسەر بنەمای دەروونناسیی، بەری بە پێشکەوتنەکەی گرت. ئەو بەم تیۆریە کە زەمەنی ئیلاهی بە تەواوەتی بێ گۆڕانکارییە- باوەڕێک کە دیارە بەرهەم هاتووی لێکدانەوە و شیکاریی ناتەواوی ئەزموونی ناخودئاگایە- نەیدەتوانی پێوەندی نێوان زەمەنی ئیلاهی و زەمەنی تەسەلسوولی پەیدا بکات. بۆ ئەوەی لەم رێگەوە دەستی بگاتە بابەتی بە زات ئیسلامی ئافراندنی پەیوەست کە هەر ئەم عالەمە گەشەکردووە مانا دەکاتەوە. کەواتە ئەو وێنەیەی کە گشت شێوازەکانی بیری ئیسلامی لە عالەم هەیانە، بریتییە لە گەشەکردن و زاوزێکردن. ئەم روانگەیە بە باسەکانی **ئیبن خەلدوون** سەبارەت بە مێژوو و هەروەها **ئەبو عەلی مەسکویە** سەبارەت بە ژیان کە بە ژیانی بزۆکی دەزانێت، زیاتر پتەو دەبێت. قورئان مێژوو بە"رۆژەکانی خودا"ناو دەبات و بە سێهەمین سەرچاوەی مەعریفی

مرۆڤایەتی دەزانێت. یەکێک لە بنەڕەتیترین وانەکانی قورئان ئەوەیە کە دەڵێت نەتەوەکان بە کۆمەڵ دەکەونە بەر حوکم و بۆ هەڵەکانیان کە لە"ئێرە"و"ئێستا"دا کردوویانە سزا دەدرێن. قورئان بۆ سەلماندنی ئەم بابەتە بەردەوام بەڵگەی مێژوویی دەهێنێتەوە و خوێنەر ناچار دەکات تاکو لەناو ئەزموونی رابردوو و ئێستای مرۆڤەکاندا بیر بکەنەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ((وَ لَقَدْ أَرْسَلْنا مُوسي بِآياتِنا أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ الظُّلُماتِ إِلَي النُّورِ وَ ذَكِّرْهُمْ بِأَيَّامِ اللَّهِ إِنَّ في ذلِكَ لَآياتٍ لِكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ)). واتە: "**موسامان بە موعجیزەکانیەوە نارد کە قەومەکەت لە تاریکاییەوە بەرەو نوور ببە و رۆژەکانی خودایان وەبیر بهێنەوە کە لەوانەدا بۆ هەموو ئەوانەی سەبریان کرد و شوکوریان کرد، پەند و وانەیەکە**". (سورەتی ابراهیم ئایەتی ٥).

هەروەها دەفەرموێت: ((وَمِمَّنْ خَلَقْنَا أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِالْحَقِّ وَبِهِ يَعْدِلُونَ (*) وَالَّذِينَ كَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لاَ يَعْلَمُونَ (*) وَأُمْلِي لَهُمْ إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ)). واتە: "**لەو کەسانەی کە خوڵقاندمان جەماعەتێک هەن کە دەگەنە حەق و بە عەدالەت هەڵسوکەوت دەکەن. کەسانێک هەن کە ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ زانی. بە لێهاتووییەوە لە شوێنێکەوە کە پێی نەزانن، دەیانخەینە داوەوە. مۆڵەتیان پێ دەدەم کە تەگبیرەکەم زۆر پتەوە**". (سورەتی الاعراف ئایەتی ١٨١-١٨٣).

هەروەها دەفەرموێت: ((قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُواْ فِي الأَرْضِ فَانْظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذَّبِينَ)). واتە: "**بەر لە ئێوە زۆر ڕووداو هەبووە. لە زەوییدا بگەڕێن و ببینن کە ئاکامی ئەوانەی بە درۆیانزانی بە چ شێوەیەک بوو**". (سورەتی آل عمران ئایەتی ١٣٧).

هەروەها دەفەرموێت: ((إِن يَمْسَسْكُمْ قَـرْحٌ فَقَـدْ مَـسَّ الْقَـوْمَ قَـرْحٌ مِّثْلُـهُ وَتِلْـكَ الأَيَّـامُ نُـدَاوِلُهَا بَـيْنَ النَّـاسِ)). واتە: **"ئـەگـەر برینێک گـەیشتۆتە ئێـوە ئـەو گروپەش برینێکی وەهایان پێ گەیشتووە، ئەم ڕۆژانە لە نێوان خەڵکدا ئاڵوگۆڕ دەکەین..."**. (سورەتی ال عمران ئایەتی ١٤٠).

هەروەهـا دەفەرموێـت: ((وَلِكُـلِّ أُمَّـةٍ أَجَـلٌ)). واتە: **"هــەر ئومــەتێک ماوەیەکی دیاریکراوی هەیە..."**. (سورەتی الاعراف، ئایەتی ٣٤).

ئـەم ئایـەتانـەی دوایـی وێنـەیـەکی ڕۆشـنە لـە گشتاندنێکی مێژوویـی تایبـەت کـە بـە ئاوێتـەیـەکی بـە نـاوەرۆکـەوە، ئیمکانی ئـەوەمـان پێدەدات سـەبارەت بە ژیانی کۆمەڵە مرۆییەکان وەک ئەندامـەکانی یـەک جـەسـتە موتالای زانستییمان هەبێت. کەواتـە ئـەگـەربێتو وابزانین کـە لـە قورئانـدا هـیچ بـاوەڕ و ڕوانینێـک سـەبـارەت بـە مێـژوو بـاس نـەکـراوە تووشـی هەڵەیەکی گەورە بووین. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە بـەشـیکی زۆری ڕۆحـی زاڵ بـەسـەر پێشـەکـی مێژووی **ئیـبن خەلـدوون** لـە قورئانـەوە ئیلهـامی گرتووە. ئەو تەنانـەت حوکمـەکانی سـەبارەت بە ئـەخلاق و سرووشـتی مرۆڤ بە رادەیەکی زۆر لە قورئانەوە وەریگرتووە. وێنـەیـەکی بـاش کـە لەم بارەوە دەکرێ بـاس بکرێت بیرورِا دەربڕینـی تێر و تـەسـەلی ئـەوە سـەبارەت بە خوڵق و خـوی عـەرەبـە دەشـتـەکیـەکان. گشت ئـەو باسـانە تـەنها شـێوازێکی تێر و تـەسـەلکراوی دوو ئایـەتـی قورئانـە کـە لێرەدا دەیخەمە بەرچاو:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((**الْأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا وَأَجْـدَرُ أَلَّـا يَعْلَمُـوا حُدُودَ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ، وَمِنَ الْـأَعْرَابِ مَـنْ يَتَّخِـذُ مَـا يُنْفِقُ مَغْرَمًا وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ الدَّوَائِرَ عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ** )). واتە: **"عەرەبە دەشتەکیەکان لەمەڕ خودانەناسین و دووڕوویی بێ ڕەزاترن و**

**بۆ سنوور پێ نەزانیی هەرچی خودا بۆ پێغەمبەری ناردووە کۆڵی ترن. خودا زانای کارزانە، هەندێک لەو دەشتەکیانە هەرچی بیدەن وایدەزانن کە خاوەیان لێ سەندراوە، لێو دەخەوفتێن کە بەڵایەکتان بەسەر بێ. بەڵا هەر بەسەر خۆیان بێت. خودا بیسەر و زانایە**". (سورەتی التوبە ئایەتی ٩٧-٩٨).

سەرنجی قورئان بە مێژوو وەک سەرچاوەی زانست و مەعریفەی مرۆیی زیاتر لەوەیە کە تەنها ئاماژەیەکی کاتی هەبێت بۆ گشتیەتە مێژووییەکان. قورئان یەکێک لە بنەڕەتیترین بنەماکانی رەخنەی مێژوویی خستۆتە بەردەست ئێمە. دروستی لە تۆمارکردنی واقیعەکان کە پێکهێنەری ماددەی مێژوویین مەرجی پێویستە بۆ مێژووی زانستی. هەبوونی ئاگایی دروست لە واقیعەکان لە ئاکامدا پەیوەندی بە کەسانێکەوە هەیە کە ئەوانە دەگێڕنەوە. کەواتە یەکەمین پلەی رەخنەی مێژوویی تایبەتمەندی ئەخلاقی تاکی رێپۆرتکارە و ئەمە هۆکارێکی گرنگە بۆ هەڵسەنگاندن و داوەریەک کە لە باس و رەوایەتەکانی ئەو دەکرێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ((يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَأٍ فَتَبَيَّنُوا)). واتە: "**ئەی کەسانێک کە ئیماندارن ئەگەرهاتو خراپەکارێک هەواڵیکی بۆتان هێنا لێی بکۆڵنەوە...**". (سورەتی الحجرات، ئایەتی ٦).

لەم ئایەتەدا ڕێسا و بنەمایەک بۆ گێڕانەوەی حەدیسی پێغەمبەر دانراوە کە بەپێی ئەوە، یاساکانی رەخنەی مێژوویی بەرەبەرە کامڵ بوون. گەشەی درکی مێژوویی لە ئیسلامدا بابەتێکی دڵخوازە. پێویستبوونی لیکۆڵینەوە لە حەدیسە دروستەکانی پێغەمبەر و مەیلی زۆر بۆ پێکهێنانی کانیاوی هەمیشە پڕ لە ئاوی ئیلهام بۆ جیلەکانی دوایی هەموو ئەوانە بە گشتی بوونە ئامێرێک بۆ سازبوونی پیاوانێکی

ناودار. وەک **ئیبن ئیسحاق، تەبەری و مەسعوودی**. مێژوو بە واتای فەن و هونەرێک کە خەیاڵی خوێنەر بەربڵاوتر دەکات، تەنها یەک قۆناغە لە کامڵبوونی مێژووی رەسەنی زانستی. ئیمکانی لێکۆڵینەوەی زانستی لە مێژوودا بەواتای هەبوونی ئەم خاڵانەیە: ئامادەبوونی ئەزموونێکی بەربڵاو، گەشەکردن و باڵغبوونی عەقڵی پراکتیکی و لە ئاکامدا دەست گەیشتن بە ئەندێشە بنەڕەتیەکان سەبارەت بە چییەتی ژیان و زەمەنە. ئەم بابەتانە بە گشتی دابەش دەبنە سەر دوو جۆر و بناغەی هەردووکیان لەسەر وانەکانی قورئان دامەزراوە.

١- یەکبوونی سەرچاوە و بنەڕەتی مرۆڤ. قورئان دەڵێت: "... **ئێوەمان لە یەک جەستەوە خوڵقاند...**".

ئەگەر ژیان بەشێوەی یەکەیەکی کۆکراوە لەبەرچاو بگرین پێشکەوتنەکەی ئارامە و گەشەکردن و پێشەنگبوونی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کام قەوم یان نەتەوە هاتۆتە نێو گەڕیانی سەرەکی ڕووداوەکانی جیهانەوە. وەها دەرفەتێک بۆ ئیسلام رەخسی کە نە پەرەسەندنی خێرای ئیمپراتۆریەتەکەی مسۆگەر بوو. بێ هیچ گومانێک مەسیحیەت زۆر لە پێش ئیسلامەوە پەیامی یەکسانی و هاوسان خوازیی هێنا بۆ مرۆڤایەتی، بەڵام رۆمی مەسیحی نەیتوانی لە چەمکی کامڵی ئەم ئەندێشەیە تێبگات کە مرۆڤەکان هەموو ئەندامەکانی یەک جەستەن. ئەم وتەیە بە تەواوەتی راستە کە:"هیچ نووسەرێکی مەسیحی و هەڵبەت دیارە کە هیچ نووسەرێک لە ئیمپراتووریەتی رۆما نەیتوانیوە سەبارەت بە یەکبوونی سەرچاوەی مرۆڤ بە شتیکی زیاتر لە چەمکێکی رەها و گشتی بگات". وا نایەتە بەرچاو کە ئەم ئەندێشەیە لە دوای سەردەمی رۆمی کەون ئاراوە وەها رەگ و ریشەیەکی لە ئەورووپادا داکوتابێت. لە لایەکیترەوە گەشەکردنی ناسیۆنالیزمی ناوچەیی بە

جەختکردن لەسەر ئەو شتەی کە تایبەتمەندی ناسیۆنالیزمە، مەبەستی زیاتر لەناوبردنی توخمی مرۆیی بەربڵاو لەناو هونەر و ئەدەبیاتی ئەوروپادا بووە. ئەم ئەندێشەیە لە ئیسلامدا بە تەواوەتی شێوازێکیتری هەبووە واتە نە چەمکێکی فەلسەفی بووە نە خەونێکی شاعیرانە. ئامانجی ئیسلام وەک راپەرینێکی کۆمەڵایەتی ئەوە بوو کە ئەندێشەی یەکبوونی سەرچاوەی مرۆڤ وەک هۆکارێکی چالاک و زیندوو لەناو ژیانی موسوڵماناندا بهێنێتە ئاراوە و بەم شێوەیە ئەم باوەڕە بە ئارامی و هێمنایەتییەوە بگەیەنێتە قازانجێکی باشتر.

٢- هەستێکی زۆر بەهێز بە نیسبەت واقیعی زەمەن و وێنەی ژیان وەک حەرەکەیەکی پەیوست لەناو زەمەندا. هەر ئەم چۆنیەتی وێناکردنی ژیان و زەمەنە کە خاڵی سەرەکی و جێی سەرنج لەناو زەینی ئیبن خەلدوون بە نیسبەت مێژووەوە ساز دەکات. ئەمەش هۆیەکە بۆ دروستبوونی ئەو ستایشتە کە **فلێینت** لەوی دەکات و دەڵێت: "**ئەفلاتوون، ئەرەستۆ و ئاگۆستین** هاوتەرازی ئەو نەبوون و ئەوانیتر تەنانەت ئەوەندە بایەخیان نەبوو کە ناویان لە لای ئەوەوە بێت". مەبەستم لەو بابەتەی لێرەدا ئاماژەم پێکرد ئەوە نییە کە لە بنەڕەتەوە ئەندێشەی **ئیبن خەلدوون** بەرمە ژێر پرسیارەوە. کاکڵی باسەکەم ئەوەیە کە بە سەرنجدان بە رێگە و رەوتێک کە فەرهەنگی ئیسلامی خۆی ئاشکرای کردبوو، تەنها موسوڵمانێک دەیتوانی مێژوو وەک حەرەکەیەکی پەیوەستی کۆمەڵایەتی بخاتە بەرباس کە لەناو زەمەندا گەڕیانی هەیە. خاڵێکی جێی سەرنج لەم روانگەیەدا بە نیسبەت مێژوو، رێگەیەکە کە **ئیبن خەلدوون** لەوەدا پرۆسەی گۆڕانکاریی دەخاتە بەرچاو. گرنگایەتی ئەم ئیماژە لە رادە و قیاسدا ناگونجێت. درکی ئەو لە مێژوو وەک گەڕیانێکی پەیوەست لە زەمەندا ئەوە بە بابەتێکی ڕەسەن

و داهێنەر وەسف دەکات نەک حەرەکە و گەڕیانێک کە ڕێگەکەی لەوە پێش داڕێژرابێت. ئیبن خەلدوون بیرمەندی جیهانی ما بعد الطبیعە نەبوو و دوژمنایەتی دەکرد، بەڵام ئەگەر حەق بڵێین بەهۆی ئەو وێنەیەی کە لە زەمەن هەیبوو، دەبێ ئەو بە فەرزتر بزانین بەرامبەر بە **بێرێگسۆن**. بەرلەوە سەبارەت بە پێشاهەنگە فیکرییەکانی ئەم شێوازە درک کردنە لە مێژووی فەرهەنگی ئیسلامییدا دوواووم. ڕوانگەی قورئان بە نیسبەت بەدواداهاتنی شەو و ڕۆژ وەک سومبۆلێک لە حەقیقەتی نیهایی کە"هەر ڕۆژەو خەریکی کارێکە..."خوازیارییەکی ما بعد الطبیعەی ئیسلامی هەیە لە وێناکردنی زەمەن بە شێوازێکی ڕاستەقینە. باوەڕی **ئیبن عەلی مەسکویە** سەبارەت بە ژیان کە ئەوە بە حەرەکەی کامڵ وەسف دەکات و لە ئاکامدا ڕوناگەی حاشاهەڵنەگری **ئەبو ڕەیحان بیروونی** سەبارەت بە چەمکی سرووشت وەک پرۆسەیەکی گۆڕانکاریی و بوون، ئەمانە گشتی لەو خاڵانەیە کە سەرجەم میراتی فیکریی **ئیبن خەلدوون** پێکدەهێنێت. خاڵی بەهێزیی لەوەدایە کە ڕۆحی ڕاپەڕینی فەرهەنگیی بە باشی درککرد. ئەو ڕاپەڕینەی کە خۆشی یەکێک بوو لەو کەسانەی درەوشاوەی پەروەردەکراو لەوێدا. پاشان ئەم ڕۆحەی بە شێوەیەکی بەدیسیپلین ئاراستە کرد، لە بەرهەمەکانیدا کە پیشاندەری بلیمەتبوونیەتی، ڕۆحی دژ بە فیکری یۆنانی قورئان دەگاتە سەرکەوتنی کۆتایی، لەبەرئەوەی کە زەمەن لای یۆنانییەکان تەنها دوو حاڵەتی هەبوو، یان بە ناواقیعییان دەزانی هەروەک چۆن **ئەفلاتوون و زنون** باسیان لێکردبوو، یان بەپێی وتەی **هراکلیتووس** و ڕەواقییەکان دەیانوت کە لەناو بازنەیەکدا دەجووڵێتەوە.

ئەو پێوەرەی کە بەوە قۆناغەکانی پێشکەوتنی حەرەکەی داهێنەرانە هەڵدەسەنگێنرێت، جا هەرچی کە هەبێت، ئەگەربێتو خودی حەرەکە

وەک بازنەیەک لەبەرچاو بگرێت ئیتر هیچ داهێنەرایەتیەکی نییە. دەوری هەرمانیی خولْقاندنی هەمیشەیی نییە بەڵکو دووپاتکردنەوەی هەمیشەییە. ئێستا لە بارودۆخیکداین کە دەتوانین باش لە چەمکی دروستی شۆڕشکردنی فیکریی ئیسلام دژ بە فەلسەفەی یۆنانی تێبگەین. ئەم ڕاستییە کە شۆڕشی فیکریی بۆ پاراستنی بەرژەوەندی کەلامیی رەها سەری هەڵدا، ئەوەمان پیشان دەدات کە رۆحی دژ بە فیکری یۆنانی قورئان هەرچەند کە بە حەز و تاسەوە دەستی کرد بە لێکدانەوەی ئەحکامی ئیسلام لە ژێر تیشکی ئەندێشەی یۆنانییدا، بەڵام خۆی ئاشکرا کرد. ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە بناغەی ئەو خراپ تێگەیشتنە مەترسییدارە بروخێنین کە کتێبی پڕ خوێنەری **ئێشپێنگلێر** بە ناوی"نوشستیی رۆژئاوا"هۆی پەیدابوونی بوو. دوو بەش لە کتێبەکەی تەرخانکراوە بۆ فەرهەنگی ئیسلامی کە دەزانین گەورەترین بەشی هەیە لە مێژووی فەرهەنگیی ئاسیادا. ئەم دوو بەشە لەسەر بناغەی فیکرێکی زۆر هەڵەوە دامەزراوە سەبارەت بەو زاتی ئیسلام کە خۆی راپەڕینێکی ئایینی و دەستپێکی چالاکی فەرهەنگییە. کۆکراوەی باوەڕی اشنگلر ئاوەهایە کە هەر فەرهەنگێک رێکخراوی تایبەتی خۆی هەیە و لەگەڵ دیکەی فەرهەنگەکاندا کە درەنگتر یان زیاتر پێک هاتوون هیچ خاڵیکی لێک نزیکبوونی نییە. لەڕاستییدا وتەکەی بەومانایە کە هەر فەرهەنگێک بۆ روانین بۆ بابەت و گرفتە جیاوازەکان شێوازی تایبەتی خۆی هەیە کە بە تەواوەتی دوور لەدەستە بۆ ئەو کەسانەی کە خاوەنی فەرهەنگێکیترن. ئەو بە حەز و تاسەیەکەوە کە بۆ سەلماندنی روانگەکانی خۆی هەیەتی ریزێک ڕاستی لێکدانەوەی وەهای هەیە کە بە

ڕەواڵەت پەسند دەکرێت بۆ ئەوەی کە نیشان بدات ڕۆحی فەرهەنگی ئەوروپایی یەکسەرە دژ بە فیکری یۆنانییە. بە پێی وتەی ئەو ئەم ڕۆحی دژ بە فیکریی یۆنانی لە فەرهەنگی ئیسلامییەوە سەرچاوەی نەگرتووە بەڵکوو لە باری ڕۆحی و تایبەتمەندی زاتی، بە تەواوەتی"مجوسی"یە و بە تەواوەتی ریشەی لە ناو بلیمەتبوونی تایبەتی ئەوروپاییەکاندایە. بە باوەڕی من روانگەی **ئێشپێنگلێر** سەبارەت بە ڕۆحی فەرهەنگی نوێ زۆر ڕاستە، بەڵام هەوڵمداوە تاکو لەم ریزە لێدواننانەدا ئەوە پیشان بدەم کە ڕۆحی دژ بە فیکری یۆنانی لە دنیای ئەمڕۆدا لە سەرپێچی فیکریی ئیسلامەوە دژ بە ئەندێشەی یۆنانییەوە هاتووە، دیارە کە وەها روانگەیەک بۆ **ئێشپێنگلێر** جێی متمانە بێت لەبەرئەوەی کە ئەگەر بکرێ ئەوە بسەلمێنین کە ڕۆحی دژ بە فیکری یۆنانی فەرهەنگە تازەکە، بە هۆی ئیلهامگرتن لەو فەرهەنگەوەیە کە بە ئاشکرا پێشڕەوی ئەوە بووە، گشت باسەکانی **ئێشپێنگلێر** تێک دەڕووخێت کە سەبارەت بەوە کردوویەتی کە فەرهەنگەکان لە گەشانەوە و پێشکەوتنیاندا لە یەکتر سەربەخۆن. من بەداخەوەم کە حەزی **ئێشپێنگلێر** بۆ سەلماندنی ئەم روانگەیە بۆتە هۆی لادانی فیکریی ئەو لە ئیسلام وەک ڕاپەرینێکی فەرهەنگی.

مەبەستی **ئێشپێنگلێر** لە گێڕانەوەی"فەرهەنگی مجوسی"فەرهەنگێکی گشتگیرە. واتە ئەو شتەی کە ئەو بە گرووپی ئایینە مجوسییە کان ناوی دەبات و ئەوانە بەم ناوانە دەزانێت: یەهوودیەت، ئایینی کلدانییە کەون ئاراکان، مەسیحییەتی سەرەتایی، ئایینی زەردەشتی و ئیسلام. نکولی لەوە ناکەم کە توێکڵێک لە فەرهەنگی مجوسی بەسەر ئیسلامدا ڕواوە.

مەبەستی سەرەکی من لەم لێدوانانەدا لە ڕاستییدا ئەوە بووە کە حیجابی مجوسی لە ڕوخساری فەرهەنگی ئیسلامی لابەرم، واتە ئەو شتەی کە بە باوەری من بووە هۆی لە ڕێ بەدەر چوونی **ئێشپێنگلێر**. سەرنج نەدانی ئەو بە ئەندێشەیەک کە ئیسلام سەبارەت بە زەمەن هەیەتی، هەروەها بێئاگایی ئەو لە ڕێگەیەک کە لەوێدا"من"وەک ناوەندی ئازادی ئەزموونکردن لە تەجرەبەی ئاییینی ئیسلامدا خۆی دەنوێنێت و ئەمە تەنها دەبێتە هۆی ئەسەف و مەخابن. ئەو لە جیاتی ئەوەی کە لە کارەکەیدا بەهرە لە ڕۆشنایی مێژووی ئەندێشە و ئەزموونی ئیسلامی وەربگرێت بەلایەوە باشترە ئەگەر روانگە و باوەڕی خۆی سەبارەت بە سەرەتا و ئەنجامی زەمەن لەسەر بناغەی باوەڕە باوەکان دابمەزرێنێت. لە عەقڵ بەدوورە کە کەسێکی ئاوەها بە پلەیەکی بەرزی زانستییەوە بۆ ئەوەی کە ئیسلام وەک ئاوێتەیەک لە جەبر خوازیی بناسێنێت بێت و پشتیوانی خۆی لە مەتەڵ و لێکدانەوە رۆژهەلاتیەکان وەربگرێت. وەک: "ژێرخانی تاریکی زەمەن" یان "هەر شتیک سەرەتا و ئەنجامیکی هەیە"!

من لەم ریزە لێدوانانەمدا سەبارەت بە چەمکی زەمەن و هەروەها گەشە و سەرکەوتنی لە ئیسلامداو سەبارەت بە منی مرۆڤ وەک هێزیکی ئازاد بە قەدەر شانی خۆم دواووم. دیارە کە هەڵسەنگاندنی گشت لایەنانەی ئێشپێنگلێر سەبارەت بە ئیسلام و فەرهەنگێک کە لە دەروونیەوە سەرهەڵدەدات داستانێکە کە هەفتا من کاغەزی پێویستە. با ئەم باسەی دیکەش بە کورتی بهێنمە ئاراوە زیادە لە گوتارە پێشووەکانم، **ئێشپێنگلێر** دەڵێت:

"راهێنانە پێغەمبەرانەکان ڕەگ و ریشەی لە فەرهەنگی مجوسییدایە. یەک خودا بوونی هەیە بە ناوگەلی جیاوازەوە وەک یهوە، ئەهوورامەزدا، مەردووک و بعل کە سەرچاوەی خێرە. ئەوانی دیکە ئەزدان و خواوەندگەلێکن کە یان هیچیان پێ ناکرێت یان پەیوەست بە شەڕن. هاوڕێی لەگەڵ ئەم ڕوانگەیە هیوا و ئومێد و چاوەڕوانی بۆ مەسیح و ڕزگاریدەرێک لەئارادایە. مژدەی هاتنی ئەو کەسە لە کتێبی اشعیای نەبییدا بە ئاشکرا دراوە. ئەم مژدەیە لە سەرانسەری سەدەکانی دواییدا لە ژێر گوشاری پێویستییەکی دەروونی لە هەموو شوێنێکدا بڵاوەی کرد. ئەمە هەمان ئەندێشەی بنەرەتی ئایینی مجووسە. لەبەرئەوەی کە چەمکە دژوازە مێژووییەکانی نێوان خێر و شەڕ، دەسەڵاتی هێزی شەڕ و سەردەمی ناوەندی و لە ئاکامدا سەرکەوتنی هێزی خێر لە ڕۆژی حەکەمدا، هەموو ئەوانەی لەخۆدا کۆکردۆتەوە".

ئەگەر مەبەست لەم وتەیە لە ڕاهێنانە پێغەمبەرانەکاندا ئەوە بێت کە ئەم ڕوانگەیە ئیسلامیش لەخۆبگرێت، دیارە کە لە تێگەیشتنێکی هەڵەوە سەرچاوەی گرتووە. خاڵێک کە دەبێ ئاماژەی پێ بکرێت ئەوەیە کە فەرهەنگی مجووسی پابەندبوو بە بوونی خواوەندگەلێکی درۆیین کە پەرەستشت نەدەکران. ئیسلام هەبوونی وەها خواوەندگەلێک قبووڵ ناکات. ئێشپێنگلێر لە پەیوەندی لەگەڵ ئەم واتایەدا لە تێگەیشتن لە بایەخی فەرهەنگی ئەندێشەی خەتمبوونی پێغەمبەر لە ئیسلامدا بێ توانایە. گومانی تێدا نییە کە لایەنێکی گرنگ لە فەرهەنگی مجووسی سەرنجی بەردەوام و هەمیشەییەتی بۆ بابەتی چاوەڕوانی. بۆ وێنە دەکرێ ئاماژە بە دەرکەوتنی کوڕە لەدایک نەبووەکانی زەردەشت و

دەرکەوتنی مەسیح یان ئێنجیلی چوارەم بکەین، تا ئەم شوێنە من ئەو ڕێگەیەم پیشان داوە کە توێژەرە ئیسلامییەکان دەبێ واتای خەتمی پێغەمبەریی تێدا بدۆزنەوە، هەروەها بابەتی چاوەڕوانی لە ڕوانگەی مجووسییەوە دەکرێت وەک دەرمانێکی دەروونی ببینرێت بۆ چاوەڕوانی هەمیشەیی کە خۆی ڕوانینێکی هەڵەی لە مێژوو دەداتە دەست. بە باوەڕی من ئیبن خەلدوون ئەم باسەی لە ڕوانگەی ڕۆحی مێژووییە خۆیەوە بە شێوازێکی کامڵ خستۆتە بەر ڕەخنە. لە ئاکامدا ستراکچێری ئەم ئەندێشەی لانی کەم لە باری کاریگەریەتی دەروونییەوە تێک شکاند کە ڕوانگەیەکی هاوبەشی لە ئیسلامدا هەیە. ڕوانگەیەک کە بنچینەکەی لە مجووسیەتەوە دێت و لە ژێر گوشاری فیکری مجووسییدا جارێکی دیکە لە ئیسلامدا دەرکەوت.

## بنەڕەتی حەرەکە لە چوارچێوەی ئیسلامدا

ئیسلام وەک ڕاپەرینێکی فەرهەنگی نکولی لە باوەڕگەلی قەدیمی چەقبەستوو سەبارەت بە جیهان دەکات و دەگاتە ڕوانگەیەکی گەشەکردوو و زیندوو. وەک دەزگایەکی سۆزدارانە و یەکێتی خوڵقێن. بایەخی تاکەکان هەروا کە هەن لە بەرچاو دەگرێت و هەروەها حاشا دەکات لە پەیوەندی لەسەر بنەمای خێزان و خوێن وەک سەرەتایەک بۆ یەکگرتنی مرۆڤەکان. پەیوەندی لەسەر بنەمای خوێن واتە پەیوەست بوون. گەڕان بەمەبەستی دۆزینەوەی بنەمایەکی دەروونناسانەی رەها بۆ یەکگرتنی مرۆڤەکان کاتێ دەگاتە ئەنجام کە لەوە تێبگەین کە ژیانی مرۆیی خۆی لە بنەڕەتەوە رۆحانییە، وەها درکێک دەبێتە هۆی ئەوە کە کۆمەڵێک ڕاستی تازە لە مرۆڤدا دروست ببێت کە بۆ زیندووڕاگرتنیان هیچ پێویست بە تەشریفات ناکات و ئەم ئیمکانە بۆ مرۆڤ دەخوڵقێنێت کە خۆی لە داوی مادديات بڕسکێنێت.

**کۆنستانتین** هەوڵیدا تاکو مەسیحیەت کە لە سەرەتاوە لە قەوارەی پاکیزەخوازیی دەرکەوتبوو، وەک دەزگایەکی یەکێتی خوڵقین ساز بکاتەوە. شکستهێنانی ئەو بۆ وەها دەزگایەک بووە هۆی ئەوەی کە ئیمپراتۆر یولیانووس دیسانەوە بگەڕێتەوە بۆ خوداکانی رۆمی کەون ئارا و هەوڵی ئەوە بدات کە ئەوانە بە لێکدانەوەگەلێکی فەیلەسووفانە بهێنێتەوە ئارا. یەکێک لە مێژوونووسە نوێکان کە کارەکەی لە بواری

مێژووی شارستانیەتدایە، بارودۆخی جیهانی پێشکەوتووی نزیک بە ئەو کاتەی کە ئیسلام لە پانتای مێژوودا دەرکەوت، ئاوەها وەسف دەکات:

"وادێتە بەرچاو کە ئەو شارستانیەتە مەزنەی کە چوار هەزار ساڵی خایاند هەتا دروستکرا، کەوتە بەر لێکهەڵوەشان، مرۆڤ حەزی لەوە دەکرد کە بگەڕێتەوە بۆ دەورانی وەحش کە هۆز و تیرە و تایفەکان بەردەوام لەشەڕدابوون و کەس ئاگای لە دیسیپلین و یاسا نەبوو، دابونەریتی کۆنی عەشیرەتەکان کاریگەریەتییان نەما و بەناچار شێوازە رەسمی و تەشریفییەکانی قەدیم ئیتر باوی نەما، ئەو رەسمە نوێیانەی کە مەسیحیەت سازیکردن لەجیاتی ئەوەی کە یەکێتی و رێکی ساز بکات، بووە هۆی دژوازی و ئاژاوە. رۆژگارێک بوو کە لێوریژی چارەڕەشی بوو، شارستانیەت وەک درەختێکی پتەو کە لق و پۆکانی بەسەر جیهانەوە پرژاندبوو، هەروەها شاخەکانی میوەی زێڕینی زانست و ئەدەب و هونەری گرتبوو، وەهای لێهات کە ئیتر توخمی پاکی و حورمەت، ژیان و توانای تازەی پێ نەدەدا و بوونە لەرزۆکەکەی گرتەوە، لە ناخەوە داڕزا و هیچی وای نەمابوو کە تۆفانی شەڕەکان ئەوەی لە بێخ و بنەوە هەڵکەند، بنەماکانی تەنها بە رشتەی سوننەت و یاسا کەونەکان بە یەکترەوە بەسترابوو، هەرکات لەوە دەچوو کە تیکبشکێت، ئایا فەرهەنگێکی عاتفی لەئارادا بوو کە توانای ئەوەی هەبێت کە مرۆڤەکان سەرلەنوێ یەک بخاتەوە و شارستانیەت لەو بارودۆخە رزگار بکات؟ ئەم فەرهەنگە بە ناچار دەبووا شتێکی تازە بێت، لەبەرئەوەی کە دابونەریت و یاسە کەونەکان مردبوون و کاریگەریەتییان لەدەستدابوو، بۆ پێکهێنانی فەرهەنگێکی لەو شێوەیە پێویست بە تێپەڕینی سەدەکان بوو".

نووسـەر پاشـان بـاس لـەوە دەکـات کـە جیهـان لـە چـاوەڕوانـی فەرهەنگێکی تازە دانیشتبوو کە هەم جێگەی فەرهـەنگی زاڵ بگرێتـەوە و هـەم جێگـەی دەزگایـەک کـە یـەکێتـی نێـوان خـەڵـک لـەسـەر بنـەمـای وابەستەیی خوێنی دادەنا. ئەو پاشان دەڵێت کە سەیرە وەها فەرهەنگێک دروست لەکاتێکدا کە مرۆڤ زۆرترین پێویستی پێی بوو لە حیجازەوە سـەری هـەڵـدا، لـەم دیـاردەدا شـتێکی سـەیـر لـەئارادانییـە، ژیـان پێویستییەکانی خۆی بە موکاشەفە دەستەبەر دەکات و بە یارمەتی ئەوە ڕێگەی حەرەکەی خۆی لە ساتە قەیراناوییەکاندا دیاری دەکات، ئەمە هەمان شتە کە لە زمانی ئاییندا پێی دەوترێت وەحی، ئاساییە ئەگەر وا بیهێنینە بەرچاو کە ئیسلام دەبووا بڵێسەی خودئاگایی خەڵکێکی سادە هەڵبگیرسێنێت کە لە ژێر کاریگەریەتی هیچکام لە فەرهەنگە کەونەکاندا نەبوون. پێگەی جوگرافیایشیان وەها بوو کە لە نوختەی جەمسەری سێ کیشوەردا بوون. فەرهەنگی تازە هەوێنی یەکگرتن لە جیهاندا بە توخمی "توحید" دەزانێت. ئیسلام بە ناوی حکومەتێکەوە تەنها ئامێرێکی پراکتیکییە کە دەتوانێت ئەم بنەمایە وەک هۆکارێکی زیندوو لەناو ژیانی فیکریی و سۆزدارانەی مرۆڤدا بخولقێنێت، ئیسلام خوازیاری ئەوەیە کە مرۆڤ بەرامبەر بە خودا بەئەمەک بێت نەک ئەوەی بۆ دەسەلاتە زاڵمەکان تەسلیم بێت، لەبەرئەوەی کە خودا دوایین پلەی رۆحانی ژیانی هەر کەسێکە بەئەمەکبوون بەرامبەر بەو لەڕاستییدا بە واتای وەفای مرۆڤە بە نیسبەت ئامانجەکانی خۆیەوە، کۆمەڵگەیەک کە لە سەر بنەمای وەهاوێنەیەک دامەزرابێت دەبێ ژیانی خۆی بە مەقوولاتە هەرمانییەکانەوە بگۆڕێت و سازگاری بکات، بۆ ڕێکخستنی ژیانی کۆیی خۆی خاوەنی پرەنسیپی هەمیشەیی بێت. هەر زەمەنێک جێگەیەکی پتەوی هەیە لە جیهانێکدا کە هەرگیز لەسەر یەک حاڵ نییە، ئەگەر وای

بهێنینه بەرچاو کە بنەما هەمیشەییەکان بە هۆی هەرمانیی بوونیانەوە دژ بە هەر جۆرە گۆڕان و جۆراوجۆریەکن کە بە وتەی قورئان لە نیشانەکان و ئایەتەکانی خودایە، هەربۆیە دەبێتە هۆی نەگۆڕی و بێ حەرەکەیی هەر شتێک کە لە زاتی خۆیدا بگۆڕە و دەجوڵێتەوە.

بێ ئەنجامی ئەوروپا لە زانستە سیاسیی و کۆمەڵایەتیەکاندا نیشانەی بنەمای یەکەمە و بێ حەرەکە و جووڵەیی ئیسلامیش بۆ ماوەی ٥٠٠ ساڵ بنەمای دووهەم دەخاتە بەرچاو. کەواتە بنەمای حەرەکە لە ناخی ئیسلامدا چییە؟ ئەم بنەمایە هەمان شتە کە بە"ئیجتهاد"دەناسرێت.

مانای ئەم وشەیە واتە هەوڵ و کۆشش، لە زاراوەی فیقهی ئیسلامییدا کۆشش بۆ تێگەیشتن لە بابەتە شەرعیەکان دەگەڕێتەوە بۆ قیاس لە کەلامی الله و حەدیسەکاندا. وەها کە حوکمێکی سەربەخۆ بۆ بابەت و گرفتێکی شەرعی سەربگرێت. بە باوەڕی من ئەو ئەندێشەیە رەگ و ریشەی لەم ئایەتە گرنگەی قورئاندایە: ((وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا)). واتە: "**ئەو کەسانەی کە لە رێگەی ئێمەدا جیهاد دەکەن بۆ رێگەکانی خۆمان رێنموونییان دەکەین.**."(سورەتی العنکبوت، ئایەتی ٦٩).

پێناسەی بنبڕی ئەم زاراوەیە لە حەدیسێک لە پێغەمبەر دەدۆزرێتەوە، لە پێغەمبەر دەگێڕنەوە کە کاتێ **مەعازی** دانا بۆ پۆستی حکومەتی یەمەن لەوی پرسی: ئەو گیروگرفتانەی کە بۆ تۆ دێنە پێش چۆنیان چارەسەر دەکەی؟ **مەعاز** وتی: داوەری من بە پێی کلام الله دەبێت. پێغەمبەر پرسی: ئەگەر لە کەلام الله دا نیشانەیەک نەدۆزیەوە بۆ رێنمونیکردنی خۆت، چ دەکەیت؟ **مەعاز** وتی: ئەوکاتە بەپێی سوننەتی رەسوولی خودا کار دەکەم. پێغەمبەر پرسی: وای دابنێ کە سوننەتەکانیش بەس نەبوو، ئەو کات چ دەکەی؟ **مەعاز** وەڵامی دایەوە: ئەوکاتەیە کە ئیجتهاد دەکەم و حوکمێک لە خۆمەوە دادەڕێژم.

ئەو کەسەی کە لە مێژووی ئیسلامدا لێکۆڵینەوەی کردبێت باش ئاگادارە کە بە گەشەکردنی سیاسی ئایینی ئیسلام، هەبوونی ئەندێشەی ئیسلامی، ئەندێشەی فیقهی رێک وەک پێویستییەکی رەها خۆی پیشان داوە، شارەزایانی بابەتە فیقهیەکان لە رابردوودا، چ عەرەب و چ غەیری عەرەب، تێکۆشانێکی بەردەوامییان هەبووە هەتا لە ئاکامدا توانییان گشت سامان و گەنجینەی پاشەکەوتکراوی ئەندێشە فیقهییەکان کۆبکەنەوە کە لە قوتابخانە ناسراوەکانی فیقهی ئێمەدا ئاشکرا بووە، لەم قوتابخانە فیقهییانەدا سێ جۆرە ئیجتهاد لێک جیا کراونەتەوە: ١- ئیختیار و دەسەڵاتی کامڵ و دارشتنی ئەحکام و یاساگەلێک کە لەراستییدا پەیوەستە بە دارێژەرانی مەزهەبەکانەوە. ٢- ئیختیاری رێژەیی کە لە چوارچێوەی قوتابخانەیەکی تایبەتدا بەکاردێت. ٣- ئیختیاری تایبەت کە دەگەرێتەوە بۆ بریاردانی فیقهی لە حاڵەتێکی تاقانەدا کە دارێژەری ئەو مەکتەبە فیقهییە تهکلیفی بابەتەکەی روون نەکردبێتەوە. لەم وتارەدا تەنها ئاور لە جۆری یەکەمی ئیجتهاد دەدەینەوە، واتە هەبوونی ئیختیاری کامڵ بۆ دارشتنی حوکمەکان و یاسا فیقهیەکان. سوننیەکان ئیمکانی ئەم جۆرە لە ئیجتهاد بە شێوازێکی تیۆری قبووڵ دەکەن، بەڵام لە کاتی دامەزراندنی قوتابخانە فیقهییەکانەوە هەمیشە لە پراکتیکدا نکوڵییان لێ کردووە، بۆ ئەوەش باسیان لەمە کردووە کە ئەندێشەی ئیجتهادی کامڵ لەخۆگریی بارودۆخێکە کە کۆبوونەوەی بە تەنها لە یەک کەسدا ئەستەمە، وەها روانینێک لە لایەن سیستمی قەزای ئیسلامییەوە کە بناغەکەی لەسەر قورئان دامەزراوە و ژیان بە بابەتێکی گەشاوە دەزانێت، زۆر سەیر و سەمەرەیە، بەم شێوەیە پێویستە کە بەرلەوەی لەم قۆناغە پێشکەوین ئاور بدەینەوە لە کەشفی هۆکانی ئەم جۆرە بیرکردنەوە کە فیقهیی

ئیسلامی له پراکتیکدا دەکاته حاڵەتێکی ناچالاک و بێ جووڵە، هەندێ لە نووسەرە ئەوروپاییەکان وادەزانن کە بێ جووڵەبوونی فیقهە بەهۆی دزەکردنی دەوڵەتی عوسمانییەوە بووە لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا، ئەمە روانگەیەکی زۆر رووکەشییە، لەبەرئەوەی کە قوتابخانە فیقهییەکانی ئیسلام زۆر بەر لەوەی کە تورکە عوسمانییەکان لە مێژووی ئیسلامییدا کاریگەریەتیان هەبێت، دامەزرابوون، بە باوەڕی من هۆ راستەقینەکانی بێ جووڵەبوونی فیقهی ئیسلامی بەمشێوەیە کە باسی دەکەم:

١. گشتمان لەگەڵ حەرەکەی عەقڵخوازیی کە لە سەرەتای حکومەتی بەنی عەباسەوە لە ناو دەزگای ئیسلامدا سازکرابوو و بووە هۆی دەمەقاڵە و گرفتی زۆر، ئاشنایەتییمان هەیە، بۆ نموونە یەک خاڵی گرنگ لەم موجادەلەیە بهێنە بەرچاو کە دۆگما ئەندیشییەکی سوننەتخوازانە بووە سەبارەت بە قەدیمیبوونی قورئان کە لە نێوان دوو قوتبی فیکرییدا سەریهەڵدا، عەقڵخوازەکان نکوڵییان لە قەدیمیبوونی قورئان دەکرد و وا بیریان دەکردەوە کە ئەمە تەنها شێوازێکییترە لە باوەڕی مەسیحی سەبارەت بە کەون بوونی جیهان، لەولاوە دوایین خەلیفەکانی عەباسی کە لە بەدواهاتە سیاسییەکانی عەقڵخوازی دەترسان هەستانە لایەنگریی لە بیرمەندە سوننەتخوازەکان، لەبەرئەوەی وایان بیر دەکردەوە کە عەقڵخوازە کان بە نکوڵییکردن لە قەدیمیبوونی قورئان دەیانەوێ بناغەی کۆمەڵگەی ئیسلامی هەڵوەشێننەوە، بۆ وێنە، **نظام** بە شێوەی پراکتیکی حەدیسەکانی رەفز کردەوەو بە ئاشکرا باسی لەوە کرد کە **ئەبو هورەیرە** گێڕەوەرێکی جێی متمانە نییە، کەواتە بە هۆی تێگەیشتنی خراپ لە خوازە نیهاییەکانی عەقڵخوازیی لە لایەک و هەندێ بە هۆی ئەندێشەی بێ کۆنترۆڵی تایبەتی عەقڵخوازەکان بووە هۆی ئەوە کە بیرمەندە سوننەتییەکان باس لەوە بکەن کە عەقڵخوازیی هێزێکی

تێکدەرە و ئەوە بە مەترسییەک بزانن بۆ پتەوبوونی حکومەتی ئیسلامی، بەم شێوەیە مەبەستی سەرەکی ئەوان پاراستنی یەکگرتوویی کۆمەڵەی ئیسلامی بوو. بۆ گەیشتن بەوە تەنها ڕێگەیەک کە لەبەردەمی خۆیاندا دەیانبینی ئەمە بوو کە لە هێزی یەکخستنی شەریعە کەڵک وەرگرن و تا ئەو شوێنەی کە دەکرێ کاری داڕشتن و بناغەدانانی سیستمی فیقهی خۆیان بە وردی و وەسواسێکی زۆرەوە بەڕێوە ببەن.

٢ـ دەرکەوتن و گەشەی تەسەووفی زاهیدانە کە تەنها لایەنی ڕەواڵەتی هەیە و بەرەبەرە لە ژێر کاریگەریەتی تایبەتمەندییە غەیری ئیسلامیەکاندا سەری هەڵدا تارادەیەکی زۆر کاریگەریەتی هەیە لە هەبوونی وەها بارودۆخێکدا، تەسەووف تەنها لە باری ئایینی خۆیەوە جۆرێک هەڵچوون و دژایەتی بوو دژ بە دەمەوەری فەقێ سەرەتاییەکان. نوونەیەکی جێی باس لەم جۆرە سۆفیە زاهیدانە، **سوفیانی سوری** (١٦١-٩٧ کۆچی) یە. ئەو یەکێک بوو لە زیرەکترین زانایانی ڕۆژگاری خۆی و بە لانی زۆرەوە دەکرێ بڵێن داڕێژەری قوتابخانەی فیقهی بوو. وردبینی و بەدواداچوونە بێهوودەکانی زاناکانی سەردەمی خۆی، وای کرد ئەو کە بە ڕادەیەکی زۆر لە عالەمی ڕۆحانییدا نغرۆ ببوو، بەرەو تەسەوفی زاهیدانە بەرێت. وەها تەسەوفێک کە دواجار لە باری تیۆرێکەوە گەشەی کرد. ئەوەش شێوازێکە لە ئەندێشەی ئازاد و ڕەها کە لەگەڵ عەقڵخوازییدا پەیوەندی هەیە. تەکیدێک کە ئەم جۆرە تەسەووفە لە جیاوازی نێوان دوو بابەتی ڕەواڵەت و ناخدا داینابوو، وای کرد کە گشت ئەو شتانەی کە دیار و ئاشکرایە و لە ناخدا نییە بێ بایەخ پیشان دا. پاش ماوەیەک هەموو ڕۆحی تەسەووف سەرنجی دایە جیهانێکیتر و ئەمەش بووە حیجابێک

لە بەرامبەر چاوی خەڵکدا کە نەتوانن یەکێک لە لایەنە زۆر گرنگەکانی ئیسلام واتە حکومەتی کۆمەڵایەتی ببینن.

ئەو روانگە دوورەی کە تەسەووف لە ئەندێشەی ئازاد و بێ سنوور وێنای دەکرد لە ئاکامدا باشترین بیرمەندانی جیهانی ئیسلامی بەرەولای خۆی راکێشا، بەم شێوەیە حکومەتی ئیسلامی کەوتە دەست کەسانێک بە ئەندێشەی مام ناوەندییەوەو کۆمەڵەی خەڵک کە نەیاندەتوانی سەبارەت بە بابەتە جیاوازەکان بیر بکەنەوە، کەسایەتی سەرتر لەوانیان بۆ رێنموونی و رێبەرایەتی خۆیان نەدۆزیەوە. بە ناچار ئەمنیەت و بەرژەوەندی خۆیان لەوەدا بینی کە بە شێوەیەکی کوێرانە لاسایی ئەو قوتابخانە فیقهیانە بکەنەوە.

٣ـ بەدەر لە گشت ئەو باسانە، لە ناوەڕاستی سەدەی حەوتی کۆچییدا ڕووداوی وێرانبوونی بەغداد هاتە ئاراوە کە بە ناوەندی ژیانی فیکری ئیسلام دەناسرا، ئەم وێرانییە لەڕاستیدا زەربەتێکی قورس بوو، بەشێوەیەک کە گشت مێژوونووسە هاوچەرخەکان بە هێرش هێنانی تاتارەکان بۆ سەر بەغداد، بە ڕەشبینییەوە دەیانڕوانیە دوارۆژی بەغداد، بیرمەندە سونەتخوازە ئیسلامییەکان لە رووخان دەترسان، هەوڵێکی زیاتریان دا کە لەسەردەمێکی وەهادا کە ئەوەندە گەندەڵ و شێواوە، گشت هەوڵی خۆیان بۆ ئەوە تەرخان بکەن کە بەر بگرن بە هەر جۆرە تازەگەری و تێکدانی رەوشتە پێشووەکان لە یاساکانی شەریعەدا و ژیانێکی کۆمەڵایەتی هاوسان بۆ خەڵک دابین بکەن، گرنگترین بیرۆکەیەک کە ئەوان هەیانبوو، دارشتنی دیسیپلینێکی کۆمەڵایەتی بوو، هەڵبەت دەبێ تارادەیەک ئەو بیرۆکەیە بە حەق بزانین، لەبەرئەوەی کە ئەمە حاشاهەڵنەگرە کە دیسیپلین و دام و دەزگای رێک، هێزە گەندەڵەکان بێ کاریگەریەتی دەکات، ئەوان وەک زانا ئایینیەکانی دوایی

لەم خاڵە تێنەگەیشتن کە چارەنووسی نیهایی نەتەوەیەک تا ئەو شوێنەی کە دەگەڕێتەوە بۆ بایەخ و هێزی تاکەکانی مرۆڤ، ناگەڕێتەوە بۆ ڕێکخستن و دام و دەزگا و دیسیپلینی کۆمەڵایەتی، مرۆڤ لە کۆمەڵگەیەکدا کە زۆر سیستماتیکە بە تەواوەتی ورد دەبێت. ئەو لە وەها کۆمەڵگەیەکدا گشت سەرمایەی ئەندێشەی کۆمەڵایەتی دەوروپشتەکەی وەردەگرێت، بەڵام ڕۆحی خۆی لەدەست دەدات، کەواتە ئەوەی کە حورمەتێکی ساختە بگێردرێت لەو مێژووە تێپەڕ بووە و بە شێوەیەکی سەناعی زیندوو بکرێتەوە، هیچ مەرهەمێک ناخاتە سەر زامی لەناوچوونی مرۆڤ، یەکێک لە نووسەرە نوێکان بە جوانی باسی لەوە کردووە و دەڵێ: "ئەمە فەتوای مێژووە کە هەرگیز بیرە کەون و سواوەکان لە نێوان قەومێکدا کە ئەوانەی کۆن کردووە، سەرلەنوێ نەبوژێتەوە و نەژی".

کەواتە تەنها هۆکارێکی کاریگەر کە دەتوانێت هێزەکانی ڕەشایی و گەندەڵی لە ناو قەومێکدا بێ کاریگەریەتی بکات، پەروەردەکردنی تاکی بە متمانە و بە ئیرادەیە، ئەم جۆرە کەسانە هەرکامیان بە تەنیا دەتوانن قوڵایی ژیان دەربخەن، ئەوان هەندێ پێوەری تازە ئاشکرا دەکەن کە بە تیشکەکانی دەتوانین تێبگەین کە شوێنی دەوروپشتی ئێمە نە تەنها بێ خەوش نییە بەڵکو بەردەوام پێویستی بە بوژاندنەوە هەیە، حەزکردن و مەیل بۆ کۆمەڵگەیەکی زۆر بە دیسیپلین و هاوکات حورمەتێکی لەخۆڕا دانان بۆ ڕابردوو، وەها کە لە نێوان فەقیهە ئیسلامییەکاندا لە سەدەی حەوتی کۆچی و لە دوای ئەودا دەبینرا، دژ بە خوازە دەروونیەکانی ئیسلام بوو، لەئاکامدا بووە هۆی ئەوە کە **ئیبن تەیمیە**، بە توندی و بە قورسی بەرامبەر بەو بارودۆخە پەرچەکردار بنوێنێت.

**ئیبن تەیمیە** یەکێکە لە ماندوو نەناسترین نووسەر و وتاربێژەکانی جیهانی ئیسلام و لە ساڵی ٦٦١ ی کۆچییدا پێنج ساڵ لە دوای وێرانی بەغداد لەدایکبوو، ئەو لەسەر ئاینی حەنبەلی پەروەردە کراو بانگەشەی ئازادی ئیجتیهادی بۆ خۆی دەکرد و دژ بە خەتمبوونی قوتابخانە فیقهییەکان راوەستا و بۆ ئەوەی حەرەکەیەکی نوێ دەستپێبکات گەڕایەوە بۆ بنەما سەرەتاییەکانی ئیسلام، ئەو وەک **ئیبن حەزم** – کە قوتابخانەی فیقهی زاهریەی دارشت- بنەمای حەنەفی ئیستنتاجێک کە لەسەر قیاس و ئیجماع دامەزرابێت، بەو شێوە کە فەقیهەکانی بەر لە خۆی لێی تێدەگەیشتن بەتەواوەتی هەڵوەشاندەوە، وای بیر دەکردەوە کە پەرتووکاویی و پیر بوون و خەمۆکی عەقڵانی و ئەخلاقی سەردەمەکەی ئەوەندە بەرچاوە کە هیچ گومانێکی تێدا نییە کە دەبێ بەو شێوەیە کار بکات.

**سیوطی** لە سەدەی دەیەمی کۆچییدا بانگەشەی هەمان ئیمتیازی کرد لە ئیجتهاددا، ئەم فیکرەشی پێ زیاد کرد کە لە سەرەتای هەر سەدەیەکدا کەسێکی نوێخواز و داهێنەر لە بواری فیقهدا سەرهەڵدەدات، بەڵام شایانی بیرهێنانەوەیە کە رۆحی راهێنانەکانی **ئیبن تەیمیە** لە راپەڕینێکی زۆر بەهێزدا نمودێکی کاملی پەیدا کرد، راپەڕینێک کە لە زیخ و لمەکانی فەلاتی"نجد"ەوە سەری هەڵێنا. پرۆفیسۆر ماکدونالد ئەوە بە ناوی"پاکترین خاڵ لە نێوان هەرێمی روو بە وێرانی ئیسلامدا"وەسف دەکات.

ئەم حەرەکەیە لە ڕاستییدا یەکەمین ترپەیە کە لە ناو دڵی ژیانی نوێی ئیسلامدا پێکهاتووە. ،وەسەرچاوەی ئیلهام بوو بەشێوەیەکی راستەوخۆو ناراستەوخۆ بۆ زۆربەی بزوتنەوە گەورە نوێیەکان لە نێو موسوڵمانانی ئاسیاو ئەفریقیا وەک بزوتنەوەی سەنەوسیەکان، وە بزوتنەوەی جامیعەی ئیسلامی وە بزوتنەوەی بابیەکان(البابیة)کە

هیچنەبوون تەنها ڕێگرێکی فارسی بوون لە چاکساسی ئاینی عەرەبی سەبارەت بە مێژوو و شێوە کاری ئیجتهاد لە ژیانی نوێی ئیسلامدا هەندێ بیرۆکەمان دەرخست، ئێستا دەمانەوێ بزانین کە ئایا لەناو مێژوو و ستراکچێری فیقهی ئیسلامییدا هیچ نیشانەیەک هەیە بۆ ئەوەی باس لە ئیمکانی لێکدانەوەیەکی تازە لە بنەماکانی فیقە بکات یان نا؟ بە واتایەکیتر دەمانەوێ ئەوە باس بکەین کە ئایا فیقهی ئیسلامی توانای ئەوەی هەیە کە گەشە و بڵاوە بکات؟ هورتن مامۆستای زمانە ئیسلامیەکان لە زانکۆی بۆنی ئەڵمانیا هەر ئەم پرسیارە سەبارەت بە فەلسەفە و خوداناسیی ئیسلامی دەپرسێت، ئەو لە دوای هەڵسەنگاندن و پێداچوونەوەی بەرهەمەکانی بیرمەندانی مسوڵمان لە بواری ئەندێشەی ئاییندا باس لەوە دە کات کە: مێژووی ئیسلام شایستەی ئەوەیە کە بە ناوی کاریگەریەتی بەرامبەر و هاوئاهەنگ بە دوو هێزی جیاواز وەسف بکرێت کە لایەکی فەرهەنگی ئاریاییە و لاکەیتری ئاییینی سامی. تاکی موسوڵمان ڕوانگەی ئاییینی خۆی بەردەوام لەگەڵ ئەو توخمانە لە ناو فەرهەنگی خۆیدا بەراورد دەکات کە لە خەڵکی خۆیەوە وەریگرتووە. هوترن دەڵێت: لە نێوان سەدەی دووهەم تا پێنجەمی کۆچی نزیک بە سەد قوتابخانەی کەلامی لە ئیسلامدا ساز کرا. ئەم ڕاستییە نە تەنها شایەتیەکە لەسەر گەشەکردنی ئەندێشەی ئیسلامی بەڵکو نیشانەی هەوڵدانی بێ ڕاوەستانی یەکەمین بیرمەندانی ئیسلامە. ئەم ڕۆژهەڵاتناسە ئەوروپاییە بە سەرنجدان بە موتالا قووڵەکانی ناو بەرهەم و فیکری ئیسلامی دەگاتە ئەم ئەنجامە:

"ڕۆحی ئیسلام ئەوەندە بەرینە کە دەبێ بڵێین بە ڕاستی هیچ سنوورێک ناناسێت، ئیسلام بەدەر لە باوەڕە مولحیدانەکان، گشت

ئەندێشە باوەڕپێکراوەکانی نەتەوەکانی دەوروپشتی خۆی راکێشاوە و ئەوانەی بۆ مەبەستی گەشەسەندن و کامڵبوونی خۆی بەکارهێناوە".

رۆحی راکێشەری ئیسلام لە پانتای فیقهدا زیاتر لەوەش خۆی دەردەخات. **پرۆفیسۆر هورگرونی**، رخنەگری هۆڵەندی لە بابەتە ئیسلامییەکاندا دەڵێت: "کاتێک کە مێژووی بەربڵاو بوونی فیقهی ئیسلامی موتالا دەکەین تێدەگەین کە لە لایەکەوە فەقیهەکانی هەر سەردەمێک بە کەمترین خوازەکانەوە یەکتریان تاوانبار دەکرد بەوەی کە لە ئایین دەرچوون و سزایان دەدان. لە لایەکیتریشەوە بە هۆی ئەخلاقەوە کە هەیانبوو، هەوڵیان دا کە هەرچی زیاتر بگەنە جۆرێک یەکگرتوویی و بەر بە جیایی و دژوازی بگرن وەک ئەوەی پێشینانیان کردبوویان و لەم بابەتانەدا بگەنە هاودەنگییەک".

باسکردنی وەها بابەتێک لە لایەن رەخنەگرە نوێیە ئەوروپاییەکانەوە سەبارەت بە ئیسلام ئەوە دەردەخات کە ئازادی ئەندێشە لە ئیسلامدا بەپێی کارکردی ژیانی نوێ، هەرچەند کە فەقیهەکانمان زۆریش کۆنسێرڤاتیو بن، بەڵام هەر خۆی ئاشکرا دەکات. هیچ گومانێکم لەوەدانییە کە ئەگەر رەخنەگرە نوێکان لە بواری بابەتە ئیسلامیەکاندا، قووڵتر موتالای ناو دەق و بەرهەمە پڕئەژمارەکانیان بکردایە، لەم باوەڕە رووکەشییە کە فیقهی ئیسلامی توانای پەرەسەندنی نییە و بێ حەرەکەیە، پاشگەز دەبوونەوە.

بەداخەوە کە زۆربەی موسوڵمانە کۆنسێرڤاتیوەکانی ئەم وڵاتە، هێشتا بۆ باسە رەخنەگرانەکان سەبارەت بە ئایین ئامادەیی تەواویان نییە و ئەگەر دەست بدەینە ئەم کارە وێدەچێت ببێتە هۆی ناڕەزایەتی زۆربەی ئەوان و هەندێ موناقەشە و شەڕ بێتە ئاراوە. بەم حاڵەوە ئیزن دەخوازم کە چەند خاڵی جێگەی باس بەپێی ئەم بابەتە بهێنمە ئاراوە:

١. له هەنگاوی یەکەمدا دەبێ لەبیرمان بێت کە لە سەدری ئیسلامەوە هەتا هاتنی عەباسیەکان بەشێوەی پراکتیکی هیچ یاسایەکی نووسراو بێجگە لە قورئان لە ئیسلامدا بوونی نەبوو.

٢. جێگەی باسە کە بە لانی کەمەوە لە ناوەڕاستی سەدەی یەکەمەوە هەتا سەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچی نزیک بە نۆزدە قوتابخانەی فیقهی و شەرعی لە ئیسلامدا ساز کرا. ئەم ڕاستییە خۆی بە تەنها بەسە بۆ ئەوەی کە پیشانمان بدات کە یەکەمین فەقیهەکانی ئیسلام تا چ رادەیەک بێ وچان هەوڵیان داوە کە ئاوڕ لە پێویستییەکانی شارستانیەتێکی لە حاڵی گەشەکردندا بدەنەوە. پەرەسەندنی فتوحاتی ئیسلام و هەروەها بەرینبوونی ئەو پانتاییە تیۆرێکەی کە بەرهەمەکەی بوو، زاناکانی ئەو سەردەمەی ناچار کرد کە روانگەیان بە نیسبەت بابەت و باسەکان بەربڵاوتر بکەن و بارودۆخ و چۆنیەتی ژیان و داب و نەریتەکانی ئەو قەوم و نەتەوانە بخەنە بەر موتالا کە تازە بە ئومەتی ئیسلامەوە پەیوەست ببوون. ئەگەربێتو لە ژێر تیشکی مێژووی کۆمەڵایەتی و سیاسی هاوچەرخدا موتالا و ڕوانینیکی قووڵ لە ناو قوتابخانە جیاوازە فیقهییەکاندا سەر بگرێت، دەردەکەوێت کە زانا ئیسلامییەکان لە هەوڵەکانیاندا بۆ لێکدانەوەی قورئان بەرەبەرە لە شێوازی قیاسییەوە بۆ شێوازی ئیستقڕایی چوون.

٣. ئەگەر سەبارەت بە چوار سەرچاوەی قبووڵکراوی فیقهی ئیسلامی و ئەو باسانەی کە هێناویەتە پێش، لێکۆڵینەوە بکەین، توند گرتن و رەقبوونی باوەڕەکان کە لەو قوتابخانە ئاییینیانەوە لە زەینماندا ماوەتەوە لەناو دەچێت و ئیمکانی پەرەسەندن و کامڵبوونی زیاتر بە تەواوەتی ئاشکرا دەبێت. ئیزنم پێ بدەن سەبارەت بە هەر کام لەم چوار سەرچاوە فێقهییە باسێکی کورت بهێنمە ئاراوە.

**ئەلف: قورئان**

ئەم کتێبە سەرچاوەی سەرەکی فیقهی ئیسلامییە، بەڵام لەخۆگری حوکمە یاساییەکان نییە. هەروەک چۆن پێشتر باسمکرد مەبەستی سەرەکی قورئان زۆرترین رادەی ئاگادارکردنەوەی خودئاگاییە لەناو مرۆڤدا کە پەیوەندی بە ئەو و خودا و عالمەوە هەبێت. گومانی تێدا نییە کە قورئان هەندێ باسی گشتی و یاسایی لە باری ماف و شەرعەوە دارشتووە بەتایبەت لە بواری خێزاندا، کە بناغەی سەرەکی ژیانی کۆمەڵایەتییە، بەڵام چۆنە کە ئەم یاسایانە بەشێک لە وەحی پێکدەهێنن لە حاڵێکدا کە مەبەستی نیهایی و ئامانجی ژیانی مرۆڤە، دەبێ وەڵامی ئەم پرسیارە لە مێژووی مەسیحیەتدا بدۆزینەوە کە بەشێوەی پەرچەکردارێکی بەهێز لە بەرامبەر رۆحی "یەکگرتن لەگەڵ بنەماکانی شەریعە"دا کە لە یەهوودیەتدا هەبوو خۆی ئاشکرا کرد. گومانی تێدا نییە کە مەسیحیەت بە یۆتۆپیا پیشاندانی ئەو جیهانەیتر سەرکەوتنی بەدەستهێنا کە ژیانی لەناوچووی ئەم جیهانە رۆحانی بکات، بەڵام هاوکات تاکخوازییەکەی بە هیچ شێوەیەک ناتوانێت ئەو بایەخە رۆحانییە بدۆزێتەوە کە لە پێچ هەڵپێچی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی مرۆڤدا هەیە. **نۆمان** لە کتێبەکەیدا بە ناوی "کورتەیەک سەبارەت بە ئایین" دەڵێت: پاراستن و پاسەوانییکردن لە حکومەت، یاسا، رێکخراو و وەبەرهێنان، هیچ بایەخێکی بۆ مەسیحیەتی سەرەتایی نەبووە و بارودۆخی کۆمەڵگەی مرۆیی پیشان نەدەدا". **نۆمان** پاشان دەگاتە ئەم ئەنجامە کە: کەواتە دەبێ یان جورئەتی ئەوەمان هەبێت کە بێ حەرەکە ژیان بەسەربەرین و بە خواستی خۆمان بکەوینە داوێنی پرژوبڵاوی و

بێ یاسیایەوە یان ئەوەی کە بڕیار بدەین کە هاوکات لەگەڵ باوەڕە ئایینیەکانمان ببینە خاوەنی بیروڕای سیاسییش.

بەم شێوەیە کە قورئان ئەوە بە زەروور دەزانێت کە ئایین و دەوڵەت، ئەخلاق و سیاسەت لە یەک وەحییدا پێکەوە گرێ بداتەوە و ئەمەش هەمان ڕێگەیە کە ئەفلاتوون لە کتێبی کۆماردا خستوویەتیە بەرباس.

خاڵێکی سەرنجڕاکێش سەبارەت بەم باسە جیهانبینی گەشەکردووی قورئانە کە بە وردی باسم لە سەرچاوە و مێژووەکەی کردووە. دیارە کە کتێبی پیرۆزی ئیسلام بە هۆی وەها جیهانبینییەکەوە ناتوانێت لەگەڵ تیۆری تایبەت بە ڕەوتی کاملبون لە دژایەتییدا بێت. تەنها نابێ ئەم خاڵە لە بیر بکەین کە گۆڕانکاریی ژیان بابەتێکی ساکار و ساویلکانە نییە، لە ناخی خۆیدا گەلێک توخمی پاراستن و خۆڕاگریشی هەڵگرتووە. مرۆڤ لەهەمانکاتدا کە چێژ وەردەگرێت لە چالاکی داهێنەرانە و بەهرەکەی دەبات و بەردەوام هێزەکانی بۆ کەشفکردنی ڕوانگەگەلی نوێ لە ژیاندا تەرخان دەکات بەڵام لە بەرامبەر گەشە و کراوەیی ژیانی خۆشیدا هەست بە هێمنایەتی و ئارامی ناکات. ئەو لەهەمانکاتدا کە دەچێتە پێش ناتوانێت نەڕوانێتە ڕابردووەکەی خۆی و جیهانی دەروونی خۆی ئاوێتەی ترس دەبینێت. حەرەکەی بەرەوپێش چووی ڕۆحی مرۆڤ بەو هێزانە کە لە لایەنی بەرامبەردا کار دەکەن ڕادەوەستێت، ئەو شتەی کە باسمانکرد تەنها ڕوخسارێکیترە لە گێڕانەوەی حەرەکەی ژیان بە کۆڵ و بارێکی قورسەوە کە مرۆڤ لە ڕابردووەوە لەسەر شانیەتی. هەر تیۆریەک سەبارەت بە گۆڕانکاریی ژیانی کۆمەڵایەتی بێتە ئاراوە بایەخ و ئەرکی هێزەکانی بەرهەمهاتوو لە سوننەتخوازیی نابێ لەبەرچاو نەگیردرێت. پەیڕەوەکانی عەقڵخوازیی دەبێ بە سەرنجدان بەم ڕوانینە

زیندووه كه به شێوەیەكی بنەڕەتی لەناو وانەكانی قورئاندا هەیە لەگەڵ دام و دەزگاكانی ئێمەدا پەیوەندی بگرین، ئەمە رابردووی ئەوە كە شوناسی تاكیی ئەو ساز دەكات، ئەم بابەتە واتە پێداچوونەوە بەسەر باوەڕە كەونەكان لە كۆمەڵگەیەكدا ئەویش كۆمەڵگەی ئیسلامی، لەمە وردتر و حەساسترە و بەرپرسایەتی بەرژەوەندی ئاینی لایەنی زۆر جیدییتر پەیدا دەكات. ئیسلام، بە وڵاتێكی تایبەتەوە نەبەستراوەتەوە و مەبەستەكەی ئەوەیە كە بە لایەنگریی لە گشت نەژادە دژ بەیەكەكان میتۆدێك بۆ ئاوێتەیی و یەكگرتنی مرۆڤایەتی پێكبهێنێت، بۆ ئەوەی بەم شێوەیە گشت ئەم زەڕاتانە ببن بە ئومەتێك كە خاوەنی خودئاگاییە، بەڕێوەبردنی ئەم كارە بە هیچ شێوە ئاسان نییە، ئیسلام بە هۆی وانەكان و بنەماكانی خۆی كە بە تەواوەتی لێی تێدەگەین تاڕادەیەكی زۆر توانیویەتی شتێك هاوشێوەی ئیرادە و ویژدانی گشتی لەم كۆمەڵە نارێك و ئاڵۆزە دروست بكات. لە رەوتی كامڵبوونی ئەم كۆمەڵگەیەدا تەنانەت نەگۆڕبوونی یاساگەلی بێ زەرەری كۆمەڵایەتی وەك خواردن و خواردنەوە یان پاكی و ناپاكی بایەخێكی لەڕادەبەدەریان هەیە، لەبەرئەوەی كە ئەو یاسایانە مەعنەویەتێكی تایبەت دەبەخشن و هەروەها گەرەنتییەكیشن بۆ دابینكردنی هاوئاهەنگی و یەك رەوت بوونی ناخی و دەرەكی هێزە شاراوە و نارێكەكان كە بەردەوام لەو كۆمەڵگەیانەدا كە نەژادگەلی جۆراوجۆری هەیە یەكتر بێ كەڵك دەكەن، كەواتە ئەو رخنەگرەی كە دەیەوێ ئەم وانە و بنەمایانە بخاتە بەر هەڵسەنگاندن دەبێ هەوڵی ئەوە بدات بەر لەوەی دەست بەم كارە بكات لە مەبەستی سەرەكی ئیسلام لەوەها تاقیكارییەكی كۆمەڵایەتی بە وردی تێبگات. ئەو نابێ سەرنج بداتە ستراكچێرەكەی ئەوان لە باری زەرەر یان قازانجێكەوە كە بۆ ئەم وڵات یان ئەو وڵاتە هەیانە، بەڵكو دەبێ

وەها بڕوانێته بابەتەکە کە مەبەست و ئامانجێکی گەورەتری لە پشتە و دیارە کە وەک گشتێک کاریگەریەتی لە ژیانی مرۆڤ دادەنێن.

ئەگەر سەیری بناغەی بنەما یاساییەکانی ناو قورئان بکەین بە تەواوەتی دەردەکەوێت کە ئەم بنەمایانە لە جیاتی ئەوەی کە بوار تەسک بکەن بۆ ئەندێشەی مرۆیی و چالاکی یاساداڕشتنی ئەو، ئەوەندە بەربڵاو و فراوانە کە بە ڕاستی رۆڵی هۆکارێکی ئاگایی بەخشیان هەیە، زانا سەرەتاییەکانی ئێمە شێوازی وایان هەر لەسەر ئەم مێتۆدە داڕشت و توانیان هەندێ دام و دەزگای یاسایی پێک بهێنن، هەرکەس کە لە مێژووی ئیسلامدا توێژینەوەی کردبێت باش دەزانێت کە بە لانی کەمەوە نیوەی سەرکەوتنەکانی ئیسلام وەک هێزێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی بە هۆی یەکگرتنی ئایدیا و باوەڕی ئەم زانایانە بووە لە بواری یاساییدا. **فون کرمێر** باس لەوە دەکات کە:"ئەگەر چاوپۆشی لە رۆمییەکان بکەین قەومێکیتر بێجگە لە عەرەب شک نابەین کە بتوانێت بانگەشەی خاوەنداریەتی دەزگایەکی ورد و بە دیسیپلین بێت". بەڵام ئەم دەزگا یاساییانە بە گشت ئەو شمولیەتەوە کە هەیانە بەرهەمهاتووی لێکدانەوەگەلی تاکین و لەبەرئەوەی کە ئاوەهایە ناتوانن بانگەشەی ئەوە بکەن کە خەتمی بابەتە شەرعییەکان و بواری مافن. من ئەوە دەزانم کە زانا ئیسلامییەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە کاری قوتابخانە بەناوبانگەکانی فیقهی ئیسلامی کۆتایی پێهاتووە، بەڵام هەرگیز ناتوانن نکولی لەوە بکەن کە ئیمکانی تیۆرێکی ئیجتیهادی کامڵ لەئارادایە. هەوڵمداوە ئەو هۆکارانە شیی بکەمەوە کە لە روانگەی خۆمەوە بوونەتە هۆی دروستبوونی وەها بارودۆخێک بۆ زانایانی ئیسلام، لەبەرئەوەی کە هەموو شتێک گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە و ئەمڕۆکە جیهانی ئیسلام کەوتۆتە ژێر کاریگەریەتی و تووشی هێزگەلێکی تازە هاتووە،

که هۆی دروستبوونیان گەشەکردنی لەڕادەبەدەری ئەندێشەی مرۆییە لە گشت بوارەکاندا، هەربۆیە هیچ هۆکارێک نابینم کە ئەم بارودۆخە هەروا درێژەی هەبێت. ئایا بناغەداڕێژەرانی قوتابخانە فیقهییەکانی ئێمە بانگەشەی ئەوەیان کردووە کە لێکدانەوە و ڕەئیەکانی ئەوان قسەی دوایی دەکات؟ هەرگیز. بانگەشەی جیلی ئێستای موسوڵمانە ئازادبیرەکان لەم بارەوە ئەوەیە کە ئەو ریزە لە بنەما یاساییەکان کە لە ناو ئیسلامدا بنەڕەتیین، دەبێ لە ژێر سێبەری ئەزموونێکی نوێدا کە خۆیان دەستیان کەوتووە و بەپێی بارودۆخی ژیانی تازە گۆڕاوە، سەرلەنوێ هەڵبسەنگێنرێنەوە، ئەم وتەیە بە باوەڕی من زۆر جێگەی متمانەیە. وانەکانی ئیسلام کە ژیان بە پرۆسەیەکی گەشەکردوو دەزانێت بەپێویستی دەزانێت کە هەر جیلێک بە رێنموونی و چاودێری جیلە پێشووەکانی خۆیەوە، بێ ئەوەی کە ببێتە لەمپەری ریگەیان، ئیمکانی ئەوەی هەبێت کە گرفتە تایبەتەکانی خۆی چارەسەر بکات.

لێرەدا سروودێکی **ضیاء گۆک ئالپ پاشا**، شاعیری تورک دێتەوە یادم کە سەبارەت بە یەکسانی پیاو و ژنە لە بوارەکانی تەڵاق، جیابوونەوە و میراتدا. ئەو بە حەزێکی ئاگرینەوە کە بۆ یەکسانی ژن و پیاو هەیبوو، ئاواتی ئەوەی دەخواست کە یاساکانی خێزان لەناو ئیسلامدا گۆڕانکاری بنەڕەتیان بەسەر بێت و شێوازێکی ئەمڕۆیی بە خۆوە ببینێت:

**"ئەو ژنە، کە دایک، خوشک یان کچی منە،**
**کەسێکە کە پیرۆزترین سۆزەکان لە ناخی دڵی منەوە هاوار دەکات!**
**ئەو خۆشەویستی من، خۆر و مانگ و ئەستێرەی منە.**
**ئەوە کە سروودی ژیان لە من تێدەگەیێنێت.**
**یاسای پیرۆزی ئیلاهی چۆن دەتوانێت**

**ئەم بوونەوەرە جوانانە بە بچووک و کەم بزانێت؟**
**رەنگە زانایان لە لێکدانەوەی قورئاندا تووشی هەڵە بووبێتن؟**
**خێزان بناغە و هەوێنی نەتەوە و حکومەتە**
**تا ئەو کاتەی کە بایەخی کامڵی ژن مسۆگەر نەبێت**
**ژیانی نەتەوەیی ناگەتە کەماڵ**
**پەروەردەکردنی خێزان دەبێ لەسەر بنەمای**
**عەداڵەت و یەکسانی بێت**
**لەم کاتەدا یەکسانی لە سێ شتدا واجبە:**
**لە تەڵاق، جیابوونەوە و میراتدا.**
**تا کاتێک کە ژن لە میرات وەرگرتندا**
**نیوەی پیاو و لە ناو خێزاندا چوار بە یەکی ئەو حسێب بکرێت**
**نە خێزان گەشە دەکات و نە وڵات.**
**لە لایەکەوە بۆ دیکەی بابەتە یاساییەکان**
**کۆشکی یەکسانی نەتەوەییمان ساز کردووە**
**لە لایەکیتریشەوە خێزانەکانمان سپاردۆتە دەست مەلاکان**
**نازانم بۆچی ژنانمان تووشی پووچی کردووە**
**ئایا ئەو بۆ ئەم نیشتمانە هەوڵ نادات؟**
**یان ئەوەی کە دەبێ دەرزی دورومانەکەی**
**بکاتە خەنجەرێک و شۆڕشێک بکات**
**هەتا مافەکانی لە چنگ ئێمە بستێنێتەوە؟"**

نازانم ئایا ئەم بابەتەی کە مەبەستی شاعیرە دەکرێ لەگەڵ فیقهی ئیسلامییدا سازگار بێت یان نا؟ ئایا بزووتنەوەی ئازادی ژنان لە تورکیا هەندێ ویستی داواکردووە کە وەدیهێنانی تەنها پێویستی بەوە هەبێت کە لێکدانەوەیەکی نوێ لە بنەما سەرەکییەکانی ئایین بکرێت؟

هەمووان دەزانن کە لە پەنجاب چەندین حاڵەت هەبووە کە ژنەکان بۆ ئەوەی لە چنگ مێردە خراپەکانیان رزگاریان بێت هیچ ڕێگەیەکیتریان نەبووە بێجگە لەوەی کە بکەونە داوێنی کوفر و ئیلحادەوە. هیچ لەمە زیاتر دژایەتی نییە لە گەڵ ئایینێکدا کە گەشەکردووە. **ئیمام شاطبی** زانای گەورەی ئەندەلووسی لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی "الموافقات" دەڵێت: پاراستنی پێنج شت مەبەستی فیقهی ئیسلامییە کە بریتین لە: ئایین، نەفس، عەقڵ، ماڵ و نەسڵ.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەم پێوەرە شایستەیە کە پرسیار بکەم"ئایا یاسای تایبەت بەبێ باوەڕی و ئیلحاد، بەو شێوەیە کە لە کتێبی هدایە دا باسی لێکراوە بۆ پاراستن و راگرتنی ئیمانە لەم وڵاتەدا؟"، لەبەرئەوەی کە مسوڵمانانی هیند تارادەیەکی زۆر کۆنسێرڤاتیون، قازییەکانی هیند چارێکیان نییە بێجگە لەوەی کە لە کاری یاساییدا تەنها ئاوڕ لەو کتێبە یاساییانە بدەنەوە کە بە پێوەر دەزانرێن. ئاکامی وەها بارودۆخیک دەبێتە ئەوەی کە کاتێ کۆمەڵگە حەرەکە دەکات یاسا لە سەر جێی خۆیدا رادەوەستێت. دەگەڕێنەوە بۆ قسەی شاعیری تورک کە لە وتەکەیدا دیارە شتێکی ئەوتۆی سەبارەت بە یاساکانی خێزان لە ئیسلامدا نەزانیوە و هەروەها وا نایەتە بەرچاو کە چەمکی ئابووری ئەحکامی قورئانی سەبارەت بە میرات نەزانیوە. بەپێی فیقهی ئیسلامی زەواجکردن پەیمانێکی مەدەنییە، ژن سەرپشکە کە لە کاتی خوێندنی سیغەی مارەیی داوا لە مێردەکەی بکات کە لە بارودۆخێکی تایبەتدا مافی تەڵاقی بداتێ و وەکالەتی پێ بدات. بەم شێوەیە ژن لە مافی تەڵاقداندا لەگەڵ مێردەکەی یەکسان دەبێت. روانگەی چاکسازی ئەم شاعیرە لە ئەحکامی تەڵاقدا لەو تێگەیشتنە هەڵەوە هاتووە بە نیسبەت ئەم بابەتە. لە لایەکیترەوە نایەکسانی بەشی میراتی ژن و مێرد نابێ

وەها لێک بدرێتەوە کە لە ئەحکامی میراتدا پیاو سەرتر دەزانرێت لە ژن، وەها لێکدانەوەیەک لەگەڵ رۆحی ئیسلامدا دژایەتی هەیە. قورئان دەڵێت:

"ژنان مافێکیان بەسەر پیاوانەوە هەیە وەک مافێک کە پیاوان بەسەر ژنانەوە هەیانە".

ئەو بەشەی کە بۆ کچ لەبەرچاو گیراوە بەو واتایە نییە کە ئەو لە زاتی خۆیدا ژێردەستە، بەڵکو بارودۆخی ئابووری و پێگەی لە ستراکچێری کۆمەڵگە و کۆمەڵێکدا کە ژن بەشێک لەوەیە لەبەرچاو گیراوە، هەروەها بەپێی روانگەیەک کە شاعیر سەبارەت بە کۆمەڵگە هێناویەتە ئاراوە، نابێ ئەحکامی میرات وەک هۆیەکی تەنها بۆ دابەشکاریی سامان و پارە لەبەرچاو بگرین، بەڵکو دەبێ وەک هۆیەک بۆی بڕوانین کە لەگەڵ دیکەی هۆکاندا هەموویان بۆ یەک ئامانجی گشتی کار دەکەن. ئەگەر ئەحکامی میرات بخەینە بەر داوەری بەپێی یاسای ئیسلام کچ بە تەواوەتی ئیختیاری ئەو پارە و موڵکەی هەیە کە لە لایەن باوک و مێردەکەی لە کاتی مارەییدا پێی دراوە و هەروەها کاتێک کە دەتوانێت بە مەیلی خۆی مارەییەکەی کامڵ یان پاش ماوەیەک داوا بکات، دیسان خاوەنی گشت داراییەکانی مێردەکەیەتی تاکاتی پێدانی مارەییەکەی. بەرپرسایەتی پارێزگاریی لەو لە هەموو ژیانیدا لەسەر شانی مێردەکەیەتی. لەم کاتەدا تێدەگەین کە لە ئەحکامی میراتدا هیچ جیاوازییەکی بەرچاو لە نێوان بارودۆخی ئابووری کوڕ و کچدا نییە. لەڕاستییدا هەر لەم نایەکسانی رەواڵەتیە لە بەشە میراتدا کە شەرع یەکسانی داواکراوی شاعیری تورک وەدی دەهێنێت، حەقیقەت ئەوەیە کە ئەحکامی باسکراو لەناو قورئاندا سەبارەت بە میرات کە **فون کرمێر**، ئەوە بە سەرترین لقی ڕەسەنی فیقهی ئیسلامیی وەسف دەکات هێشتا بەو شێوەی کە شایستە بێت سەرنجی زانایانی ئیسلامی بەرەولای

خۆی رانەکێشاوە، کۆمەڵگەیەکی نویَ بە خەباتێکی چینایەتی غەمگینەوە کە تێیدایە دەبیَ ئێمە بخاتە بیرکردنەوە. ئەگەربێتو یاسا فیقهیەکانی خۆمان بە سەرنجدان بەو گۆڕانکارییە کە لەناو ژیانی ئابووری نوێدا هاتۆتە ئاراوە، بخەینە بەر موتالا وێدەچێت کە لایەنگەلێکی بنەما سەرەکیەکان کە تائێستا کەشف نەکرابوون بدۆزینەوە و دەتوانین بە ئیمانێکی پتەوەوە ئەوپەڕی بەهرەی خۆمان لە مەعریفە و ئەندێشەیەک کە تێیدایە وەربگرین.

**ب- حەدیس**

دووهەمین سەرچاوەی گەورەی فیقهی ئیسلامی، سوننەت و حەدیسەکانی پێغەمبەری ئیسلامە، کە زۆر باس و بابەتی لە رابردوو و ئێستادا هەڵگیرساندووە. لە نێوان رەخنەگرانی ئێستادا **پرۆفیسۆر گلزێهر**، لە رێگەی یاساگەلی رەخنەی نوێی مێژووییەوە، حەدیسەکانی خستۆتە بەر لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندن و گەیشتە ئەم ئەنجامە کە ئەوان بە گشتی جێی متمانە نین، توێژەرێکی ئەوروپایی دیکە پاش هەڵسەنگاندنی شێوازە ئیسلامییەکان بۆ دەرخستنی ڕاستی و هەڵەبوونی حەدیسێک و باسکردن لەوەی کە گریمانەی هەڵەکردن لە گێڕانەوەی سوننەت و حەدیسدا هەیە، ئاوەها باسەکەی خۆی ئاراستە دەکات:

"لە ئاکامدا دەبیَ ئەوە بڵێم کە ئەو روانگانەی کە باسکرا، تەنها ئیمکانیاتی تیۆری پیشان دەدات و ئەم بابەتە کە تا چ رادەیەک بوون بە واقیع، زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە تا چ رادەیەک بوار رەخساوە بۆ کەڵکوەرگرتن لەو ئیمکانیاتە لە پراکتیکدا، بێگومان بارودۆخی پراکتیکی بە نیسبەت بارودۆخی تیۆرێکەوە سنووردار بووە و تەنها لەسەر

بەشێک لە گشت حەدیس و سوننەتەکان کاریگەریەتی هەبووە، کەواتە دەتوانین ئەوە بڵێین کە زۆرترین بەشی کۆمەڵی حەدیس و سوننەت کە مسوڵمانان ئەوە تارادەی یاسایەک، بە متمانە دەزانن و باوەڕیان پێیەتی، پێشینەیەکی بە متمانەی لە کاتی سەرهەڵدان و گەشەی ئیسلامەوە هەیە". کتێبی بنەماکانی ئابووری ئیسلامی.

بۆ ئەوەی کە لە باسەکەی خۆمان دوور نەکەوینەوە و بچین بە شوێن مەبەستەکەماندا دەبێ جیاوازییەک دابنێین لە نێوان ئەو سوننەت و حەدیسانەی کە گرنگایەتیەکی شەرعی رەهایان هەیە لەگەڵ ئەو سوننەت و حەدیسانەی کە وەها گرنگایەتیەکیان نییە. بە لەبەرچاوگرتنی سوننەتە گرنگەکان ئەم پرسیارە هەستیارە دێنێتە ئاراوە کە سوننەتەکان تا چ رادە لەخۆگریی داب و نەریتی عەرەبەکانی بەر لە ئیسلام بووە کە پێغەمبەر لە هەندێ کاتدا دەستی لەوانە نەداوە و هەندێ جاریش ئەوانەی گۆڕیوە. دۆزینەوەی ئەم بابەتە دژوارە لەبەرئەوەی کە توێژەر و نووسەرە قەدیمییەکانی ئێمە هەرگیز دیکۆمێنتیان لە داب و نەریتەکانی عەرەبەکانی بەر لە ئیسلام لە دەستدا نەبووە و باسیان نەکردووە، هەروەها ئیمکانی نییە کە لەوە تێبگەین کە مەبەستی پێغەمبەر لەوەی کە هەندێ داب و نەریتی وەک خۆی بێ هیچ گۆڕانێک دەست لێ نەداوە یان بە شێوەیەکی پەراوێزی تەئیدی کردوون، ئەوە بووبێت کە گشت ئەوانە بە تەواوەتی بەکاربهێنرێن. **شاە وەلی اللە**، باسێکی زۆر روونکەرەوەی لەم بارەوە هەیە. لێرەدا کۆکراوەی باسەکەی ئەو دەهێنمە ئاراوە، بە باوەڕی ئەو شێوازی راهێنانی پێغەمبەرەکان بەشێوەی گشتی وەهایە کە کاتێک پێغەمبەرێک ئاینێک بە خەڵک رادەگەیێنێت، لەو ئایینەدا سەرنجێکی تایبەت دەدرێت

بە داب و نەریت و تایبەتمەندی و خەسڵەتی ئەو خەڵکەی کە ئەو بەتایبەتی بۆ ئەوان راسپێردراوە. بەڵام پێغەمبەرێک کە بۆ راگەیاندنی بنەماگەلێکی گشتگیر راسپێردراوە نە دەتوانێت کە بۆ هەر قەومێک بنەماگەلی جیاواز ساز بکات و نە دەتوانێت ئەوان بە حاڵی خۆیان بەجێبهێڵێت تاکو خۆیان ئەحکام و رەفتار و ئەخلاقی تایبەت بەرهەم بهێنن. شێوازی پێغەمبەرێک ئەوەیە کە قەومێکی تایبەت رادەهێنێت و پاشان ئەو قەومە وەک بناغەیەک بۆ بیناکردنی شەریعەیەکی گشتگیر بەکار دەبات. ئەو بەم کارە ئەو بنامایانەی کە چوارچێوەی ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤە بە گرنگ دەزانێت و لە هەندێ خاڵی دەگمەندا، کەڵک وەردەگرێت لە داب و نەریتی تایبەتی ئەو قەومانەی کە راستەوخۆ لەگەڵیاندایە. ئەو حوکمە شەرعیانەی کە لەم رێگەیەوە بەرهەم دێن، بۆ وینە ئەحکامی تایبەت بە "قصاص" و سەبارەت بە قەتڵ، بە یەک واتا تەنها تایبەتە بەو قەومە و لەبەرئەوەی کە پاراستن و بەڕێوەبردنیان لە خۆیدا ئامانج نییە، ناکرێ بێ کەم و کوڕی و بەزۆرەملی بگوازینەوە بۆ جیلەکانی دوایی. رەنگە لەبەرئەوە بووبێت کە **ئەبو حەنیفە** بە رۆشنبیرییەکی تەواوەوە کە لە گشت بابەتە ئیسلامیەکاندا هەیبوو، بەهرەی پراکتیکی لە حەدیسەکان وەرنەدەگرت. ئەوەی کە ئەو بنەمای "استحسان"ی هێنایە ئاراوە، واتە ئەو شتەی کە دەبێتە هۆی زاڵکردنی حوکمێک بە باوەڕی زانای ئیسلامی، خۆی لە خۆگری توێژینەوە، هەڵسەنگاندنی و موتالای قووڵە لە بارودۆخی ئەندێشەی فیقهی لە هەر سەردەمێکدا. هەروەها ئەوەش دەردەخات کە چ خوازەگەلێک روانینی ئەوی بەرەولای ئەم سەرچاوە فیقهییە بردووە. دەڵێن **ئەبو حەنیفە** لەبەرئەوە، ئەوەندە بۆ قبووڵکردنی حەدیسەکان توندگر بووە کە لە

کاتی ئەودا کۆمەڵێکی کۆکراوە لە حەدیسەکان لەبەر دەستدا نەبووە. ئەمە باوەڕێکی هەڵەیە، چونکە کۆمەڵێک لە حەدیسەکانی **عەبدولمالک و زەهری** نزیک بە سی ساڵ بەر لە مەرگی **ئەبو حەنیفە** کۆکرابوونەوە، تەنانەت ئەگەر وای دابنێین کە ئەم کۆمەڵانە هەرگیز نەگەیشتوونە دەست ئەو، یان ئەوەی کە کەوتبێتە بەردەستی، بەڵام حەدیسی گرنگی شەرعی نەبووبن، ئەگەر هەستی بە پێویستی کردبایە بە ئاسانی دەیتوانی وەک مالک **و ئەحمەد بن حەنبەل** کە پاش ئەو کۆمەڵێک حەدیسیان کۆکردەوە، ئەویش کۆمەڵێک حەدیسی بۆ خۆی تۆمار دەکرد. بە باوەڕی من روانینی **ئەبو حەنیفە** بە گشتی سەبارەت بەو حەدیسانەی کە گرنگایەتی شەرعی تەنهایان هەیە بە ڕاستی لۆژیک بوووە و ئەگەر لیبیرالیزمی نوێ ئەوە قبووڵ بکات کە لە حەدیسەکان وەک یەکێک لە سەرچاوە فیقهییەکان هیچ جۆرە کەڵکێک وەرنەگرێت کە بناغەکەی لەسەر گومان دامەزرابێت، تەنها هاتووە پەیڕەوی لە یەکێک لە گەورەترین توێژەرانی فیقهی ئیسلامی کردووە. ناتوانین نکولی لەم واقیعە بکەین کە کۆکەرەوەکانی حەدیس بە پێداگریی لەسەر بایەخی حاڵەتەکانی هەستپێکراوی حەدیس لە بەرامبەر خوازیاریی بۆ ئەندێشەی رەها لە ئاییندا گەورەترین خزمەتیان کردووە بە فیقهی ئیسلامی. ئەگەربێتو بە شێوەیەکی ئاگایانەتر لە حەدیسەکاندا توێژینەوە بکرێت بەو شێوەیە کە پێغەمبەر وەحی خۆی لێک دەدایەوە، هێشتا دەتوانێت یارمەتیەکی گەورە بێت بۆ تێگەیشتن لە بایەخی ژیان بەخشی بنەما شەرعی و یاساییەکان لە قورئاندا. تەنها تێگەیشتنی گشت لایەنە لە بایەخی حەدیسەکانە کە دەتوانێت ئێمە تەیار و ئامادە بکات بۆ هەوڵەکانمان لە لێکدانەوەی بنەما سەرەکییەکانی ئایین.

**ج- ئیجماع**

سێهەمین سەرچاوەی ئیسلامی ئیجماعە، کە بە باوەڕی من لەوە دەچێت گرنگترین چەمکی یاسایی بێت لەناو ئیسلامدا. سەیر لەوەدایە کە ئەم ڕەنگە گرنگترین چەمکی ئیسلامە، لەهەمانکاتدا کە لە سەدری ئیسلامدا ببوو بە هۆی دروستبوونی گەلێک باس و موناقەشەی زانستی بەڵام پاشان لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا بە ڕاستی تەنها وەک ئەندێشەیەکی ڕەها مایەوە و بە دەگمەن ئەگەر ببێت بە سیستمیکی سەقامگرتوو. ڕەنگە گۆڕانی و بوون بە سیستمێکی یاسادانانی جێگر لەگەڵ بەرژەوەندی سیاسی حکومەتە ڕەهاکاندا دژایەتی هەبوو. جۆری ئەو حکومەتانەی کە خێرا لە دوای خەلیفەی چوارەم لە جیهانی ئیسلامدا گەشەی کرد. پێموایە بەرژەوەندی خولەفای ئومەوی و عەباسی زیاتر لەوەدابووە کە هێزی ئیجتیهاد لەناو موجتەهیدە جیاوازەکاندا بڵاو بکاتەوە بۆ ئەوەی کۆمەڵێکی سەقامگرتوو لەوان دروست نەبێت کە نەوەک لە کۆتاییدا هێز و دەسەڵاتەکەی ببێتە هۆی گرفتی ئەوان. زۆر دڵخۆشکەرە ئەگەر سەرنج بدەینە ئەوەی کە گوشاری هێزەکانی جیهانی نوێ و ئەزموونی سیاسی نەتەوە ئەوروپاییەکان ئەم کاریگەریەتییەی لە سەرزەینی مسوڵمانەکان داناوە تاکو لە بایەخ و ئیمکانیاتی ئەندێشەی ئیجماع تێبگەن. گەشەی ڕۆحی کۆمەڵایەتی و دروستبوونی بەرەبەرەی ئەنجومەنەکانی یاسادانان لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا هەنگاوێکی مەزن بووە بۆ پێشکەوتن. بە سەرنجدان بە گەشەکردنی فیرقە دژەکان و هەروەها کۆبوونەوەی هێزی ئیجتیهادی نوێنەرانی جیاوازی قوتابخانە فیقهییەکان لە یەک مەجلیسی یاسادانانادا دەردەکەوێت کە ئەوە تەنها شێوازێکە کە ئیجماع دەتوانێت لە کاتی ئێستادا هەیبێت. بۆ ئەوەی کە

لەم ڕێگەوە ئیمکانیاتی بەشداریی ئەو تاقمە لە خەڵکی ئاسایی لە باسە شەرعی و یاساییەکاندا ساز بکات کە ڕوانگەیەکی ڕۆشنیان هەیە سەبارەت بە بابەتە ئیسلامییەکان. تەنیا لەم ڕێگەوەیە کە دەکرێ ڕۆحی نووستووی دەزگای فیقهی بخەینە گەڕ و چالاکی بکەین و کامڵی بکەین. نابێ ئەوە فەرامۆش بکەین کە ئەم کارە لە هیند وێدەچێت لەگەڵ هەندێ گیروگرفتدا ڕووبەڕوو بێت. جێگەی گومانە کە مەجلیسێکی یاسادانانی نائیسلامی بتوانێت بۆ هێزی ئیجتیهاد ئەرک دیاری بکات.

سەبارەت بە ئیجماع یەک دوو پرسیار دێتە ئاراوە کە دەبێ بکرێت و وەڵامی بدرێتەوە. یەکەم ئەوەی کە ئایا بابەتێک کە بەرهەمی ئیجماعە دەکرێ ناسخی حوکمی قورئان بێت؟ دەزانم کە هێنانە ئارای وەها پرسیارێک بۆ بیسەرانی مسوڵمان بە تەواوەتی بێ مانایە، بەڵام هێنانە ئارا و وەڵامدانەوە بەوە بە هۆی ئەوە بە پێویست دەزانم کە ڕەخنەگرێکی ئەورووپایی ئەم بابەتەی بە شێوازێکی زۆر نادروست لە کتێبێکدا بە ناوی بنەماکانی ئابووری ئیسلامی باسکردووە. کتێبێک کە زانکۆی کۆلۆمبیا بڵاوی کردۆتەوە. ئامادەکاری ئەم کتێبە بێ ئەوەی کە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو بخاتە ڕوو دەڵێت بەپێی وتەی هەندێک لە نووسەرانی حەنەفی و موعتەزیلی، بابەتی بەرهەمهاتووی ئیجماع دەتوانێت ناسخی ئەحکامی قورئان بێت، بۆ وەها بیروڕا دەربڕینێک نەک ناکرێ بچووکترین تەئید لە ناو دەقەکانی فیقهی ئیسلامییدا بدۆزینەوە، بەڵکو تەنانەت حەدیسێکیش لە پێغەمبەر لەئارادا نییە کە لەخۆگری وەها چەمکێک بێت، وادێتە بەرچاوم کە بەکاردبردنی وشەی "نسخ" لە نووسراوەکانی فیقهی کەوندا ئەو ئامادەکارەی تووشی بەلاڕێدا چوون کردبێت. هەروەک چۆن **ئیمام شاطبی** لە بەرگی سێهەمی الموافقات،

لاپەڕەی ٦٥ دا ئاماژە بەوە دەکات کە سەردەمێک ئەم وشەیە لە باسگەلی پەیوەست بە ئیجماع لە لایەن سەحابەکانەوە بەکاردەبرا و ئەوەش تەنها هێزیک بووە کە دەیتوانی بەکاربردنی حوکمی قورئان بەربڵاوتر یان سنووردار بکات. ئەم وشەیە بەو واتایە نەبووە کە دەکرێ لە جیاتی ئەحکامی قورئانی حوکمێکیتر دابنرێت یان مەنسووخی بکەین. تەنانەت بۆ بەکاربردنی ئەم هێزەش هەر وەک چۆن **ئامدی**، زانای شافیعی لە ناوەڕاستی سەدەی حەوتدا کۆچی دوایی کرد دەڵێت و لە بەرهەمێکیشدا کە لەم دواییانە لە میسر بە چاپ گەیشتووە باس کراوە کە: بنەما فیقهییەکان بە ئاشکرا دەریدەخەن کە صەحابە دەبووا حوکمێکیان بەدەستەوە بێت بۆ ئەوەی کە ئەوان بەرپرسیار بکات سەبارەت بە سنووردار یان بەربڵاوکردنی ئەحکامی قورئانیی.

پرسیارێکیتر کە دێتە ئاراوە ئەمەیە کە وای دابنێین کە ئەصحابی ئیجماع لەسەر بابەتێکی تایبەت رێککەوتبێتن، ئایا جیلەکانی دوایی دەبێ بە ناچاری ئەو دەنگەی ئەوان قبووڵ بکەن؟ **شەوکانی** باسێکی چڕ و قووڵی لەم بارەوە هەیە کە لەوێدا بیروڕا جیاوازەکانی زانایانی قوتابخانە جیاوازەکان دەهێنێتە ئاراوە.. وابزانم کە پێویستە جیاوازییەک دابنێین لە نێوان دەنگی ئەصحابی ئیجماع سەبارەت بە بابەتە دیارەکان و هەروەها ئەو بابەتانەی کە شەرعی و یاساییە. لە خاڵی یەکەمدا بۆ وینە، وێدەچێت ئەم پرسیارە بێتە ئاراوە کە ئایا ئەو دوو سورەتە بچووکەی کە لە کۆتایی قورئاندا هاتووە و بەناوبانگە بە"معوذتین"بەشێکە لە قورئان یان نا؟ کاتێک صەحابە دەنگی دا لەسەر ئەوەی کە ئەوانە بەشێکن لە قورئان، ئێمە دەبێ ملکەچی ئەو دەنگە بین. دیارە کە بارودۆخی ئەوان بەشێوەیەک بووە کە ئاگاداری ئەو بابەتە

ئاشکرایه بوون. سەبارەت بە خاڵی دوایی، تەنها بابەتی لێکدانەوەی بابەتەکان دێتە ئاراوە و منیش وەک **کەرخی** بیر دەکەمەوە کە جیلەکانی داهاتوو ناچار نین کە دەنگی ئەصحابی ئیجماعی بەر لە خۆیان قبووڵ بکەن. **کەرخی** دەڵێت:"سوننەتی ئەصحابی ئیجماع لەو بابەتانەدا قبووڵ دەکرێت کە نەکرێ ئەوانە لە رێگەی قیاسەوە چارەسەر بکەین، بەڵام ئەگەربێتو بابەتێک بە قیاس دەربکەوێت، ئەوکات پێویستمان پێی نییە".

پرسیارێکیتر کە دەتوانێت سەبارەت بە چالاکی یاسادانانی مەجلیسی ئیسلامیی نوێ لە ئێستادا بێتە ئاراوە ئەمەیە کە چۆن دەکرێ زۆربەی وەها مەجلیسێک لەو کەسانە پێکهاتبێت کە هیچ جۆرە زانیارییەکیان لە فیقهی ئیسلامی نەبێت. وەها مەجلیسێک وێدەچێت لە کاری لێکدانەوەی بابەتە فیقهییەکاندا تووشی هەڵە بێت. چۆن دەتوانین بەر بگرین بە هەڵەکردن لە لێکدانەوەی بابەتە فیقهییەکاندا یان لانی کەم ئەو هەڵانە کەمتر بکەین؟ لە یاسای بنەڕەتی ساڵی ١٣٢٤ کۆچی مانگی ئێراندا پێشبینی لیژنەیەکی پێکهاتوو لە زانایانی ئیسلام کراوە کە"ئاگاداری پێویستییەکانی زەمەن"بن و سەربەخۆ لە پەرلەمانن و بەدەسەڵاتەوە چاودێری پرۆسەی یاسادانان دەکەن. بە باوەڕی من ئەم شێوازە بە سەرنجدان بە بنەماکانی یاسای بنەڕەتی ئێران خاڵێکی پێویستە. بەپێی ئەو یاسایە پادشا تەنها پارێزەری وڵاتێکە کە لەڕاستییدا تایبەتە بە ئیمامی غائب. زانایانی ئیسلام وەک نوێنەرانی ئەو ئیمامە خۆیان بەرپرسیار دەزانن کە بەسەر گشت ژیانی کۆمەڵگەدا چاودێرییان هەبێت.

بە هەر شێوە پێوەری بنەماکانی یاسای بنەڕەتی ئێران دەکرێ بەشێوەیەکی کاتی لە وڵاتە سونی مەزهەبەکاندا بخرێتە بەر تاقیکاریی.

زانایانی ئیسلام دەبێ بەشی سەرەکی و گرنگی مەجلیسی یاسادانانی ئیسلامی پێکبهێنن و بۆ باسکردنی ئازاد لە بابەتە فیقهی و یاساییەکاندا یارمەتیدەر بن و ڕێنموونی بکەن. تەنها دەرمانێک کە بۆ پارێزگاریی لە هەڵەکردن بۆ لێکدانەوەی بابەتە یاساییەکان دەبێتە هۆی چاکبوونەوە، ئەم بابەتانەیە: چاکسازیی لە ناو سیستمی هەنووکەیی ڕاهێنان و پەروەردەی فیقهی لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا، بەربڵاو کردنی بوارەکەی و پەیوەندیدانی بە بنەما نوێکانی یاساوە کە دەبێ بە موتالایەکی ئاگایانەوە بکرێت.

**د- قیاس**

چوارەمین بناغەی فیقهی ئیسلامی قیاسە و مەبەست لەوە دارشتنی ئەحکامی فیقهییە لەسەر بنەمای ئیستدلالی قیاسی. وادێتە بەرچاو کە قوتابخانەی فیقهی **ئەبو حەنیفە**، بە سەرنجدان بە جیاوازییە کۆمەڵایەتی، کشتوکاڵی و مەعیشەتی کە لە وڵاتەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیسلامدا هەیە، بە گشتی هیچ خاڵێکی نەدۆزیوەتەوە کە ڕێنموونی کار بێت لە پێشینە تۆمارکراوەکانی حەدیسدا. ئەگەریش دۆزرابێتەوە زۆر کەم بووە. کەواتە تەنها ڕێگەی کراوە لە بەرامبەر حەنیفییەکاندا ئەوە بووە کە لە لێکدانەوەدا پشت ببەستن بە بیرکردنەوەی تیۆرێک. هەرچەند کەڵک وەرگرتن لە لۆژیکی ئەرەستۆیی بە دروستبوونی بارودۆخ و سەردەمی نوێ لە عێراقدا هاتە ئاراوە، بەڵام وێدەچێت کە لە قۆناغە سەرەتاییەکانی بڵاوبوونەوەی فیقهدا زۆر زیانبەخش بووبێت. چییەتی پێچەڵپێچی ژیان ناکرێ بخرێتە ژێر کاریگەریەتی"شداد"و"غلاط"ی لۆژیک کە لە یاسا گشتییەکانەوە سەرچاوە دەگرێت. لە ڕوانگەی

لۆژیکی ئەرەستۆییەوە ژیان خاوەنی میکانیزمێکی سادەیە کە بە هیچ جۆرێک شتێک بە ناوی حەرەکە لەوێدا بوونی نییە. کەواتە قوتابخانەی **ئەبو حەنیفە** مەیلی ئەوە بووە کە چاوپۆشی لە دوو هۆکاری ئازادی و ئیختیار لە ناو ژیاندا بکات. حەزی لەوە کردووە کە دەزگایەکی فیقهی بە تەواوەتی لۆژیک لەسەر بنەمای عەقڵی رەها دابڕێژێت. فەقیهەکانی حیجاز وەفایان بۆ رێ و رەسمی پراکتیکی نەژادەکەیان هەبووە. زۆر دەنگ دەربڕینی توندیان هەبووە دژ بە دەمارگرژیی"مدرسی"خاوەن دەنگەکان لە عێراقدا. بە ڕاستی وایان بیر دەکردەوە کە خوازیاریی زانایانی عێراق بە لەبەرچاوگرتنی خاڵی ناواقیعییەکان، ئەوە فیقهی ئیسلامی دەکاتە جۆرێک میکانیزمی بێ رۆح.

ئەم موجادەلە ناخۆشانە لە نێوان زانا سەرەتاییەکانی ئیسلامدا گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە سەبارەت بە سنوور و بارودۆخ و چاکسازیی قیاس، پێناسەیەکی رەخنەگرانە ئاڕاستە بکرێت. هەرچەند لە سەرەتادا ئاشکرا بوو کە لە ناخییدا بیر و روانگەی تاکی موجتەهیدەکان شاردراوەتەوە، بەڵام لە ئەنجامدا بووە سەرچاوەی ژیان و حەرەکە بۆ یاسا ئیسلامیەکان. رۆحی رەخنەی توندی **مالیکی و شافیعی** لە بنەمای قیاسی **ئەبو حەنیفە** کە بە یەکێک لە سەرچاوە یاساییەکانی ئیسلامی دەزانی، بەرگرێکی گرنگ بوو کە زانا سامییەکانی لە بەرامبەر زانا ئارییاییەکاندا دایانمەزراند. ئەوانەی کە زیاتر خوازیاری دەرهەستەنا بوون تا بەرهەستەکان و بەهرەی زیاتریان لە ئەندێشە وەردەگرت تاکو ڕووداوەکان. ئەم بابەتە لە ڕاستییدا موجادەلەی نێوان دوو گروپ بوو کە یەکیان لایەنگری شێوازی قیاس و ئەویدی لایەنگری شێوازی ئیستقرا بوون لە توێژینەوەی فیقهی و یاساییدا. خاوەن بیر و ڕاکان لە عێراقدا جەختییان دەکردە سەر لایەنی سەقامگرتووی"چەمک"لە حاڵێکدا

کە زانایانی حیجاز جەختییان دەکردە سەر لایەنی ناجێگر، بەڵام زانایانی حیجاز بە دروستی لە گرنگ بوونی بارودۆخی خۆیان تێنەگەیشتبوون. لایەنگریی سرووشتی ئەوان لە سوننەتی یاسایی حیجاز بووە حیجابێک کە کەوتە نێوان روانگەی ئەوان و ئەو شێوازانەی کە لە ڕاستییدا لە سەردەمی پێغەمبەر و صەحابەکەیدا باو بووە. گومانێکی تێدا نییە کە ئەوان ئاگاداری بایەخی واقیع و بەرهەستەکان بوون، بەڵام لە هەمانکاتدا لایەنی سەقامگیر و هەتاهەتاییان پێ دەبەخشی. بە دەگمەن روویان بکردایە قیاسی دامەزراو لەسەر توێژینەوەی دەرهەستەکان بەو شێوەی کە لەڕاستییدا هەن. لەوە دەچوو کە واقیع و دەرهەستەکان بەو رەخنەی کە لە **ئەبو حەنیفە** و قوتابخانەکەی کرا، لە کۆت و بەندی بنەماکانی ئەو رزگارییان بوو و لە دوای ئەوە پێویستیی روانین بۆ حەرەکەی واقیعی و گشت چەشنی لە بابەتە فیقهییەکاندا هاتە ئاراوە. کەواتە قوتابخانەی **ئەبو حەنیفە** کە ئاکامی ئەم موجادەلە و باسانەی بە تەواوەتی رێکخست، بە شێوەی رەها لە ناو بنەما سەرەکییەکانیدا ئازادی بەخشی و بووە خاوەنی هێزێکی هاوئاهەنگی زیاتر بە نیسبەت دیکەی قوتابخانە فیقهییەکانیتر.

بە پێچەوانەی رۆحی قوتابخانەکەی، زانا حەنەفییە نوێکان لێکدانەوەی بناغەداڕێژی مەزهەبی حەنەفی یان ئەصحابی نزیکی ئەویان لە بابەتە ئایینیەکاندا بە نەگۆڕ و هەتاهەتایی دەزانی. رێک هەمان بیر و ڕا کە رەخنەگرە سەرەتاییەکانی ئەبو حەنیفە سەبارەت بە بیروڕا و فەتواکانی خۆیان بە نیسبەت دەرهەست و بەرهەستەکان هەیانبوو. **شافیعی** دروست دەبێژێت کە ئەگەر بنەمای گرنگی قیاس بە باشی و ساغی بەکار ببرێت، رێک هەمان ئیجتیهادە کە لە چوارچێوەی کتێبی

ئاسمانییدا ئازادی تامی هەیە. بۆ باسکردن لە گرنگبوونی تەنها ئەم خاڵە بەسە کە **قازی شەوکانی** دەڵێت: بەپێی گێڕانەوەی زۆربەی زانایان شێوازی قیاسی تەنانەت لە سەردەمی پێغەمبەریشدا ڕێگیە پێ دراوە. داخستنی دەرگای ئیجتیهاد قسەیەکە کە زیاتر لە ئەفسانە دەچێت. ئەمەش نیوەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرخستنە ناو بەرهەستەکان و نیوەکەیتری دەگەڕێتەوە بۆ تەنبەڵی ئەندێشە بەتایبەت لە سەردەمی دارمانی بابەتە ئایینیەکاندا دێتە ئاراوە و بوتێک لە بیرمەندە مەزنەکان ساز دەکات.

ئەگەر هەندێ لە بیرمەندان ئەم ئەفسانەیان تەئید کردووە، با نەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەمڕۆکە ئیسلام واز لە سەربەخۆیی فیکریی خۆی بهێنێت. باوەڕی"سرکشی"زانای سەدەی دەیەم دروستە کە دەڵێت:"ئەگەر مەبەستی ئەوانەی ئەم ئەفسانەیان بەلاوە پەسەندە ئەمە بێت کە نووسەرە قەدیمییەکان خاوەنی ئیمکانیاتی زیاتر بوون و ئەو گرفتانەی کە لەبەردەم نووسەرانی ئێستادا هەیە زیاترە، وتەیەکی بێ مانایە. تێگەیشتن لەم خاڵە کە ئیجتیهاد بۆ زانایانی ئێستا ساکارترە لە زانایانی پێشوو، پێویستی بە خۆماندووکردنێکی وەها ناکات. بەڕاستی ئەو لێکدانەوانەی کە سەبارەت بە قورئان و سووننەت کراون ئەمڕۆکە ئەوەندە زۆر و پڕ ئەژمارن کە موجتەهیدی ئەمڕۆکە سەرچاوە و ئاخێزگەی فیکریی زۆرتریان لەبەردەستدایە تەنانەت زیاتر لەوەی کە لێکدانەوەیەک پێویستی پێیەتی".

هیوادارم کە ئەم باسە کورتە بۆ ئێوەی ڕوون کردبێتەوە کە لە بنەما سەرەکییەکان و لە دەزگای فیقهی ئێمەدا بەم شێوەیە کە ئەمڕۆ هەیە، پێشتر شتێک نەبووە کە هاوتەرازی بارودۆخی ئەم زەمانە بێت. ئەگەربێتو جیهانی ئیسلام خۆی تەیار بکات بە ئەندێشەیەکی کاریگەر و

ئەزمـوونێکی نوێیـوە، دەتوانێت بـە متمانـە و ئازایانـە هـەنگاو بنێتـە نـاو ڕێگەیەکەوە کە بۆ سازکردنەوەی فیکری ئایینی لـە بـەردەمییدایـە. کاری سازکردنەوە لایەنێکی جدییتری هەیە لە خۆ سـازگارکردنی ڕەهـا لـەگـەڵ بارودۆخی نوێی ژیاندا. ئەو شـەڕە قورسیە کـە لـە ئەوروپـا سـەریهـەڵدا بـووە هـۆی لـە خـەو هـەسـتانی تورکیـا و هـەر بـەو شـێوەیـە کـە لـەم دواییانـەدا نووسـەرێکـی فـەرەنـسی باسـی کـردووە. هـەسـتان بنـەمـای سـەقـامگرتوویی و ڕاوەسـتانە لـە جیهـانی ئیـسلامدا. ئـەو ئـەزموونـە ئابوورییە نوێیەی کە لە دراوسێیەتی ئاسیای مسوڵماندا ساز درا دەبێ چـاوەکانمـان بکاتـەوە بـۆ ئـەوەی کـە بـاش لـە واتـای نـاخی ئیـسلام و چارەنووسەکەی تێبگەین. ئەمڕۆکە مرۆڤایەتی پێویستی بە سێ شتە: لێکدانـەوەیـەکـی مـەعنـەوی لـە جیهـان، ڕزگـاربوونی مـەعنـەوی تـاک و بنـەماگـەلێکی بنـەڕەتی بـە گرنگایـەتییـەکی جیهانییـەوە کـە بێت و کامڵ بوونی کۆمـەڵی مرۆڤ لەسەر بنـەمـای مـەعنـەویـەت ڕێنمـوونی بکـات بێ هـیچ شـک و گومانێـک ئەوروپـای ئـەمڕۆیـی لـەم ڕێگـەوە دەزگاگـەلـی مەعنەوی و ئایدیالیستی ساز کردووە.

ئەزموون ئەوەمان پیشان دەدات کـە حـەقیقـەتی سـەرچـاوەگرتـوو لـە عەقڵی ڕەهـا بۆ ئـەوەی پشکۆی ئیمـان و بـاوەڕ هـەڵگیرسێنێت خـاوەنی هێز و توانای ئیلهامی تاکی نییە. ئـەمـەش هۆیـەکە بۆ ئـەوەی کـە بزانین ئەندێشەی ڕەهـا کاریگـەریـەتیـەکی زۆر کـەمـی هـەبووە لـە سـەر ژیـانی مرۆڤدا لە حاڵێکدا کە ئیمان بـەردەوام مرۆڤـەکانی بـەرەو بـاڵا بـردووە و گـشت کۆمــەڵگــەی تووشــی گۆڕانکــاریی کــردووە. ئایدیالیـست بــوونی ئەوروپا هەرگیز نەبووە هۆکارێکی زیندوو بۆ ژیـانی ئـەو وڵاتانـە بـەڵکو ئـەنجامـەکـەی بـووە ئـەوەی کـە ئێستاکە"خـود"ێکـی سـەرلێشێواو بـۆ دۆزینـەوەی خـۆی لـە نێوان دیمۆکراسییە دژەکانـدا دەسـوڕێتەوە. ئـەو

دیمۆکراسیانەی کە ئەرکێکیان نییە بێجگە لەوەی کە هەژاران بچەوسێننەوە و بۆ بەرژەوەندی دەوڵەمەندەکان کار بکەن. ئەم قسە لە من قبووڵ بکەن کە ئەمڕۆکە ئەورووپا گەورەترین لەمپەرە لە بەردەم پێشکەوتنی ئەخلاقی مرۆڤدا.[١]

لەولاوە ئایدیالیزمی ئیسلامی خاوەنی ئەم ئەندێشەیە کە لەسەر وەحی دامەزراوە و لە قووڵترین لایەنەکانی ناخی ژیانەوە دەدوێت و قووڵایی دەبەخشێت بە دیارترین ڕوخسارەکانی. هەر مسوڵمانێک بناغەی ژیانی خۆی لە سەر باوەڕ دادەنێت و بە ئاسانی ژیانی خۆی لەسەر ئەوە ساز دەکات.

بە سەرنجدان بە باوەڕی بنەڕەتی ئیسلام کە هاتنی وەحی بە کۆتایی دەزانێت، هیچ سنوورێکی تازەی بۆ ساز نابێت. بەم شێوەیە مسوڵمانان دەبێ لە باری رۆحییەوە ئازادترین خەڵکی سەر گۆی زەوی بن. موسوڵمانەکانی سەرەتا کە لە کۆت و بەندی رۆحی ئاسیای بەر لە ئیسلام رزگاریان بوو لە بارودۆخێکدا نەبوون کە بتوانن لە گرنگایەتی ئەم باوەڕە بنەڕەتییە تێبگەن. مسوڵمانانی ئەمڕۆکە دەبێ ئاگاداری بارودۆخ و جۆری ژیانیان بن و ژیانی کۆمەڵایەتی خۆیان لە ژێر تیشکی بنەماگەلێکی نیهاییدا ساز بکەنەوە و لە مەبەستی ئیسلام تێبگەن کە تا ئێستا نەیانناسیوە و گەشە بدەن بە دیمۆکراسی مەعنەوی کە ئامانجی کۆتایی ئیسلامە.

---

[1]- زبور عجم

## ئایا ئایین ئیمکانی هەیە؟

دەکرێ ژیانی ئایینی بە گشتی دابەش بکرێتە سەر سێ قۆناغ و ناوی "ئیمان"، "ئەندێشە" و "دۆزینەوە"یان لێ بنێین. ژیانی ئایینی لە قۆناغی یەکەمدا لە شێوازی دەستووری ڕێکخستنە کە تاک یان گشت تاکەکان دەبێ ئەوانە وەک فەرمانێکی بێ ئەم لاولا قبووڵ بکەن و هیچ شک و بیرکردنەوەیەکیان نەبێت سەبارەت بە مەبەستی نیهایی و ئەنجامی ئەو دەستوورە. ئەم بارودۆخە دەتوانێت ئەنجامێکی گەورەی هەبێت لە مێژووی کۆمەڵایەتی و سیاسی نەتەوەیەکدا،بەڵام لە گەشەکردن و پێشکەوتنی مەعنەوی تاکێکدا کاریگەریەتییەکی وەهای نییە. لە دوای ملکەچی ڕەها لە فەرمانەکانی ڕێکخستن، قۆناغی بیرکردنەوە سەبارەت بە دەستوورەکان و ڕامان لە سەرچاوەی کۆتایی دەسەڵاتی ئەو ڕێکخستنە دێتە ئاراوە. ژیانی ئایینی هەوێنی خۆی لەم قۆناغەدا لەسەر جۆرێک مێتافیزیک دادەمەزرێنێت. ئەمە ڕوانگەیەکی لۆژیکە سەبارەت بە جیهان کە بەشێک لەوە بریتییە لە ناسینی خودا. لە قۆناغی سێهەمدا دەروونناسیی دەبێتە جێگری مێتافیزیک و ژیانی ئایینی حەز و مەیلی پێوەندی ڕاستەوخۆ لەگەڵ حەقیقەتی ڕەهادا زیاتر دەکات. ئاوەهایە کە ئایین دەبێتە هۆیەک بۆ هاوئاهەنگی و ڕاکێشانی هێزی ژیان و دەسەڵات و تاک بێ ئەوەی کە لە بازنەی یاسای شەرع تێپەڕ بێت بە دۆزینەوە و وەرگرتنی شەریعە کە لە ناخی خودئاگای ئەودا

بـوونی هـەیـە دەبێتـە خـاوەنـی کـەسـایەتییـەکـی ئـازاد. هـەروەک چۆن سۆفیەکی مسولْمان دەڵێت: "ئەگەر تاکی ئیماندار لـە کـاتی خوێندنـەوەی قورئاندا خۆی لەو حاڵەتەدا نەبینێتەوە کە وەحی بەسـەر پێغـەمبـەردا نازڵ بوو، ناتوانێت لە کەلامی خودا تێبگات". مەبەستم لـە وشـەی ئـایین لەم پرسیارەدا کە ئایا ئایین ئیمکانی هەیە، بە سـەرنجدان بـەم قۆناغـەی سێهەمی کامڵبوونی ژیانی ئایینیە. واتـای ئـایین بـە داخـەوە لـەم قۆناغـەدا لەگەڵ دەروێشبووندا تێکەڵ بووە و وا بیر دەکەنەوە کە ژیان نەفی دەکـات و لـە واقیعـەکـان خـۆی دوور دەخاتـەوە و لـەگـەڵ جیهـانبینی سەردەمی ئێمەدا دژایەتی و بەرەوڕووبوونەوەی هەیە.

ئیقبال لە جاویدنامەدا دەڵێت:

**بی تجلـی مرد دانا ره نبــرد**

**از لگد کوب خیال خویش مرد**

بی تجلی زندگی رنجوری است عقل مهجوری و دین مجبوری است

ئایینی پێشکەوتوو کە تەنها بە شوێن ژیانی پێشکەوتووەوەیە، زۆر زیاتر لەوەی کە زانست لەوەها شتێک تێبگات، پێویستبوونی ئـەزموون وەک بناغـەی ژیـان دەخاتـە بـەر سـەرنـج. ئـایین هـەوڵ و تێکۆشـانێکی بنـــەڕەتییـــە بـــۆ پـــالافتنی خودئاگـــایی مـــرۆڤ و هـــەربۆیـــە هـــەروەک سرووشتخوازیی بە روانگەیەکی رەخنەگرانەوە سەرنج دەداتـە ئاستی ئەزموونی خۆی.

هەموومان دەزانین کە یەکەمجار کانت ئـەم پرسیارەی هێنایـە ئـاراوە کە "ئایا مێتافیزیک ئیمکانی هەیە؟" وەلامی ئەو بەم پرسیارە نگەتیڤە و هۆکانیـشی رێـک لـەگـەڵ ئـەو حـەقیقـەتانـەی کـە مـەبـەسـتی ئایینـە یەکدەگرێتەوە. بەپێی باوەڕی ئەو بۆ ئەوەی مرۆڤ مەعریفەیەکی دەست بکەوێت دەبێ چەندین هەست بارودۆخی رواڵـەتی و دەرەکی

درک بکەن. ئەو شتەی کە **کانت** بە "شی فی النفسە" ناوی دەبات ئەندێشەیەکە کە تەنها سنوور لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت و ئەرک و کردەوەکەی تەنها ڕێکخستنە. ئەگەر واقیع و پراکتیکێک هاوتای ئەندێشە بوونی هەبێت لە دەرەوەی چوارچێوەی ئەزموون دادەنرێت و هەر بۆیە بوونی ئەوە لە باری عەقڵیەوە ناسەلمێندرێت. ناکرێ بە ئاسانی ئەم بیرۆکەی **کانت** قبووڵ بکەین. بە سەرنجدان بە پێشکەوتنی زانیاری نوێ، وەک ئەو بابەتەی کە چییەتی مادە بە"شەپۆلی نوورانی کۆکراوە"دەزانێت و ئەم فیکرە سەبارەت بە عالەم کە کردەوەیەکە لەدایکبووی ئەندێشەیە و هەروەها ئەو بیرۆکەی کە شوێن و زەمەن بەرتەسک و سنووردار دەبینێت، بە سەرنجدان بە بنەمای"عدم قطعیت"ی **هایزنبێرگ** سەبارەت بە جیهان ئەم ئەنجامەمان دەست دەکەوێت کە هەبوونی دەزگایەکی عەقڵی خوداناسیی هەر بەو جۆرەی کە کانت بیری لێدەکردەوە، بابەتێکی خراپ نییە. بە سەرنجدان بەو مەبەستەی کە لەم باسەدا بە شوێنییەوەین پێویست ناکات بڕۆینە ناو وردەکارییەکانەوە. لەبەرئەوەی کە "شی فی النفسە" بە هۆی بوونی لەو پەڕێ سنوورەکانی ئەزموونەوە، بۆ عەقڵی ڕەها دەست نادات، لەم حاڵەتەدا ڕوانگەی **کانت** تەنها کاتێک قبووڵ دەکرێت کە لە بنەڕەتەوە وایدابنێین کە هەر ئەزموونێک بێجگە لە ئەزموونە باوەکان ئەستەمە. کەواتە پرسیارێک دەمێنێتەوە ئەویش ئەمەیە کە ئایا جۆری باوی ئەزموونکردن تەنها جۆرێکە کە لەوێوە مەعریفەمان دەست دەکەوێت؟

ڕوانگەی کانتمان سەبارەت بە (شی فی النفسە) و شتەکان هەر بەوجۆرەی کە هەن، کانت ئەوە بە نموود باس دەکات، بۆ ئێمە دەردەکەون. ئەمەش تارادەیەکی زۆر تایبەتمەندی پرسیاری ئەو

سەبارەت بە ئیمکاندار بوونی میتافیزیک دەردەخات. ئەگەربێتو بارودۆخ پێچەوانەی ئەو شتە بێت کە مەبەستی **کانت** بووە، چ دەبێت؟

عارف و فەیلەسووفی گەروەی جیهانی ئیسلام **مەحیەدین بن عەرەبی** ئەندۆلۆسی بە کراوەیی بیرێک کە هەیبووە وتوویەتی کە خودا بینراو و هەست پێکراوە و جیهان وێنە و بۆچوونی ئێمەیە. **عەراقی**، بیرمەند و شاعیری موسڵمان و عارفیش جەخت دەکاتە سەر جۆراوجۆری شێوەکانی شوێن و زەمەن و باس لە زەمەن و شوێنی ئیلاهی دەکات. ئەو بابەتەی بە جیهانی دەرەکی دەیناسین وێدەچێت تەنها دروستکراو و فیکری عەقڵ بێت و ئەم ئیمکانەش لە ئارادایە کە جۆرەکانی دیکەی ئەزموونی مرۆڤ بتوانن بە شێوەکانیتری شوێن و زەمەن بە شێوەی بنەڕەتی بوونیان هەبێت. لەوانەدا رەنگە ئیماژ و شیکاریی خاوەنی ئەو رۆڵە نەبن کە لە ئەزموونی باوی ئێمەدا هەیانە. کەواتە دەبێ بڵێین کاتێ وێنەکان نەتوانن ئاستێک لە ئەزموون درک بکەن، ناچار ناتوانن مەعریفەیەکی گشتیش بۆ مرۆڤ دەست بخەن. لەبەرئەوەی کە ئیماژەکان قابیلی ئەوە هەن کە ببنە بابەتیکی کۆیی و دەتوانن کۆمەڵێک لە چەند ئیماژ پێک بهێنن. هەروەک بارودۆخی کەسێک کە بۆ بەدەستهێنان و درکی حەقیقەت تەنها پشت دەبەستێت بە ئەزموونی ئایینی و هەمیشە دەبێ بە ئەزموونێک کە ناگوێزرێتەوە تەنها بمێنێتەوە. ئەگەر مەبەست لەم وتەیە ئەوە بێت کە کەسی سۆفی بە تەواوەتی لە ژێر کاریگەریەتی شێوازەکان و فیکر و چاوەڕوانییە سوننەتیەکانی خۆیەتی ئەمە تارادەیەک قبووڵ دەکرێت. کۆنسێرڤاتیو بوون لە ناو ئاییندا بەو ڕادەیە خراپە کە لە دیکەی لقەکانی چالاکییەکانی مرۆڤیشدا خراپە. ئازادی داهێنەرانەی من لەناو دەبات و دەبێتە لەمپەرێک لە بەرامبەر حەرەکە مەعنەوییە نوێکاندا. ئەمە خۆی هۆیەکی

گرنگە کە بۆچی شێوازە سۆفیانەکانی سەدەکانی ناوەڕاست ئیتر ئەو توانایەی جارانیان نییە بۆ باسکردن سەبارەت بە بنەما بنەڕەتیەکانی حەقیقەتی رەها، بەڵام ئەوەی کە ئەزموونی ئایینی ناکرێ بگوازرێتەوە بەو واتایە نییە کە حەقیقەت خوازیی مرۆڤ لە رێگەی ئایینەوە بێهوودە و بێ کەڵکە. لە ڕاستیدا ئەوەی کە ئەزموونی ئایینی ناگوێزرێتەوە ئیمە بەرەو زاتی بنەڕەتی "من" دەبات. وەک ئەوەی لە ژیانی ئاسایی خۆماندا لە خەڵک پچرابێتین و لە تەنیاییدا بژین. بۆ دەست گەیشتن بە دەرونیترین حاڵەتەکانی تاکی مرۆڤ هیچ بایەخیک دانانێین و ئەوانە بە ئەرکی رەها دەزانین و تەنها ئاورِ لەو لایەنە دەدەینەوە کە دێتە خەیاڵمان.

تەشقی ژیانی ئایینی کاتێکە کە "من" بە شێوەی تاکێکی قووڵتر لە چەمکی خودی ئاسایی و باو بەپێی خو و خەسڵەتەکانی دەدۆزێتەوە. کاتێ من لەگەڵ باڵاترین حەقیقەتدا پەیوەندی دەگرێت لەو حاڵەتەدا لە بێ هاوتایی، پێگە و بایەخی مێتافیزیکی و هەروەها ئیمکانی چاکسازیی خۆی تێدەگات. بە واتایەکی ورد، ئەزموونێک کە دەگاتە ئەم دۆزینەوە لە بابەتە عەقلّیەکانەوە نەهاتووە، بەڵکو بابەتێکی ژیانبەخش و بەرهەمهاتووە لە گۆڕانکاریی و حەرەکەیەکی ناخی مرۆڤ کە لە زیندەوەرناسییەوە هاتووە و ناتوانێت لە کۆت و بەندی مەقوولاتی لۆژیکدا بێت. تەنها لەناو کردەوە و پراکتیکێکدا خۆی نیشان دەدات کە پێکهێنەر و خوڵقێنەری جیهانە و تەنها بەم شێوەیە کە ناوەرۆکی ئەم ئەزموونە کە بێ بەرییە لە زەمەن، دەتوانێت خۆی بخاتە ناو گەڕیانی زەمەن و بە شێوازێکی درەوشاوە لە بەرامبەر چاوەکانی مێژوودا دەرکەوێت. وا دەزانین کە حەقیقەت لە رێگەی ئیماژ کردنەوە ناخرێتە بەرباس و ئەمە فۆرمێکی زانستی و ورد نییە. زانست بەلایەوە گرنگ

نییە کە ئایا ئەلیکترۆن بوونێکی راستەقینەیە یان نا؟ دەتوانێت سەمبۆلێک یان رێکەوتنێکی رەها بێت. ئایین کە لە بنەڕەتدا کوالیتەیەکی ژیانی راستەقینەیە تەنها رێگەی دروستی باسکردن لە حەقیقەتە. لەبەرئەوەی کە ئەزموونیکی سەرترە، ئیماژەکانی ئێمە سەبارەت بە خودا چاک دەکاتەوە یان بە لانی کەمەوە ئێمە بە نیسبەت پرۆسەی عەقڵی رەهاوە کە ئەم ئیماژانە دروست دەکات، تووشی گومان دەکات و رادەمێنین. زانست ئەو توانایەی هەیە کە بە تەواوەتی چاوپۆشی لە میتافیزیک بکات و تەنانەت دەتوانێت بە لێکدانەوەی **لانگ**، ئەوە بە "ڕوخساری عەقڵی شیعر" یان بە وتەی **نیچە** بە "یارییەکی پاساودراو بۆ بەساڵاچووان" ناو بەرێت. ئەو کەسەی کە ئاگاداری بابەتە ئایینیەکانە و بە شوێن دۆزینەوەی خۆیەتی لە ناخی شتەکاندا بە سەرنجدان بەو ئامانجە کۆتاییەی کە لە هەوڵەکانیدایە ناتوانێت خۆی رازی بکات بۆ ئەوەی ژیانی خۆی رێک بخات. بەوشتەوە کە زانست بە درۆیەکی ژیان بەخش یان ئەوەی کە بە"ئەگەر و رەنگە"ی دەزانێت. لەو کردەوەدا کە زانست دەیکات، ئەو شوێنەی کە پەیوەندی بە زاتی نیهایی حەقیقەتەوە هەیە، هیچ مەترسیەک هەڕەشەی لێ ناکات. بەڵام کردەوەیەک کە ئایین لەم بارەوە دەیکات، ئەوە ژیانی من، وەک ناوەندی هاوئاهەنگیی ژیان و ئەزموونەکان دەچێتە خانەی ئەو کردەوە. کردەوەکان کە چارەنووسی کۆتایی تاک بەوە بەستراوەتەوە، نابێ لەسەر وەهم دابمەزرێت. چەمکی هەڵەی عەقڵی دەبێتە هۆی ناسینی هەڵە. کردەوە و کرداری هەڵەش هەموو بوونی مرۆڤ بێ بایەخ دەکات. وێدەچێت ببێتە هۆی وێرانی ستراکچێری "من". چەمکی عەقڵی رەها تەنها کاریگەریەتی لەسەر بەشێک لە ژیان دادەنێت. کردار بە شێوەیەکی گەشە کردوو لەگەڵ حەقیقەتدا پەیوەندی هەیە و لە پێگەی نەگۆڕی گشت مرۆڤەوە بە

نیسبەت واقیع سەرچاوەی گرتووە. گومانێک لەوەدا نییە کە ئەگەر کردار واتە ئەو شتەی کە بەرهەمی پرۆسەکانی دەروونناسی و فیزیۆلۆژییە، بۆ گەیشتن بە پەیوەندی بێ واسیتە لە نێوان "من" و "حەقیقەتی نیهایی"دا ڕێگەیەکی نییە بێجگە لەوەی کە لە شێواز و لە ناوەرۆکدا تاقانە و تایبەت بێت. کاتێک دیتران بۆ دۆزینەوەی قازانجی ئەوە بۆ خۆیان، بە ناوی شێوازێک بۆ نزیکبوونەوە لە حەقیقەتی ژیان، ڕۆژەکان بەوەوە دەست پێدەکەن، ئەو کاتەیە کە دەتوانێت ببێتە بابەتێکی کۆمەڵایەتی.

هەبوونی زانایانی ئایینی لە گشت سەردەمەکان و گشت وڵاتە ئیسلامییەکاندا شایەتی ئەوەیە کە جۆرە جیاوازەکانی خودئاگایی لەناو ناخودئاگایی ئاسایی ئێمەدا هەیە. ئەگەر جۆری خودئاگاییەکان ئیمکانیاتی وەها پێک بهێنن بۆ ئەزموونێک کە ژیان بەخشە و مەعریفە ساز دەکات پرسیارێک دێتە ئاراوە، ئایا ئایین وەک ئەزموونیکی باڵا ئیمکانی هەیە و ئەم پرسیارە زۆر دروستە و شایانی ڕامان و بیرکردنەوەی زۆرە.

بەدەر لە دروستبوونی ئەم پرسیارە هۆی گرنگ هەیە کە بۆچی وەها پرسیارێک لەم سەردەمە لە مێژووی فەرهەنگی نوێ بێتە ئاراوە؟ لە قۆناغی یەکەمدا قازانجی زانستی ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە. وادێتە بەرچاو کە هەستی سرووشتخوازیی هەر فەرهەنگێک بە نیسبەت جیهان شێوازێکی تایبەتی خۆی هەیە و هەروەها وا دێتە بەرچاو کە هەر شێوازێکی سرووشتخوازیی دەگاتە جۆرێک ئەتۆمخوازیی. لە جۆرەکانی ئەتۆمخوازیی ئامادە، دەکرێ باس لە ئەتۆمخوازیی هیندی، یۆنانی و ئیسلامی و ئەتۆمخوازیی نوێ بکەین. ئەتۆمخوازیی نوێ تایبەتە و بیرکارییەکی هەیە کە جێی سەرسوڕمانە و جیهان وەک موعادیلەیەکی

دیفرانسییەلی ورد دەبینێت و زانستی فیزیاکەی بە شێوازی تایبەتی خۆی دەگاتە قۆناغێک کە بەڕاستی سەیرە. ئەم باسە دەمانگەیێنێتە ئەو شوێنەی کە بپرسین ئایا بێجگە لە پەیوەندی سنووردار لە نێوان هۆ و هۆکاردا هیچ لایەنێکیتر لە ناو سرووشتدا بوونی نییە؟ ئایا حەقیقەتی رەها ناتوانێت لە رێگەیەکی دیکەوە بەسەر خودئاگای ئێمەدا زاڵ بێت؟ ئایا شێوازی عەقڵانی رەها تەنها رێگەی زاڵ بوون بەسەر سرووشتدایە؟ **پرۆفیسۆر ئێدینگتۆن** دەڵێت:"ئێمە ئیعتراف بەوە دەکەین کە بنەماکانی زانستی فیزیای نوێ بە هۆی خەسڵەتەکەیەوە تەنها دەتوانێت بەشێک لە ڕوخساری حەقیقەت پێک بهێنێت، لەگەڵ بەشەکەیتردا چ بکرێت؟ ناتوانین بڵێین کە بۆ ئێمە ئەو بەشەیتر بایەخی کەمتری لە بنەما فیزیکیەکان هەیە. هەستەکان، مەبەست و بایەخەکان هەروەک بابەتە هەستپێکراوەکان خودئاگای ئێمە پێکدەهێنن. کاتێ سەیری درکە هەستییەکانمان دەکەین دەبینین کە ئێمە رێنموونی دەکەن بۆ جیهانێکی دەرەکی و کاتێک دەچین بە شوێن توخمەکانی دیکەی جیهاندا تێدەگەین کە ئێمە بەرەو جیهانی شوێن و زەمەن نابەن بەڵکو بێگومان بەرەو شوێنێکیترمان دەبەن".

لە قۆناغی دووهەمدا دەبێ سەرنج بدەینە بایەخێکی زانستی فراوان کە ئەم پرسیارە لە باری زانستییەوە هەیەتی. مرۆڤی نوێ بەو فەلسەفانەوە کە لە رەخنەگریی و پرۆفێشناڵ بوونی زانستییدا هەیەتی، خۆی لە بارودۆخیکی سەیردا دەبینێت وەک ئەوەی دیل بووبێت. سرووشتخوازیی دەسەڵاتێکی سەیری پێ بەخشیوە بۆ ئەوەی هێزەکانی سرووشت دەستەمۆ بکات، بەڵام ئیمانی لە ژیانی ئەو دزیوە. ئەمە بەلامەوە سەیرە کە چۆن فەرهەنگە جیاوازەکان لە ئەندێشەیەک کاریگەریەتی جیاواز وەردەگرن. تیۆری کامڵبوون لە ئیسلامدا خاوەنی

میتۆدی خۆیەتی و هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوە کە مەولەوی مەیلێکی زۆری هەبێت بە نیسبەت داهاتووی زیندەوەرناسیی مرۆڤەوە. هیچ مسوڵمانێک نییە کە بە خوێندنەوەی ئەم بەیتانە لە شادی جەستەی نەلەرزێت و حەزی پێ نەکات:

**از جمادی مردم و نامی شدم**

**وزنام مردم به حیوان برزدم**

**مردم از حیوانی و آدم شدم**

**پس چه ترسم کی ز مردن کم شدم**

**حمله دیگر بمیرم از بشر**

**تا برآرم از ملائک پر و سر**

**وز ملک هم بایدم جستن ز جو**

**کل شی هالک الا وجهه**

**بار دیر از ملک قربان شوم**

**انچ اندر وهم نیاید آن شدم**

**پس عدم گردم عدم چون ارغنون**

**گویدم انا الیه راجعون**

**{ مثنوی، نیکلسۆن، دەفتەری سیهەم، ٣٩٠٢}**

لە لایەکترەوە هێنانە ئارای ئەم تیۆری کامڵبوونە بە شێوازێکی وردتر، لە ئەوروپا گەیشتە ئەم ئەنجامەی کە"... وێدەچێت بنەماگەلی زانستی بۆ ئەم فیکرە بوونی نەبێت کە توانا و ئیستعدادی ئێستای مرۆڤ بە گشت دژواری و پێچەڵپێچییەکانییەوە بتوانێت هەمیشە لە باری مادییەوە پێشڕەو بێت". ئەمە بێ هیوایی شاراوە لە مرۆڤی نوێدایە کە خۆی بەم شێوەیە لە ناو پەردەی زاراوە زانستییەکاندا دەشارێتەوە. نیچەش وای بیر دەکردەوە کە ئەندێشەی کامڵبوون ئەم

تیۆره پەسەند ناکات کە مرۆڤ گەیشتۆتە قۆناغێک کە ئیتر لەوە سەرتر نییە. مەیل و ئاواتێک کە ئەو بۆ داهاتووی مرۆڤ هەیبوو گەیشتە تیۆری"دەوری هەرمانیی"کە رەنگە ناهومێدترین ئەندێشە بێت سەبارەت بە هەرمانیی مرۆڤ کە تائێستا عەقڵی مرۆڤێک پێی گەیشتبێت.

دووپاتبوونەوەی هەرمانیی بە واتای سازبوونی هەرمانی نییە. ئەمە هەمان ئەندێشەی کەونە سەبارەت بە "هەبوون" کە هاتۆتە شێوازێکی نوێوە واتە "بوون یان بوون بە". بەم شێوەیە بە زاڵبوونی مرۆڤی نوێ بەسەر سرووشتدا بە هۆی ئاکامەکانی چالاکی زانستی خۆیەوە، نەمامی مەعنەویەت لە ناخیدا وشک هەڵگەرا. ئەم مرۆڤە لە هەرێمی ئەندێشەدا لە گەڵ خۆیدا و لە ژیانی سیاسی و ئابووریدا پێکدادانێکی ئاشکرای لەگەڵ خەڵکدا هەیە. بە دەست خۆپەرهستی بێ بەزەییانەی خۆی بووە. مەیلی بێ کۆنترۆڵی بۆ کۆکردنەوەی پارە و زێڕ بەرەبەرە هێڵی رەفزی کێشاوە بەسەر چالاکییە رۆحیەکانیدا هیچی بۆ نەماوەتەوە مەگەر ژیانێکی ماندووکەر نەبێت. وەها بەرەولای مادده واتە سەرچاوەی هەستەکانی ئێستای رۆیشتووە کە پەیوەندی خۆی لەگەڵ راز و نهێنییەکانی خۆیدا بڕیوە، لە رۆژهەڵاتیش بابەتەکان لەوە باشتر نین بنەماکانی تەسەووفی سەدەکانی ناوەڕاست کە سەرترین ڕوخسارەکانی ژیانی ئایینی لەو رێگەوە لە رۆژهەڵات و رۆژئاوادا پەرەی سەند، ئێستا ئیتر کاریگەریەتی خۆی لە دەستداوە و رەنگە بکرێت بڵێین کە لە رۆژهەڵاتی ئیسلامییدا زیاتر لە هەموو شوێنێک بۆتە هۆی وێرانی. ئەم بنەمایانە نە تەنها هێزەکانی ناخی مرۆڤێکی ئاسایی کامڵ نەکردووە و ئامادەی نەکردووە کە بێتە ناو گەڕیانی مێژووەوە، بەڵکو تەرکی دنیا و گۆشەنشینی فێر کردووە و کارێکی کردووە کە مرۆڤ دڵی شاد بێت لەو نەزانی و بەند بوونە مەعنەوییەی خۆی. کەواتە جێی سەرسوڕمان

نییە کە مسوڵمانانی ئەمڕۆکە لە تورکیا، میسر و ئێران بە مەبەستی دۆزینەوەی سەرچاوەگەلی نوێی دەسەڵات دەستیان داوەتە دروستکردنی ئەندێشەیەکی تازەی ناسیۆنالیستی توندڕەوانە کە **نیچە** ئەوە بە ناوی"نەخۆشی و بێ عەقڵی"دەناسێت و هەروەها بە"بەهێزترین هێز دژ بە فەرهەنگ"وەسفی دەکات. مسوڵمانی ئەمڕۆکە لە شێوازی ئایینی رەها دڵسارد بووە کە دەتوانێت بە تەنها بە گەشەپێدانی ئەندێشە و سۆز، مرۆڤ لەگەڵ سەرچاوەی بێ کۆتایی ژیان و دەسەڵات پێوەند بدات. ئەوی بەم هیوایە دڵخۆش کردووە کە بە سنووردارکردنی هێزی ئەندێشە و سۆزی خۆی دەتوانێت بگاتە سەرچاوەی نوێی دەسەڵات کە هەڵەیە. سۆشیالیزمی ئیلحادی نوێ، کە خاوەنی هەست و مەیلی ئایینیکی نوێیە، لەم ناوەدا جیهانبینییەکی بەربڵاوتری هەیە، بەڵام لەبەرئەوەی کە بنەما فەلسەفییەکانی خۆی لەسەر روانگەکانی باڵی چەپی پەیڕەوەکانی **هێگڵ** دامەزراندووە، سەرکەشییەکی دژ بەو سەرچاوە رێکخستووە کە دەیتوانی دەسەڵات و ئامانجی پێ ببەخشێت. ناسیۆنالیزم و سۆشیالیزمی ئیلحادی، بە لانی کەمەوە لە بارودۆخی ئێستادا کە مرۆڤ دەیەوێ لەگەڵ خۆیدا سازگار بێت بۆتە هۆی دروستبوونی هێزگەلێکی دامەزراوە لەسەر دەروونناسی کوفر، گومانی خراپ و توڕەیی کە هەژاریی رۆحی مرۆڤ و داخرانی سەرچاوە نهێنییەکانی مەعنەویەتی ئەوی بەدواوەیە. بنەماکانی تەسەووفی سەدەکانی ناوەڕاست، ناسیۆنالیزم و سۆشیالیزمی ئیلحادی، هیچ کامیان ناتوانن دەرمانی دەردی مرۆڤێک بن کە ئەسیری جیابوونەوە و دابڕانە. بێگومان سەردەمی ئێستا یەکێکە لە دەورەکانی قەیرانی گەورە لە مێژوو و فەرهەنگی نوێدا، جیهانی ئەمڕۆکە پێویستی بە پێداچوونەوە هەیە لە بواری ناسینی ژیاندا، ئایین کە لە واتای بەرزی خۆیدا نە دۆگما

ئەندێشییە و نە مەلایەتی و نە داب و دەستووری ڕەواڵەتی، دەتوانێت لە باری ئەخلاقییەوە مرۆڤی نوێ پەروەردە بکات بۆ ئەوەی کە بەرپرسایەتیەکی گەورەتر لە ئەستۆ بگرێت کە بە پێشکەوتنی زانستی نوێ پێویستی پێیەتی. ئەو حاڵەتە لە ئیمانی بۆ بگەڕێنێتەوە کە ببێتە خاوەنی ئەخلاق و کەسایەتیەکی بەرز لەم جیهانەدا و ئەوە بۆ جیهانێکیتریش رابگرێت. مرۆڤ تەنها بەم روانینە نوێیەوەیە کە تێدەگات شوێن و سەرچاوە و ئەنجامی ئەو چییە، لە کوێوە هاتووە و بۆ کوێ دەڕوات. لەم کاتەدایە کە دەتوانێت لە ئاکامدا بە سەر کۆمەڵگەیەکا کە خوازەکانی رقەبەرایەتی مرۆییە و هەروەها بەسەر شارستانیەتێکدا کە یەکیەتی مەعنەوی خۆی بە هۆی دژایەتییە دەروونییەکانەوە لە نێوان ئایین و سیاسەتدا لە دەست داوە، زاڵ ببێت. هەروەک چۆن لەوە پێش باسم کردبوو، ئایین کردەوەیەکی هزرخوازانەیە کە مەبەستەکەی بەدەستهێنانی بنەمای سەرەکی بایەخە و کەواتە هێزەکانی پێکهێنەری کەسایەتی مرۆڤ کامڵ دەکات و ئەمە ڕاستییەکە کە حاشاهەڵنەگرە. گشت ئەدەبیاتی ئایینی جیهان وەک ئەزموونە تاکتەکانی زانایانی ئایین، کە رەنگە لە باری دەروونا‌سییەوە ئەندێشەگەلێکی پەرتووکاو بن، بۆ ئەم مەبەستە بەڵگەیەکی پەسەندکراون.

ئەم ئەزموونانە وەک ئەزموونە ئاساییەکانمان بە تەواوەتی ئاسایی و سرووشتیین، لەبەرئەوەی کە بۆ کەسێک کە ئەوانە بەکار دەبات خاوەنی بایەخێکی مەعریفیین. گرنگتر ئەوەیە کە بەهرەی ئەوەیان هەیە کە هیزەکانی "من" لە خۆیاندا کۆ بکەنەوە و هەربۆیە دەتوانن کەسایەتییەکی نوێ ببەخشن بە خاوەنەکەیان. کە دەڵێن ئەم جۆرە ئەزموونانە دەگەڕێنەوە بۆ عیرفان و زیکر و حاڵەتی تایبەت، لە ئاکامدا ڕێگە ناکەنەوە بۆ چەمک و بایەخ و واتەکەیان. ئەگەر دیتنی ئەوپەڕی

جیهانی ماددی ئەستەم نەبێت، تەنانەت بە نرخی ئەوەی کە شێوازە ئاساییەکانی ژیان و فیکری ئێمە چاکسازیی تێدا بکرێت یان بگۆڕێت یان تێک بدرێت، دەبێ بە ئازاییەوە وەها ئیمکانیاتێک ساز بکەین. بۆ گەیشتن بە قازانجەکانی حەقیقەت پێویستە کە حاڵەتی ئێستامان بەجێ بهێڵین. هەر لە بنەڕەتەوە چ گرنگایەتیەکی هەیە کە حاڵیت و بارودۆخی ئایینی، جۆرێک ئاڵۆزی فیزیۆلۆژیک دیاری بکات و ئاشکرای بکات؟

رەنگە **جۆرج فاکس** تووشی جۆرێک خەمۆکی ببوو، بەڵام کێ دەتوانێ نکولی کە هێزی خاوێنکردنەوەی ئەو لە ژیانی ئایینی بەریتانیای سەردەمی خۆی بکات؟ باسیان لەوە کردووە کە پێغەمبەر شەیدایی هەبووە، وای دانێین کە دروستە. ئەگەر نەخۆشێکی نەفسی دەسەڵات و هێزی ئەوەی هەبوو بێت کە ڕێگەیەکی نوێ لە ناو مێژووی مرۆڤایەتییدا دابڕێژێت، ئەمە خاڵێکی زۆر گرنگ و جێی سەرنجە بۆ زانستی دەروونناسیی بۆ ئەوەی هێزی زاتی ئەو هەڵبسەنگێنرێت. باس لەوە بکرێت کە چۆن کوێلەکانی کردە ڕێبەری جیهان و ئیلهامی بەخشی بە ڕەفتار و شێوازی ژیانی گشت مرۆڤەکان. ئەگەر بێین و هەموو ئەو چالاکی و هەواڵانەی کە لە راپەڕینی پێغەمبەرەوە سەرچاوەی گرتووە، لێک بدەینەوە دەگەینە ئەنجامێکی گرنگ. ئەوەی کە ئەو گشت هەوڵ و تێکۆشانە رۆحیانە و جۆرە رەفتاری ئەو کە بەرهەمهاتووی ئەو راپەڕینەیە، تەنها بە پەرچەکرداری خەیاڵ و دەروونناسانە بزانین. تێگەیشتن لەم بابەتە ئاوەها ئیمکانی نییە کە بە وەڵامدانەوەیەک بە بارودۆخی عەینی بزانین کە پێکهێنەری مەیلە نوێکان، ڕێکخراوە و دەزگای تازە و خاڵێ روانینی نوێ بووە. ئەگەر لە سۆنگەی مرۆڤناسییەوە ئاوڕ لەم باسە بدەینەوە دەبینین کە کەسێکی وەها شەیدا بۆتە هۆیەکی گرنگ لە ئابووری ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیەکان. شێوازی ئەو

پۆلێنبەندی واقیعەکان و دۆزینەوەی هۆ و هۆکار نییە. ئەو وەها دەڕوانێتە مەقوولاتی ژیان و حەرەکەی کە قالبی نوێ دابین بکات بۆ مرۆڤایەتی. گومانێکی تێدا نییە کە لەسەر ڕێگەی ئەویشدا هەروەک زانایەک کە پشت دەبەستێت بە ئەزموونی هەستەکان، داو و لەمپەر هەڵە هەبووە، بەڵام موتالایەکی ورد لە شێوازی کاری ئەودا پیشانمان دەدات کە بۆ سڕینەوەی ئەو هەڵانەی کە هاتۆتە ناو ئەزموونەکەیەوە، هۆشیارییەکەی لە زانایەک کەمتر نییە.

بۆ ئێمە کە لەم بوارەدا تەنها لە دوورەوە دەستێکمان لەسەر ئاگرە بابەتێکی گرنگ دێتە ئاراوە ئەویش دۆزینەوەی شێوازێکی کاریگەرە بە مەبەستی توێژینەوە لە زات، چەمک و گرنگایەتی ئەم ئەزموونە سەیرە. ابن خلدون، مێژوونووسی عەرەب کە مێژووی نوێی لە سەر بنەمایەکی زانستی دارشتەوە، یەکەمین کەس بوو کە بە شێوەیەکی جیددی ئاوڕی لەم لایەنەی دەروونناسی مرۆڤ داوەتەوە. ئەو گەیشتە بابەتێک کە ئەمڕۆکە پێی دەڵێن"خودی ئاخودئاگا"یان خودی ناهۆشیار. دوای ئەو **سێر ویلیام هامیلتۆن** لە بەریتانیا و لایب نیتس لە ئەڵمانیا هەوڵی ئەوەیان دا کە لەسەر هەندێ لە نەناسراوترین و نامۆترین لایەنەکانی زەینی مرۆڤ توێژینەوە بکەن. لەم باسەدا رەنگە حەق بەرەولای **یۆنگ** بێت کە دەڵێت: ناسینی چییەتی سەرەکی ناو ئایین لە پرۆفشناڵەتی یان ئیختیساسی زانستی دەروناسییدا نییە. ئەو لە باسێکدا سەبارەت بە پەیوەندی نێوان دەروونناسیی شیکاری لەگەڵ هونەری شیعردا دەڵێت کە تەنها پرۆسەی قاڵبێکی هونەری دەتوانێت ببێتە بابەتی دەروونناسیی. بەپێی وتەی ئەو چییەتی سەرەکی هونەر ناتوانێت ببێتە بابەتی هەڵسەنگاندنی زانستی دەروونناسیی. **یۆنگ** هەروەها دەڵێت:

"لە هەرێمی ئاینیشدا دەبێ وەها لێکدانەوەیەک لەبەرچاو بگرین. لێرەدا ڕامان و سەرنجی دامەزراو لەسەر دەروونناسیی تەنها بە نیسبەت دیاردە عاتفی و سەمبۆلیکەکانی ئایین ڕەوایە و بەهیچ شێوەیەک چییەتی سەرەکی ئەوە لە خۆ ناگرێت و لە ڕاستیشدا نابێ لە خۆی بگرێت. ئەگەر ئەم ئیمکانە هەبووایە، نە تەنها ئایین بەڵکو هونەریش دەبێ وەک یەکێک لە لقە پەراوێزییەکانی دەروونناسیی لەبەرچاو بگیرێت".

**یۆنگ** چەندین جار لە نووسراوەکانیدا ئەو بنەمایانەی رەفز کردۆتەوە کە خۆی باسی لێکردوون. ئاکامی ئەم شێوازە دەبێتە هۆی ئەوەی کە دەروونناسیی نوێ لە جیاتی ئەوەی کە روانگەیەکی واقیع سەبارەت بە چییەتی ئایین و حەقیقەتەکەی سەبارەت بە کەسایەتی مرۆڤ بداتە دەست، هاتووە و کۆمەڵێکی زۆری روانگە نوێکانی خستۆتە ئاراوە. ئەمانەش خراپ حاڵی بوونی لێکەوتۆتەوە لە چییەتی ئایین، روخسارە باڵاکانی دەرنەکەوتووە و ئێمە بەرەو رێگەیەک بردووە کە بەرهەمەکەی بۆتە نائومێدی. واتا و باسی گشتی ئەم روانگانە ئەوەیە کە ئایین ناتوانێت پێوەندیەک ساز بکات لە نێوان"من"ی مرۆیی لەگەڵ ئەو واقیعە بینراوانەی کە لەوپەڕی خۆیدان، ئەمەش جۆرێک نیەتی باشە لە سەر بنەمای زیندەوەرناسیی کە لە ئاکامدا لەمپەرێکی ئەخلاقی ساز دەکات لە دەوراندەوری کۆمەڵگەی مرۆییدا بۆ ئەوەی کە بە گشتی پارێزگاریی بکات لە جەستەی کۆمەڵگەی مرۆیی لە بەرامبەر غەریزەکانی مندا کە بەریان پێ ناگیرێت. بەم شێوەیە کە بەپێی دوایین باوەڕ لە دەروونناسییدا مەسیحیەت ئەرکی خۆی لەسەر بنەمای زیندەوەرناسیی تا ئێستا بەڕێوە بردووە کە تێگەیشتن لە چەمکی راستەقینەی بۆ مرۆڤی نوێ ئەستەمە. **یۆنگ** ئاوەها لێکی دەداتەوە کە:

"لەڕاستییدا دابونەریتەکانی ئێمە تەنانەت ئەگەر توێژێک لە بێ ڕەحم و بەزەیی بوون و دڵڕەقی سەردەمی کەون ئاڕای هەبووایە دەبوو تا ئێستا تێبگەین. لەم سەردەمەدا دەتوانین تاڕادەیەک رەشەبا دەستەمۆ نەبووەکانی غەریزە شەهوانیەکانی ڕۆمی کەون ئاڕای کاتی قەیسەر بهێنینە بەرچاو. وا دەزانین کە مرۆڤی شارستانیەتی ئێستا لەو بابەتانە دوور کەوتۆتەوە و ئێستا تەنها تووشی شێوازی دەروونی بووە. بە پراکتیک دەردەکەوێت کە نیشانەیەک نەبینین لەو پێویستیانەی کە بوونە هۆی پەیدابوونی مەسیحیەت بۆ ئەوەی لە چەمکەکەیان تێبگەین. نازانین مرۆڤیان لە چ شتێک دەپاراست. کەسانی ئاگای ئێمە دینداریی بە بابەتێکی هاوتەرازی شێواوی دەروونی دەزانن. مەسیحیەت لە تەمەنی دووهەزار ساڵەی خۆیدا ئەو شتەی کە دەبوو، کردویەتی و بەربەستی بە متمانەی ساز کردووە بۆ ئەوەیە لە پەنای ئەوەدا سەیری گوناهباری خۆمان بکەین".

ئەم لێکدانەوە ئەوە پیشان دەدات کە بەرزترین خاڵ لەناو ژیانی ئایینییدا لەبەرچاو نەگیراوە، دامرکاندنەوەی مەیلە جنسییەکان یەکەمین هەنگاوە لە کامڵکردنی "من" مرۆڤدا. ئامانجی سەرەکی ژیانی ئایینی حەرەکەدانی ئەم کامڵبوونەوەیە بۆ ڕێگەیەک کە لەوێدا چارەنووسی "من" زۆر گرنگترە لە سەلامەتی ئەخلاقی گشت کۆمەڵگە کە پێکهێنەری کۆمەڵگەی ئێستایە. ئەو چەمکە بنەڕەتییەیە کە سەرچاوەی حەرەکەی بەرەوپێشی ژیانی ئایینییە دەبێتە هۆی ئەوەی کە یەکێتی لاوازی "من" گیان بگرێت. گریمانەی لەناوچوونی ئەو کەم بێتەوە. بەرپرسایەتیەکەی بۆ چاکسازیی و بەهرەی لە بەدەستهێنانی ئازادی زیاتر بۆ دروستکردنی بارودۆخی نوێ لە ناو شوێنە نەناسراو نەبیندراوەکاندایە.

بەهۆی ئەو درکە بنەڕەتییەیە کە ژیانی سەرتر، سەرنجی خۆی دەداتە ئەو ئەزموونانەی کە سەمبۆلی هەمان حەرەکە وردەکانی واقیعن و کاریگەریەتی دادەنێن لە سەر چارەنووسی من وەک بابەتێک کە لە ناو ڕاستییەکاندا جێگرە. ئەگەر لە سۆنگەی دەروونناسیی نوێوە بڕوانینە ئەم بابەتە دەبینین کە تەنانەت لەگەڵ پەراوێزی ژیانی ئایینیشدا نزیکایەتی نەبووە و هێشتا دوورە لە پڕبایەخی و گشت چەشنی ئەو شتەی کە بە ئەزموونی ئایینی ناوی لێدەبەین. بۆ ئەوەی کە ئاوڕێک لەم دەوڵەمەندبوون و فرە چەشنییە بدەینەوە لێرەدا کۆمەڵێک لە نووسراوەیەکی **شێخ ئەحمەد**[1] **سەرهەندی**، بلیمەتی گەورەی ئایین باس دەکەین لەسەدەی یازدەی کۆچییدا. رەخنەی شیکاریی و ئازایانەی لە ڕێورەسمی سۆفیگەری سەردەمەکەی خۆی، بووە هۆی پەیدابوونی شێوازێکی نوێ لە تەسەووفدا. گشت شێوازەکانی تەسەووف کە لە هیندستاندا باوە لە ئاسیای ناوەندی و عەرەبستانەوە هاتۆتە ناو ئەم وڵاتەوە، ڕێگەی ئەو لە تەسەووفدا تەنها شێوازێکە کە سنوورەکانی هیندی تێپەڕ کرد و هێشتا لە پەنجاب، ئەفغانستان و بەشی ئاسیایی

---

[1] **شێخ ئەحمەد فاروقی سەرهەندی** (٩٧١-١٠٣٤) زۆرجار بە ناوی الف ثانی دەناسرێت. ئەو بووە هۆی ئەوە کە ئیقبال لە دوای گەڕانەوە لە ئەورووپا لە ریزی پەیڕەوەکانی "وحدت وجود" بێتە دەر. ئەو جەختی دەکرد لەسەر جیایی هەبوونی مرۆڤ و پێویستیی پاراستن و بەهێزکردنی تاکایەتی مرۆڤەکان. ئەو باوەڕی سۆفیانەی فنا فی الله و یەک بوون لەگەڵ خودای رەفز دەکردەوە و لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە مرۆڤ تەنانەت لە دوای تێپەڕکردنی بالاترین دەرەجەکانیش دیسان هەر مرۆڤە و هەرگیز لەگەڵ خودا نابێتە یەکێک. نهێنی رزگاربوونی مرۆڤ لە پاراستن و جەختکردن لەسەر تاکایەتی مرۆڤدا شاردراوەتەوە. ئەم عارفە نابێ لەگەڵ سید احمد خان (١٨١٧-١٨٩٨)، کە لە علیگرە وەفاتی کرد بە هەڵە بە یەک کەس بزانین. کتێبی شرح بەرهەمە مێژووییەکانی دهلی و هەروەها تەفسیری قورئانی شەریف بە زمانی ئوردو لە بەرهەمەکانیەتی.

یەکیەتی سۆڤیەتدا وەک هێزێکی زیندوو دەبینرێت. بەداخەوەم کە شیکردنەوەی راستەقینەی ئەم نووسراوە بە زمانی دەروونناسیی نوێ بۆم مسۆگەر نییە، لەبەرئەوەی هێشتا بۆ گێرانەوەی وەها چەمکێک زمانێک لەئارادا نییە، بەڵام لەبەرئەوەی کە مەبەستی من تەنها هێنانەئارای تیۆرییەکە سەبارەت بە ئیمکانیاتی بێ سنووری ئەزموون کە"من"بۆ بەدەستهێنانی ئەزموونی ئیلاهی دەبێ لەوانە تێپەڕ بێت و پاڵافتە بێت، هیوادارم بمبوورن کە زاراوەگەلی نامۆ و نائاشنا بەکاردەبەم. ئەم زاراوانە خاوەنی جەوهەری راستەقینەی مانای خۆیانن کە لە دەروونناسیی ئایینیەوە سەرچاوەی گرتووە کە لە فەزایەکی فەرهەنگی جیاوازدا گەشەیان کردووە. ئێستا سەرنج بدەینە ئەو نووسراوە. ئەزموونێک کە بۆ کەسێک بە ناوی **عەبدولموئمن** دەست کەوتبوو. ئاوەها بۆ شێخیان وەسف کرد:

"وادێتە بەرچاوم کە ئاسمان و زەوی و عەرش و دۆزەخ و بەهەشت هەمووی بوونی خۆیان لەدەستداوە. کاتێ سەیری دەوروپشتم دەکەم نیشانەیەک لەوانە نابینم. کاتێ بەرامبەر بە کەسێک رادەوەستم هەست بە بوونەکەی ناکەم. تەنانەت گومانم لە بوونی خۆشم هەیە. خودا بێ کۆتاییە. لە چوارچێوەی زەینی کەسدا ناگونجێت. ئەمەیە سنووری نیهایی ئەزموونی رۆحانی و هیچ پەیڕەو و سۆفیەک نەیتوانیوە لەم ئاستە زیاتر بروات".

شێخ لە وەڵامی ئەو بابەتەی کە بیستی وتی:

"ئەو ئەزموونەی کە باستکرد رەگ و ریشەی لە ناو"قلب"دا هەیە کە بەردەوام لەسەر یەک حاڵ نییە، وادێتە بەرچاوم کە ئەزموونخواز هێشتا یەک لە چواری قۆناغە بێ ئەژمارەکانی قەلبی تێپەڕ نەکردبێت. بۆ ئەوەی کە ئەزموونە سەرەتاییەکانی ژیانی رۆحانی بگاتە کەماڵ

دەبێ لە دیکەی قۆناغەکانیش تێپەڕ ببێت. قۆناغگەلی دیکە لەوپەری ئەم ئاستەدا هەن کە بەناو گەلی "روح"، "سر خفی"، "سر اخفی" بەناوبانگن. ئەم قۆناغانە بە گشتی ئەو بابەتە پێکدەهێنن کە لە زاراوەکاندا پێی دەوترێت "عالم امر". ئەویش حاڵەتی تایبەت و ئەزموونگەلی خۆی هەیە. پاش تێپەڕکردنی ئەم قۆناغانەیە کە بەرەبەرە تیشکی "لمعات اسما الهی" و "صفات الهی" دەدرێت لە ئەو کەسەی کە بە شوێن حەقیقەتدا دەگەڕێت و لە ئاکامدا دەگاتە ئەنواری زاتی ئیلاهی".

بواری جیاوازکاریی لەسەر بنەمای دەروونناسیی کە لەم نووسراوەدا ئاماژەی پێدراوە هیچ نەبێت، ئەمەیە کە روانگەیەک سەبارەت بە گشت جیهانی ئەزموونی دەروونی دەهێنێتە ئاراوە کە بەپێی تێگەیشتنی چاکخوازێکی گەورەی تەسەووفی ئیسلامییە. بە باوەڕی ئەو بەرلەوەی کە کەسێک بگاتە ئەو ئەزموونە تایبەتەی کە سەمبۆلێکە لە عەینیەتی رەها، دەبێ سەرەتا جیهانی ئەمر واتە جیهانی هێزە رێنموونی کارەکانی تێپەڕ کردبێت. لەبەرئەوە بوو کە وتم دەروونناسیی نوێ تەنانەت دەستی نەگەیشتۆتە پەراوێزەکانی ئەم بابەتە. من بەشبەحاڵی خۆم بە هیچ جۆرێک هیوایەکم نییە بە بارودۆخی ئێستای زیندەوەرناسیی و دەروونناسیی، وا نایەتە بەرچاو کە رەخنەی شیکاریی رەها بە تێگەیشتنێکی کەم لە بارودۆخی ئۆرگانیکی کە ئیماژە کاتیەکانی ژیانی ئایینی خۆی لەوێدا دەدۆزێتەوە، ئێمە بگەیێنێتە شوێنێک. شوێنی رەگ و ریشەی زیندووی کەسایەتی مرۆیی. وای دابنێین کە ئیماژە جنسییەکان رۆڵێکیان هەبووبێت لە مێژووی ئاییندا یان وای دابنێین کە ئایین ئامێرە خەیاڵیەکانی هەلاتن لە ڕاستییەکی نالەباری پێکهێنابێت یان سازگاری کردبێت. ئەم بابەتانە ناتوانن کەمترین کاریگەریەتی هەبێت لە ئامانجی نیهایی ژیانی ئایینی

واته دووباره سازکردنەوەی "من". ئەم مەبەستە لە ڕێگەی پەیوەندیدانی منی نیهایی لەگەڵ پرۆسەی ژیانێکی هەمیشەیی و خستنی ئەو لەناو باردۆخێکی ما بعد الطبیعە ساز دەکرێت. ناتوانین لەناو فەزای داخراوی ئێستادا بە باشی لەوە تێبگەین. کەواتە ئەگەر زانستی دەروونناسیی بە ڕاستی گرنگایەتی دەدات بە ژیانی جۆری مرۆڤ، دەبێ شێوازێکی سەربەخۆ و داڕێژراو بە مەبەستی دۆزینەوەی فۆرمێکی نوێ بگرێتە بەر کە لەگەڵ هەوای زەمەنی ئێمەدا زیاتر رێک بکەوێت.

رەنگە نەخۆشێکی نەفسی بە هێزی عەقڵێکی زۆرەوە- کە وەها کۆپلەیەک ئەستەمە- بتوانێت ببێتە رێنموونیکاری تێگەیشتن لەوەها شێوازێک. **نیچە** ژیان و جۆری کارەکانی لە ئەوروپادا بە لانی کەمەوە بۆ ئێمەی رۆژهەڵاتی بۆتە بابەتێکی سەرنجڕاکێش لە دەروونناسیی ئاییندا، ئەو وەها کۆپلەیەک بوو لە زاتی خۆیدا. شێوازی فیکری ئەو لە ناو مێژووی تەسەووفی رۆژهەڵاتیشدا دەبینرێت. ناتوانین نکولی لەوە بکەین کە رەنگە بەڕاستی خەونی "امری" ئیلاهی بەویش گەیشتبێت. بۆیە خەونەکەی بە امری ناو دەبەم، لەبەرئەوەی کە بە رەواڵەت جۆرێک رۆحی پێغەمبەرانەشی پێ بەخشیبوو و مەبەستی ئەوە بوو کە بە شێوازێکی تایبەت ئەم خەونانە بکات بە هێزگەلی هەمیشەیی ژیان. **نیچە** لەم رێگەیەدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا. ئەم سەرنەکەوتنەش سەری لە ناو فیکری پێشینیانی خۆیدا بوو وەک **شۆپێنهاوێر، داروین و لانگ**. ئەوانە حیجابێکی لەبەر چاویدا دانابوو کە نەکرا بایەخی راستەقینەی خەونەکانی بزانێت. نیچە لە جیاتی ئەوەی کە بە شوێن یاسایەکی رۆحیەوە بێت بۆ ئەوەی بواری ئیلاهی لە ناو کەسە ئاساییەکانیشدا پەروەردە بکات و لەم رێگەوە داهاتوویەکی بێ کۆتاییان بۆ دابین بکات، بەرەو رێگەیەکیتر چوو. بەرەو

ڕێگـەیـەک کـە بـۆ وەدیهێنـانی خـەونـەکـانی گـەیشتە فیکرگـەلێـک وەک ڕادیکالیزمی ئەشرافی واتە: Aristocratic Radicalism.

لە زمانی مەولەوییەوە سەبارەت بە **نیچە** دەڵێم:

**باز این حلاج بی دار و رسن**

**نوع دیگر گفت ان حرف کهن**

**حرف او بی باک و افکارش عظیم**

**غربیان از تیغ گفتارش دو نیم**

هەروەها لە شوێنیکیتردا سەبارەت بەو وتوومە:

آنچه او جوید مقام کبریاست این مقام از عقل و حکمت ماوراست

خواست تا از آب و گل آید برون خوشەای کز کشت دل آید برون

هەربۆیە بلیمەتێک کە خەونەکانی بە هێزگەلی ناخی خۆیەوە دابین دەکرا، کارەکەی گەیشتە شکست. لەبەرئەوەی کە کلیلێکی ڕێگەی لـە نـاو ژیـانی مـەعنـەوی خۆیـدا نـەبـوو ئـەو گشتە هـەوڵـەی بـی ئاکـام مایـەوە. ئەوەی کە گاڵتەی بە چارەنووس دەکرد لەبەرئەوە بوو کە ئەم پیاوە کە بە بـاوەڕی هاوڕێکانی"دەڵێی لـە جیهـانێکیترەوە هـاتبوو کـە کـەس لـەوێ نەدەژیا"بە تەواوەتی ئاگاداری ئەنجامی خراپی ڕۆحی خۆی بوو. دەڵێت:

"بـە تـەنهـا لـەگـەڵ گرفتێکـی گـەورە شـەڕ دەکـەم. دەڵێـی لـەنـاو دارستانێکدا کە تەمـەنێکی درێژی بردۆتـە سـەر بزر بووم. پێویـستم بـە یارمەتی هەیە. پەیڕەوانێکم دەوێت، موریدێکم دەوێت، چ شیرینە گوێت لە فەرمانێک بێت"، دیسان دەڵێت:

"بۆچی لـە نێوان زیندووەکانـدا کـەس نادۆزمـەوە کە بتوانێت لـە مـن سـەرتـر ببینێت و مـن لـە خـوارەوەدا ببینێت؟ هۆکـەی چییـە؟ ئایا بـەو جۆرەی کە شایستەیە نەگەڕاوم؟ مـەیلێکی زۆرم هـەیـە بۆ دۆزینـەوەی وەها کەسێک".

حەقیقەت ئەوەیە کە هەرچەند پرۆسە ئایینی و زانستییەکان خاوەنی شێوازگەلی جیاوازن، بەڵام لە ئامانجدا یەک دەگرن. هەردووکیان ڕوویان لە حەقیقەتی سەرەکییە. بە هۆیانەوە کە پێشتر باسم کردبوو ئایین لە ڕاستییدا زۆر زۆر زیاتر لە زانست حەز بە گەیشتن بە حەقیقەتی کۆتایی دەکات. هەردووکیان بۆ گەیشتن بە عەینیەتی رەها ڕێگەیەک دەپێون کە دەکرێ بە پاڵافتنی ئەزموون ناوی لێبەرین. بۆ تێگەیشتن لەم بابەتە دەبێ لە نێوان ئەزموون وەک بابەتێکی سرووشتی بە واتای ڕوانینی ئاسایی واقیع و هەروەها ئەزموون بە واتای سرووشتی ناخی واقیع جیاوازی دابنێین. هەوڵی ئێمە لە پانتایی زانستدا لەوەدایە کە لە چەمکەکانی ئەزموون بەپێی رەفتاری رەواڵەتی واقع تێبگەین و لە دەڤەری ئاییندا وەک نوێنەری جۆرێک واقع لەبەرچاوی بگرین و هەوڵ بدەین تاکو چەمکەکانی ئەزموون زیاتر بە سرووشتی ناخیانەوە بدۆزینەوە. پرۆسە زانستی و ئایینیەکان تارادەیەک هاوتەریبی یەکترن. هەردووکیان لە ڕاستییدا جیهانێک وەسف دەکەن، بەڵام بەم جیاوازییەوە کە لە پرۆسەی زانستییدا پێگەی"من"زۆر تایبەتە. لە حاڵێکدا کە لە پرۆسەی ئایینیدا"من"مەیلە دژوازەکان پێکەوە ئاوێتە دەکات و ڕوانگەیەکی گشتی و ناوازە پێک دەهێنێت کە ئەنجامەکەی جۆرێک دێگردیسییە لە ناو ئەزموونەکاندا. هەڵسەنگاندن و موتالای ورد سەبارەت بە چییەتی و ئامانجی ئەم پرۆسە کامڵکارانەی یەکتر، ئەوەمان پیشان دەدات کە مەبەستی هەردووکیان پاڵافتنی ئەزموون لە پانتای تایبەتی خۆیاندایە. بە باسێکی زیاتر مەبەستەکەی خۆم ڕوون دەکەمەوە. رەخنەی دیوید هیوم سەبارەت بە ئەو وێنەیەی کە لە خۆمان هەیە ناتوانین بگەڕێنینەوە بۆ مێژووی فەلسەفە بەڵکوو دەبێ وەک وەرزێک لە مێژووی زانستدا سەیر بکەین. بۆ سەلماندنی ڕاستبێژیمان

به نسبەت رۆحی ئەزموونی زانستییەوە نابێ ئەو چەمکانەی کە چییەتیەکی زەینییان هەیە بەکار بەرین. خاڵێک کە لە رەخنەگرتنی هیومدا هەیە و ئەو پێداگرە لەسەری، بابەتی بەجێهێشتن و جیاکاردنەوەی ئەزموونی زانستییە لە دەسەڵات. بە باوەڕی ئەو هیچ بنەمایەکی لە ئەزموونی هەستدا نییە و ئەمەش یەکەمین هەوڵی ئەندێشەی مرۆڤ بوو بۆ پاڵافتنی پرۆسەی زانستی.

تیۆری بیرکاریی **ئەنشتاین** سەبارەت بە جیهان، پرۆسەی پاڵافتن کە **هیوم** دارێژەری بوو، کامڵ دەکات و بۆ ئەوەی ڕاستی خۆی بە نیسبەت رۆحی رەخنەگریی هیوم دەرببڕێت، چەمکی دەسەڵات بە تەواوەتی وەلا دەخات. ئەو نووسراوەی کە لە عارفی گەورەی هیندی گێڕامەوە ئەوە پیشان دەدات کە ئەم توێژەرە پراکتیکییەی دەروونناسیی ئاینی روانگەیەکی هاوشێوەی لە بابەتی پاڵافتندا هەیە. هەستی ئەو لە عەینیەت هەروەک هەستی زانایەکە لە دەڤەری عەینییەتی وردی خۆیدا. ئەو یەک بە یەک ئەزموونەکان تێپەڕ دەکات، بەڵام نە وەک ئەوەی تەنها بینەرێک بێت، بەڵکو رەخنەگرێکە کە هێڵەکی رەخنەی ئەزموونی لە دەستدایە. هەوڵی ئەوەیە کە بە یاسا و شێوازە تایبەتەکان کە هی بواری لیکۆڵینەوەن گشت هۆ و توخمە زەینییەکانی دەرروونناسیی یان فیزیۆلۆژی لە دەڤەری توێژینەوەی خۆی لابەرێت و ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە لە ئەزموونی خۆیدا بگاتە ئەو شتەی کە بە شێوەیەکی رەها بگاتە ئەو بابەتەی کە عەینییە. ئەم ئەزموونە نیهاییە دەرکەوتنی پرۆسەی ژیانیکی نوێیە کە ڕەسەن، بنەرەتی و خۆهەڵقووڵاوە. نهێنی هەرمانیی بوونی"من"لەو چرکەساتەیە کە دەگاتە ئەم دەرکەوتە کۆتاییە بێ ئەوەی کە کەمترین گومان بۆ خۆی ساز بکات. ئەوەش وەک سەرچاوەی سەرەکی بوونی خۆی قبووڵ دەکات.

لەناو خودی ئەزموونندا نە نهێنی و نە رازێکی تێدایە و نە هیچ شتێکی سۆزدارانە. لەڕاستییدا هەر بەم هۆیە بوو کە بنەماکانی تەسەووفی ئیسلامی بۆ ئەوەی کە لە ئەزموونە ناسۆزدارانەکان خۆی بپارێزێت هەندێ شێوازی گرتە بەر. بۆ وێنە کەڵک وەرگرتن لە مۆسیقای لەناو عیبادەتدا یاساخ کرد و جەختی کردە سەر ئەوەی کە نوێژە رۆژانەکان بە شێوەی جەماعەت بکرێت بۆ ئەوەی گریمانەی کاریگەریەتی دژ بە کۆمەڵبوونی مانەوە لە تەنیاییدا پوچەڵ بکرێتەوە. بەم شێوەیە ئەزموونێک کە لێرەدا دەست دەکەوێت بە تەواوەتی سرووشتی و دامەزراوە لەسەر زیندەوەرناسییە کە بۆ"من"بالاترین گرنگایەتی هەیە. عروجی منی مرۆڤ سەرترە لە ئەندێشە کە بە هەڵکشانی خۆی بە پلەی هەرمانیی خەوشی مەرگ لای خۆیەوە دەسڕێتەوە. تەنها مەترسییەک کە هەڕەشە لە"من"دەکات بۆ دۆزینەوەی مەعریفەی ئیلاهی ئەوەیە کە هەوڵ و تێکۆشانەکەی بە کەم بزانرێت. ئەوەش دەکرێ لە ژێر کاریگەریەتی حەز و مەیلی ئەزموونەکانی پێشتر بێت. مێژووی تەسەووفی رۆژهەلات ئەوەمان پیشان دەدات کە ئەمە مەترسییەکی گەورەیە. کۆکراوەی هەست و گشت قسەکانی راپەرینی ئەو عارفە گەورە هیندییە ئەوەیە کە حەرەکەی خۆی بۆ مەبەستی چاکسازیی تەسەووف دەست پێکرد کە پێشتر باسی نووسراوێکیم کرد. ئامانجی"من"ی مرۆڤ ئەوە نییە کە شتێک ببینێت بەڵکو ئەوەیە کە شتێک بێت. لەو هەوڵیدا کە من بۆ بوون بە شتێک هەیەتی، کات و دەرفەتی نیهایی خۆی دەدۆزێتەوە بۆ ئەوەی کە بوونەکەی پتەوتر بکات و من هەم یان"انانیت"ێکی بنەڕەتیتر دەستبخات کە هۆی راستەقینە و عەینی بوونی خۆی لە: "من بیر دەکەمەوە"کەی دیکارتدا نادۆزێتەوە، بەڵکو لە "من دەتوانم"ی کانتدا پەیدای دەکات. کۆتایی گەڕانی "من" بە

واتای رزگاربوون لە سنوورەکانی تاکایەتی نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە بە واتای دۆزینەوەی پیناسەیەکی وردترە سەبارەت بەوە. کردەوەی نیهایی کردەوەیەکی عەقڵانی نییە، بەڵکو کردەوەیەکی پەیوەندیدار بە ژیانەوەیە کە قووڵایی دەبەخشێت بە گشت بوونی منی مرۆیی. ئیرادەی پتەو دەکات و ئەم دڵنیاییەی پێ دەبەخشێت کە: جیهان تەنها ئەوە نییە کە دێتە بەرچاو یان بە درکی عەقڵییەوە دەناسرێت، بەڵکو شتێکە کە دەبێ بە کردەوەی بەردەوام، هەر دەم لە سازکردنەوەدا بێت. ئەمە بۆ "من" چرکەساتی بەختەوەرییەکی بەرز و هەروەها کاتی گەورەترین تاقیکارییە:

**زندەای یا مردەای یا جان به لب**

**از سه شاهد جان را کن طلب**

**شاهد اول شعور خویشتن**

**خویش را دیدن به نور خویشتن**

**شاهد ثانی شعور دیگری**

**خویش را دیدن به نور دیگری**

**شاهد ثالث شعور ذات حق**

**خوێش را دیدن به ذات حق**

**پیش از این نور ار بمانی استوار**

**حی و قائم چون خدا خود را شمار**

**بر مقام خود رسیدن زندگی است**

**ذات را بی پرده دیدن زندگی است**

**چیست معراج آرزوی شاهدی**

**امتحانی روبروی شاهدی**

**شاهد عادل که بی تصدیق او**

زندگی ما را، چو گل را رنگ و بو
در حضورش کس نماند استوار
ور بماند او هست کامل عیار
ذره‌ای از کف مده تابی که هست
پخته گیر اندر گره تابی که هست
تاب خود را برفزودن خوشتر است
پیش خورشید آزمودن خوشتر است
پیکر فرسوده را دیگر تراش
امتحان خویش کن، موجود باش
این جنین موجود محمود است و بس
ورنه، نار زندگی دود است و بس.

# وشەنامەی فەلسەفی

| | |
|---|---|
| Absolute | ڕەها |
| Absolute being | بوونی ڕەها |
| Absolute deficicncy | نوقسانی ڕەها |
| Absolute ego | منی ڕەها |
| Absolute essence | زاتی ڕەها |
| Absolute existence | بوونی ڕەها |
| Absolute idealism | ئیدە ئالیسمی ڕەها |
| Absolute idealist | ئیدە ئالیستی ڕەها |
| Absolute imperfection | ناتەواویی ڕەها |
| Absolute impossibility | سەرپێچی ڕەها |
| Absolute knowledge | مەعریفەی ڕەها |
| Absolute law | یاسای ڕەها |
| Absolute matter | مادەی ڕەها |
| monism Absolute | تاکخوازیی ڕەها |
| Absolute negation | نەفی ڕەها |
| Absolute nothing | هیچی ڕەها |
| Absolute oneness | یەکەیی ڕەها |
| Absolute perfection | کامڵ بوونی ڕەها |
| Absolute philosophy | فەلسەفەی ڕەها |
| Absolute possibility | ئیمکانی ڕەها |

| | |
|---|---|
| Absolute reality | حەقیقەتی ڕەها |
| Absolute unity | یەکەیی |
| Absolute viid | بۆشایی ڕەها |
| Absoluteness | ڕەهایەتی |
| Abstract | مجرد، انتزاعی |
| Abstract existence | بوونی ئابستراکت |
| Abstract illumination | نووری ئابستراکت |
| Abstract possibility | ئیمکانی ئابستراکت |
| Abstraction | ئابستراکت |
| Abstractionism | ئابستراکسیزم |
| Abysmal darkness | تاریکایی |
| Accibent | دەرکەوتە |
| Acquired | دەستکەوتە |
| Acquired intellect | عقلی دەستکەوتوو |
| Acquisition | دەست کەوتن |
| Act | کردەوە |
| Act of knowledge | کردەوەی ناسین |
| Act of will | کردەوەی ئیڕادە |
| Action | کردەوە |
| Active | چالاک |
| Active being | بوونەوەری چالاک |
| Active intellect | عەقڵیچالاک |
| Active mind | زەینی چالاک |

| | |
|---|---|
| Activism | کردەوە خوازیی |
| Activist | کردەوەخواز |
| Activity | چالاکی |
| Actual | کردەیی |
| Actual being | بوونەوەری کردەیی |
| Actual entity | بوونی کرداریی |
| Actual reason | عەقڵی کرداریی |
| Actuality | کرداریی |
| Aesthete | جوانی ناس |
| Aesthetics | جوانی ناسیی |
| Aethereality | نەرم و نیانی |
| Affirmable | شیاویی سەلماندن |
| Affirmation | سەلماندن |
| Affirmative | ئیجابی |
| Affirmative attribute | وەسفی ئیجابی |
| Agent | چالاک |
| Aggression | توڕەیی |
| Aggressive | توندوتیژ |
| Agnoiologist | جەهل ناس |
| Agnoiology | جەهل ناسیی |
| Agnostic | راوەستاوە |
| Agnostic realism | واقع خوازیی |
| Agnosticism | ئاایینی |

